# ئاینی ئێزیدی

لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر «ئاینی ئێزیدی» ئەنجامدراوە، پشتی
بە پاشماوەی نوسراو و قسەی سەرزاری خەڵك بەستووە


نوسینی: د. عبدالقادر مارونسی
وەرگێڕانی: بورهان فائق فارس






# ئاینی ئێزیدی

**لێکۆلینەوەیەکە لەسەر «ئاینی ئێزیدی» ئەنجامدراوە، پشتی**
**بە پاشماوەی نوسراو و قسەی سەرزاری خەڵك بەستووە**

# ئاینی ئێزیدی

لێکۆلینەوەیەکە لەسەر «ئاینی ئێزیدی» ئەنجامدراوە، پشتی بە پاشماوەی نوسراو و قسەی سەرزاری خەڵک بەستووە

نووسینی: د.عبدالقادر مارونسی
وەرگێرانی: بورهان فائق فارس
دیزاین: ئومێد محەمەد
ساڵی چاپ: ٢٠١٩
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
چاپ: چاپخانەی تاران

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٣٠٦ )ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە

# ئاینی ئێزیدی

لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر «ئاینی ئێزیدی» ئەنجامدراوە، پشتی
بە پاشماوەی نوسراو و قسەی سەرزاری خەڵك بەستووە

لە زانکۆی تاران
کۆلێژی ئەدەب و زانستی مرۆڤایەتی زمان و ئەدەبیاتی فارسی پێشکەشکراوە

لێکۆڵینەوە لە ئاینی ئێزیدی
بەپێی پاشماوەی نوسراو و سەرزار

بە ڕێنمایی
دکتۆر ژاڵە ئامۆزگار

و ڕاوێژی
دکتۆر احمد تفضلی و دکتۆر اسماعیل حاکمی

نوسینی:د.عبدالقادر مارونسی
وەرگێرانی: بورهان فائق فارس

٢٠١٩

# پێڕست

### ژیاننامەی "دکتۆر عبدالقادر مارۆنسی" لەچەند دێڕێکدا:-

عبدالقادر کوڕی "مەلا حسین مارۆنسی"ە، لە ساڵی ١٩٥٢ زاینی لە گوندی قابوسی شەنگاڵ لە دایك بووە، بە بنەچە خەڵکی ناوچەی "وان"ی کوردستانی باکورن و هاتونەتە ناوچەی دهۆك و لە گوندی "قابوسی" و پاشان لە "گورا" گیرساونەتەوە. "مەلا حسێن" سەرەرای ئەوەی زانایەکی ئاینی بووە کەسایەتیەکی نیشتمان پەروەریش بووە و لە حەفتاکانی سەدەی رابوردودا رۆڵێکی باشی لە خەباتی نهێنی دژی دەسەڵاتی ئەوسادا هەبووە. برازاکەشی بەناوی "حسێن کوردی" لەکەسە دیارەکانی ئەو سەردەمە بووە.

دوای ئەوەی دوژمن ناچاری دەکەن "مەلا حسین" پەیوەندی بە هێزی شۆرشگێری کوردەوە دەکات و ماڵەکەی دەباتە "زاخۆ" و هێزێکی سەربازی بۆ رێکدەخەن و لە "ئارمشتی"ناوچەی "زاخۆ" بارەگای هێزەکەی دەکاتەوە. عبدالقادری کوڕی ساڵی ١٩٧٣ لە "زاخۆ" ئامادەیی تەواو دەکات، ساڵی ١٩٧٥ کە شۆرشی کوردستان تووشی شکست دەبێت، ئاوارەی "ئێران" دەبن وساڵی ١٩٧٧ لە "کۆلێژی ئادابی زانکۆی تاران" وەردەگیرێت وساڵی ١٩٨٤ بروانامەی بەکالوریوس لە "زمان و ئەدەبی عەرەبی"دا بەدەست دەهێنێت و لەشاری "کەرەج"ی ئێران بە مامۆستا دادەمەزرێت، ساڵی ١٩٩٢ لە"زانکۆی تاران" بروانامەی ماجستێر لە "زمان ووێژەی فارسی"دا وەردەگرێت. ساڵی ١٩٩٤ لە هەمان زانکۆ بروانامەی "دکتۆرا"ش بەدەست دەهێنێت. نامەی دکتۆراکەی بەناوی "لێکۆلینەوەیەك لەبارەی ئێزدیەکان بەپێی دەقە ئاینیەکان" (ئیزدیەکان لە دەقە ئاینیەکانیانەوە) دەنوسێت. ساڵی ١٩٩٥ لە ئوسترالیا چەند کۆرێك دەربارەی "مێژووی کورد و ئاینی ئیزدی" دەگێرێت. دکتۆر عبدالقادر لەسەر ریچکەی بنەماڵە بەخشندەکەی بوو، میللەتەکەی خۆی خۆش دەویست، کەسایەتیەکی هێمن و لەسەر خۆو بەرێز بوو. بەو توانا زانستیەی هەیبوو بەرگری لەگەلەکەی دەکرد، نمونەی مرۆڤی راستگۆو دەستپاك و رۆشنبیر بوو، نامەی دکتۆراکەی کە دەربارەی ئاینی ئیزدی و مێژووی کوردە زۆر بێلایەنانە و دەستپاکانە نووسیوەتی.

لە ٢٠٠٠/٩/٣دا لە دهۆك چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ گۆڤاری "لالش" ئەنجامداوە باسی قوڵایی مێژووی کورد و ئاینی ئیزدی دەکات، جەخت لەوە دەکات کە:

١. هەركەس بیەوێت بە قووڵی دەربارەی ئێزدیەكان بزانێت، دەبێت لە مێژووی ئێرانی و هیندیەكانەوە بەدووداچوونیان بۆ بكات.

٢. جەختی لە خاڵێكی گرنگ كردۆتەوە كەلە سەردەمی خەلافەتی " عومەری كوڕی خەتتاب"دا بەچاوی "ئەهلی كتاب" سەیری ئێزدیەكان كراوە و هەمان حسابی كریستیان و جوەكانیان بۆ كراوە.

٣. دڵنیایی داوە كە ئاینی "مەزدیسینا" كەبەر لە هاتنی ئاینە ئاسمانیەكان ئاینی باوی "ئێران"بووە هەمان ئاینی "ئێزدیە".

لە وەڵامی پرسیارێكدا دەڵێت: ئەگەر لە ئاینی ئیزدی تێبگەین گشت لایەنەكانی پێش ئیسلامی كورد تێدەگەین.

٤. ئاماژەی بە دوو دەستە لە نووسەرانی مێژووی ئێزدیەكان داوە:

أ- دەستەی یەكەم كە دەمارگیری نەتەوەیی و ئاینی بەسەریاندا زاڵ بووە.

ب- دەستەی دووەم كە بەراستگۆیی و دەستپاكی نووسیویانە، لەوانە "جورج حبیب"ە كە نوسراوێكی دەربارەی ئێزدیەكان نووسیوە بەناوی "ئێزدیەكان پاشماوەی ئاینی رەسەن" بەڵام وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندنی ئەوسای عێراق نەیانهێشتووە، ناچار ناونیشانەكەی گۆریوە بۆ "ئێزدیەكان پاشماوەی ئاینی كۆن" ئەوسا چاپی كردووە، نوسینەكەی بابەتی و راستگۆیانەیە.

لەبەر گرنگی بابەتەكە و پەیوەندی گرنگی نێوان مێژووی كوردو ئاینی ئێزدی و هاوسۆزیم بۆ ڕەنجی ئەم مرۆڤە دڵسۆزە هانام بۆ "مامۆستا بورهان" برد ئەم نوسراوە بە نرخەی گەلەكەمان كە بەزمانی فارسی بوو بەبێ چاپكردن بەبێ ناز كەوتبوو بۆ زمانی كوردی وەربگێڕێت، چونكە خەرمانێكە لە دەقی ئاینی ئێزدی و بەڵگەی مێژوویی میللەتەكەمان و هیوادارم بۆ زمانی "عەرەبی"یش وەربگێڕێت و ببێتە سەرچاوەیەكی بەكەڵك بۆ لێكۆڵەران و خوێنەران و دەلاقەیەكی گەورەی زانیاری دەربارەی مێژووی كورد و ئاینی ئێزدی بكاتەوە و بەرچاورونیەك دەبێت و كتێبخانەكان دەوڵەمەند دەكات.

دادوەر

قاسم ئوسمان رفو

سلـــــێمانی/ ٢٠١٨

# پێشەکی

(( خەڵکینە ئێمە، ئێوەمان لە نێر و مێ دروستکردووە، گەل و تیرەمان لێ پێکهێناون هەتا یەکتری بناسن و بەخشندەترینتان لەلای خوداوەند خوداپەرسترتانە.)) ١ سورە حجرات ایە١٣

لـــــــەلای یەزدانی مەزن تەنها خوداپەرستی بەهەند دەگیرێت. جگە لە خوداپەرستی گشت ناجۆریەکان نادیدە دەگیرێت، هەموو مرۆڤێکیش بە خوداپەرستیەکەی هەلدەسەگێنرێت، کەواتە لەم دنیایەدا و لەلای ئێمەی مرۆڤیش پێوانەی مرۆڤەکان خوداپەرستیە، نەژاد و زمان و ..... خاوەنداریێتی نرخێکی نابێت، بەڵام بۆ ئەوەی خۆپاریزان دەرکەون و هۆکاری ناکۆکیەکان نەمێنن، پێویستە یەکتر بناسن، چونکە ناسین یەکێك لە گرنگترین پێداویستەکانی پێکەوە ژیان و ئاشتی خوازیە. ئەگەر کۆمەڵانی خەلك هەل بۆ یەکتری برەخسێنن یەکتر بناسن ولە ناکۆکیەکانی خۆیان و گەلانی دیکە چاوبپۆشن و بە پێی ئەو دەقەی سەرەوە کاربکەن، زۆرێك لەو گرفتاری و ململانیەی مرۆڤی دەیەمی کۆتای سەدەی بیستەم کە پەلەقاژێی تێدا دەکەن و سەرگەردانن چارەسەردەبن و ئەم سەرزەمینە بەجۆرێکی تر دەبێت، کەچی لە جێگەی ئەوەی گەلانی سەرزەوی خەریکی ناسینی یەکدی بن و دەست لە نێو دەستی یەکدی بنێن، بەهۆی ئەو گومان و خانەگومانیەی بەرامبەر یەکتر هەیانە، هەولدەدەن تەواوی مرۆڤایەتی دووچاری بەدبەختی و چارەرەشی بکەن.

پەیرەوانی ئاینی (ئێزیدی) وەکو کۆمەلەیەکی پچووکی مرۆڤایەتی لەبەر ئەوەی بە باشی نەناسراون، بە درێژای ئەو مێژووە تاریکەی هەیانبووە، لەلایەن سیاسەتزان و بەرژەوەند خوازانەوە تۆمەتی جۆراوجۆریان بۆ هەلبەستراوە، جارێك بەبیانوی خراپەکاری و سەردەمی بەناوی (أباضیە و باطنیە) و ماوەیەك بەناوی شەیتان پەرستی و رۆژگارێکیش بە ناوی دوژمنانی ئالی بەیتەوە توشی دەستدرێژی و مالوێرانی بوونەتەوە و زۆربەی ئەندامانی ئەم کۆمەلگەیە یان کوژراون یان ئاوارە و دەربەدەربوون و ناچارکراون لە بەرگیکی دیکەدا خۆیان بپارێزن.

ئەم تۆمەتانە لەلایەن کەسانێك یان چەند دەستەیەکەوە هەلدەبەستران و خەڵکی بێئاگایان لێ هاندەدان و ئاشکراشە بۆ مەبەست و سودی دنیایی خۆیانە ئە کارەیان کردوە.

بە لێکۆلینەوە لەم ئاینەو ناسینی پەیرەوانی بۆ هەر مرۆڤیکی رۆشنبیر ئاشکرا دەبیت ئەم ئاینە هەمان شێوەی ئاینەکانی دیکە لە سەردەمی خۆیدا بۆ خۆشی ژیانی کۆمەلگەی مرۆڤایەتی و بەرەو پێش چوونی مرۆڤ بووە.

سەردەمێك کە گەلانی ئێران ئەم ئاینەیان هەبووە، بەپێی زانیاریەکان ئەم ئاینەیان لە ئاینەکانی دیکە پێ باشتربووە لە هەمان کاتیشدا پەیڕەوانی ئاینەکانی دیکەشیان لە گێرانی بۆنەکانی خۆیان ئازادکردبوو، چونکە باوەریان وابوو رێگەکانی گەیشتن بەراستی زۆرن. لەگەل ئەوەشدا دەبێت ئەوە بزانین مرۆڤایەتی لە پێشکەوتندایە و مەرجە سەپاوەکان جۆربەجۆرن و یەزدانی مەزن ئاگاداری گشت شتەکانە و بەپێی تێپەرینی رۆژگار و بۆ بەرچاو روونی مرۆڤایەتی، پێغەمبەرانی خۆی بەزانیاری نوێوە دەنارد تا خەڵکی فێربکەن و بەرەو قۆناغی بالآتریان بەرن، لەبەر ئەو رێسا ئاسمانیانە دژی یەکتری نابن بەڵکو تەواوکەری یەکدی دەبن و مرۆڤ بەرەو یەزدان دەبەن. باشترین گەواهیش بەردەوامی ئاینە کۆنەکان و پەیرەوانی ئەوانە.

بە پێی ئەم بەڵگانەی لای خوارەوە دەستم بە ناساندنی (ئاینی ئێزدی) کرد:

١. بەسەربردنی بیست ساڵی سەرەتای ژیانم لە (شەنگاڵ) کە یەکێکە لە سەنتەرە گرنگەکانی ئیزدیەکان و لە کۆلآن و بازار و خوێندندا لە گەڵیان هاوژیان بووم.

٢. رێکەوتی خوێندنم لە ئێران لە بەشی (زمان و ئەدەبیاتی فارسی)دا و رووبەروو بوونەوەم لەگەڵ زۆرێك لە بابەتە هاوبەشەکاندا، وەکو پۆشاك، زمان و هەندێك لە باوەرەکان، چونکە دەبێت بڵێین بەبێ ئاشنایی پێویست لە (زمان و ئەدەبیاتی فارسی) دا هەر جۆرە لێکۆلینەوەیەك لە هەر بەشێکی فەرهەنگی (گەلی کورد) دا بکرێت ناتەواو دەبێت.

٣. زمان، زمانی دایکم هەمان ئەو زارەوە (کرمانج) یەی زمانی کوردیە کە (ئێزدی)ەکان پێی دەدوێن و قەول و بەیتەکانی پێداریژراوە، ئەم زارە یەکێك لە کۆنترین

زاره ئێرانیەکانە، نوسەری کورد (جەمال نەبەز) ئەم زارەی بە کرمانجی باکور ناوبردوە و دەڵێت ئەم زارە (بۆتانی، جزیرەیی (شاری جزیری ئیبن عومەر)، هەکاری، بادینانی، ئاشیتی و بایەزیدی) دەگرێتەوە زاری جزیرەی بەسەر هەموو ئەو زارە ناوبراوانەدا زاڵە و جێگەی زمانی ئەدەبی گرتۆتەوە، ناوبراو زاری کرمانجی بە کۆنترین زاری کوردی دادەنێت[1].توفیق وەهبی بەو کوردانەی کە لە باکوری ئەو هێڵە وەهمیەی[2] لە کرماشانەوە دەستپێدەکات و بە شارەکانی خانەقین و قەشقەدا دەروات بە (دجلە) دەگاتەوە و لەوێوە بەرەو باکوری رۆژئاوا درێژدەبێتەوە دادەنیشن بە (کرمانج) ناویان دەبات. هەرچەندە ئەم زارە بە تێپەرینی رۆژگار دوچاری گۆران و لادان بووە بەڵام پتر لە زارەکانی دیکە نیشانەکانی کۆنی خۆی پاراستووە، لە نیشانە گرنگەکانی ئەوزارە بوونی (نێر و مێ) یە لە رستەدا پاشماوەی گەردانی ناوی تێدایە، جگە لەوەی کار بەپێی بکەری کۆ بەشێوەی کۆ دێت لەگەڵ بەرکاری (کۆ)ش کاری رابردوو بەشێوەی (کۆ) دێت[3] هەرچەند بکەر (تاک)یش بێت، پاش گۆرانی صرفی و نحوی، زارەکی و مەعنەوی کە بە تێپەربوونی رۆژگار لەم زارەدا رویداوە بەلام هێشتا لە زمانی فارسی باشترە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئێزدیەکان تەواوی زانیاریە ئاینیەکانی خۆیان لە قالبی (سروود) دا بەم زارە دارشتووە و لەبەری دەکەن و نەوەبەنەوە سینە بە سینە بەبێ کەم و کورتی بۆ نەوەکانی دوای خۆیانی دەگوێزنەوە.

رەنگە هەر بەهۆی ئەوەوە بوبێت کە (محمد تقی بەهار) بڵێت:

زمان و ئادابی "گەلی کورد" یەکێك لە دێرینترین زمان و ئادابی ئێرانیەکانە[4] و لە نوسراوە ئاشوریەکاندا ناوهێنانێك لە خەڵکی "کردو" هاتووە[5].

---

١- جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی ل٢٢-٢٣ بامبرگ ئەلمان ١٩٧٦.

٢- ئامێدی: صادق بەهادین- رێزمانی کوردی ل٢٨.

٣- آموزگار، ژاڵە تفضلی احمد، زبان بهلوی، ادبیات و دستور آن ل٦٦-٦٧

٤- بهار، محمد تقی، سبك شناسی، ب١ ، ل٥

٥- هەمان سەرچاوە، ل٦

جۆرج حبیب نوسەری سەردەمی عەرەب لە پەرتووکەکەیدا ((الیزیدیة)) ئاماژەی بەوەداوە کە لە سەرزەمینی (ئاشور)دا چەند مەزارێك هەیە، لەو مەزارانەدا چەند پەیکەری (ناپۆ) کە بەبروای حبیب، ئیزە و خورشید ئەو پەیکەرانەی تاشیون، شایەنی باسە ئەگەر بەراوردێك لە نێوان پەیکەرە پیرۆزەکانی نێو ئێزدیەکان و پەیکەرەکانی سەردەمی کۆنی ئێراندا بکەین جۆرێك لە یەکچوون لە هزرماندا پەیدا دەبێت[٦].

لە نەخشی شاهانی (هەخامەنشی) دا جانەوەری سەیر دروستکراو دەبینرێت کە بە "پێشانگای دێوان" ناسراوە[٧]. گوایە لەو سەردەمەدا روداوێکی دیاریکراوی ئاینی و هەتا ئاینزاش روویداوە، ئاینزای (هورمز) پەرستی لە لای (ئەشکانی) یەکان بە شێوە سەرەتاییەکەی خۆی ماوەتەوە، لە لای پارتیەکان دروستکردنی پەیکەر یان وێنەی هورمز لە نێو پەرستگاکاندا پەرەی سەندووە، پاشاکانی ئەوان باوانی خۆیان دەپەرست، هەرئەمەش لەلای ئێزدیەکان دەبینرێت و پایەی (شێخ شمس) و (شیخادی) باشترین نمونەی ئەم قسانەمانن[٨].

ئاینی ئێزیدی لەگەل ئاینی زەردەشتی جیاوازیان هەیە ئەمەی لای خوارەوە هەندێك لەو جیاوازیانەن:

١. زەردەشت و کورە چاوەروانکراوەکانی کە ناویان: (هوشیدەر، هوشیدەرماه، سوشیانس)ە لە ئاینی زەردەشتی دا پیرۆزن[٩]، بەلام لەنوسراو و بۆنە ئاینیەکانی ئێزیاندا ئەو ناوانە بۆنیان نیە.

٢. ئاینی زەردەشتی خەلکی بۆ ژیانی نیشتەجێبوون و کاری کشتوکالی بانگدەدات. کەچی هێشتا لەناو کوردەکان و بەتایبەتیش لە نێو ئێزیدیەکاندا هۆزی کۆچەری هەن.

---

٦- مزدیسنا و تأید آن در ادبیات فارسی، ل٢٠٥ و بیرینا و اقبال، تاریخ ایران

٧- هەمان سەرچاوە، ل٦

٨- هەمان سەرچاوە، ل٦

٩- تفضلی، احمد، ترجمه مینوی خرد، ل٨٧ تهران ١٣٦٤

٣. ڕۆژوگرتن یەكێك لە پایەكانی خواپەرستی ئێزیدیانە، بەڵام لای زەردەشتیەكان ڕۆژو بەشێك لە خواپەرستی نیە.

٤. ئێزیدیەكان مردووەكانیان بەخاك دەسپێرن بەلام زەردەشتیەكان مردووەكانیان دەرخواردی "داڵ" دەدەن، تەنها ئێسكەكانیان لە تاقی تایبەتدا دەپارێزن[١٠].

لە سەردەمی ساسانیەكاندا ئاینی زەردەشتی ئاینی فەرمی دەوڵەتی ئێرانبوولەگەڵ ئەوەشدا چەند ئاینی دیكەش هەبوو لەوانە: (مهرپرستی، مانەوی، مەزدەكی[١١]).

دوای پەیدابوونی ئاینی ئیسلام، كەسایەتیەكان و خەلكانی خاوەنی ئەو ئاینانە بۆ بەرگری و مانەوەی ئاینەكانیان لە ڕۆژئاواو باكوری ئێران دەستیان بە ڕاپەڕین كرد، ئێستاش گرنگترینی ئەو ناوچانە جێگەی نیشتەجێی ئێزیدیەكانن لە ڕۆژئاواو و باكوری ڕۆژاواو لە سوریای ئێستادان، ئەو ناوچانەش بریتین لە:

ئێراقی ئێستا: شاری شەنگال، تەلەعفەر،موصل، مەرگە (شێخان)، باشوری قەزای سێمێل لە پارێزگای دهۆك، دهۆك خۆی و باشوری ڕۆژئاوای زاخۆ.

سوریا: لە قەزای دێركێ، قامیشلی، دەوروبەری حەلەب و شوێنەكانی دیكە.

توركیا: لەشاری جزیر، مێردین، دیاربەكر، ئۆرفا و شوێنەكانی دیكە.

هەروەها لە تفلیس، گورجستان (جۆرجیا)، ئەرمەنستان، كۆماری ئەزەربێجان[١٢].

ئێرانی ئێستا لە ناوچە جیاوازەكان وەكو گوندی (جەبەرلو)ی نزیكی (تەبریز) و لە ناوچەكانی خوارتر[١٣] و لە پارێزگای كرمانشان و ڕەنگە لە (دینەوەر)یش هەبن.

لەم سالانەی دوایدا وڵاتی (ئەلمان) ژمارەیەكی زۆری لە ئێزیدیەكان بە تایبەتی ئێزیدیەكانی توركیا پەناداوە، ئێستا لەوێ مەلبەندێكی كلتوری تایبەت بە خۆیان هەیە.

---

١٠- فرهنگ معین، زیرواژه ستورانز.

١١- پیرنیا و اقبال، تاریخ ایران ل٢٥٨-٢٦٢

١٢- أگینر و شیرین، اقوام مسلمان دراتحاد شوروی ل٢٦١

١٣- میراحمدی، مریم ، دین و دولت و عصر صنوی ل٨٥

شایەنی باسە نوسەر لە کارەکەیدا هەوڵی داوە پشت بەو سەرچاوانە ببەستێت کە ئێزیدیەکان دەربارەی خۆیان نوسیویانە یان لە قەول و بەیت و هۆنراوەکانیاندا هاتووە، تاوەکو بناغەیەك بەکاربهێنێت، ئەوان لە نوسراوەکانیاندا خۆیان بە (ئێزیدی) نەك (یەزیدی) ناوبردووە، نوسەریش لە بابەتی ناودا (ئێزیدی) داناوە هەرچەندە لە پەرتووکەکانی (دائرة المعارف) دا بە (یەزیدی) هاتووە.

ئەوەی جێگەی بیرهێنانەوەیە نوسەر بە دوو کتێبی ئێزیدیەکان جەلەوە (جلوە) کە دەربارە دێرینی خودا، سیفەتەکانی ئەو، زانستی غەیب، وادە و وادەکاریەکانی خوداوەند، و (مصحف رەش) کە دەربارەی پایەی ئێزیدیەکانە، حوکمەکانی حەڵاڵ و حەرام و خواپەرستی[14] یە و الحسنی و هەندێك لە نوسەرەکان باسیان کردووە نە پشتیان پێ بەستووە و نە سەرنجی داوە، چونکە ئێزیدیەکان خۆشیان لە بوونی ئەو دوو پەرتووکە بەگومانن[15] و بە جۆرێك دەقەکانیان شێواو و ئاڵۆزاوە لەوە ناچێت پەیوەندیان بە ئاینزاوە هەبێت.

پەرتووکێکی زۆر دەربارەی ئاینی ئێزیدیەکان هەیە بەلام بەداخەوە زۆربەیان کۆپی یەکترن. لە لێکۆلینەوە بیانیەکان (پرۆفیسۆر مار) لەهەموویان باشتر راستیەکانی نوسیوە و لە عەرەبەکانیش (جۆرج حەبیب)، لە ئێرانیەکانیش (کەیخوسرەو ئەسفەندیار) لە پەرتوکی (دبستان مذاهب) دا باسی درێژی سەبارەت بە ئێزیدیەکان نوسیووە، لە کوردانی نا ئێزیدیش (توفیق وهبی) لێکۆلینەوەی سەرنجراکێشی نوسیووە، لە ئێزیدیەکان کاری (پیر خدری سلێمان ) بە تایبەتی دوو پەرتوکی (ئێزدیاتی و گوندیاتی) جێگەی سەرنجن و زۆربەی پارانەوە و قەولی ئێزدیەکانم لەم دوو پەرتوکە ورگرتووە.

عبدالقادر مارونسی

٢٥ /١٠ / ١٣٧٢

---

١٤- اليزيديون ل٥٢-٥٣

١٥- ئێزدیاتی ل١٥٥-١٥٦

# بەشی یەکەم

## بابەتی ناوی ئێزیدیەکان:

ئەگەر لێکۆلینەوە لە بارەی ئاین و کۆمەلە مەزهەبیەکانەوە بکریت و تەنها پشت بە ناوو ناونیشانیان ببەسترێت، بیر و باوەر و نەریت و کلتور و پاشماوەکانیان لەبەر چاو نەگیرێت کارێکی زۆر دژودار و نا بەجێ دەردەچێت. هەرئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی زۆربەی ئەو لێکۆلەرانەی دەربارەی ئێزیدیە کۆنەکان وەکو عبدالکریم کوری محمد سەمعانی (٥٦٢ کۆچی)[١٦] لە نوسەرە نوێکانیش وەکو عبدالرزاق الحسنی، عباس العزاوی و روژ لسکۆ[١٧] نوسیویانە سەرکەوتوونەبوون. شایەنی وتنە دەسەلاتدارانی وولات هێندە بەسەختی و دوژمنانە سەیری ئێزیدیکانیان کردووە ناچاربوون ئاین و زۆربەی باوەر و کلتور و رێورەسمەکان بە نهێنی بهێلێنەوە، ئەمەش هێندەی دیکە کاری لێکۆلەرانی دژوارترکردووە.

سەبارەت بە ناوهێنانی ئێزیدیەکان نمونەی دیدی سێ دەستە دەهێنینەوە:

١- دەستەی موسلمانانی دەمارگیر یان عەرەب:

عبدالقادری کوری طاهر بەغدادی (٤٢٩ کۆچی) لە کتێبەکەیدا (الفرق بین الفرق) ئێزیدیەکان بە پەیرەوانی یەزیدی کوری ئەنیسەی خارجی (١٢٦کۆچی) داناوە[١٨]. ناوبراو خەلکی (بەسرە)بوو بەلام ناچارکراوە لەسەرزەمینی (فارس) بژی، ئەو باوەری بە دەستەی (اباضیة)[١٩]ی سەربە (خەوارج)ەکان هەبووە، لەسەرئەوەی کەدەیووت خوداوەند پەیامبەرێك لە عەجەم دەنێرێت و پەراوێکی ئاسمانی بۆ دادەبەزێنێت و بەپێی

---

١٦- الحسینی، عبدالرزاق "الیزیدیون" ل١٥، چاپی دەیەم- بغداد- ١٩٥٤

١٧- نیکتین، ڤاسیلی "کورد و کوردستان" وەرگێرانی محمد قاچی ل٤٧٥

١٨- بغدادی عبدالقادر، الفرق بین الفرق ل١٤٨-١٦٧ مصر ١٩٤٨ زاینی.

١٩- اباضیە: (پەیرەوانی عبدالله اباضی)ە ناوبراو لە سەردەمی دەولەتی مەروانی کوری محمدی ئەمەویدا خۆی ئاشکرا کرد.

رێنماییەکانی ئەو پەراوە پەڕاوی (محمد) هەڵدەوەشتێتەوە بەمە لە شوێنکەوتوانی "محمد" دەرچوو....[20]

بەڵام سەبارەت بە بنەچەی (یەزیدی کوری معاویە) هیچی نەوتووە. محمدی کوڕی عبدالکریم شەهرستانی (٥٤٨ کۆچی) لە کتێبی (الملل و النحل)[21] دا لەبارەی "ئێزیدیەکان"ەوە هەمان ووتەکانی (بغدادی) دووبارە کردۆتەوە شتێکی دیکەی سەرنەخستووە.

بەڵام عبدالکریم کوری محمد سمعانی کە (١٤) ساڵ دوای شەهرستانی کۆچی دوای کردووە دەربارەی ئێزدیەکان شتی تازەی ووتوەو، دەڵێ: ((لە عێراق لە کێوەکانی حەلوان[22] و دەوروبەری بەدیداری کۆمەڵێك لە یەزیدیەکان گەیشتم، وایان نیشاندەدا خواپەرستی دەکەن، گلّیان دەخوارد بەدەگمەن تێکەڵی خەڵك دەبوون و باوەریان بە پێشەوایەتی (یەزیدی کوری معاویە) هەبوو، ئەویان بەراست دەزانی، لە مزگەوتی (المرح) یش دەستەیەکیانم بینی بیستم کە ئەدیب (حسن کوری بنداری بروجردی) کە پیاوێکی بەرێز و گەرۆك بوو بۆ سنجار (شەنگال) لەیەکێك لە پەرستگاکانی ئەواندا، یەزیدیەك ڕوانینی ئەوی دەربارەی (یزید) پرسی بوو، بروجردی ووتبوی: دەربارەی کەسێك کە خوداوەند لەچەند جێگەی "قورئان" دا ناوی ئەوی بردبێت چی بڵێم؟ بۆ نمونە هاتووە کە "(یزید في الخلق ما یشاء)"، و (( یزید الله الذین اهتدوا هدی)) ناوبراو ووتی کەوام ووت زۆر پێشوازیان لێکردم، خواردەمەنی زۆریان دامێ[23].

ئەوەی دەربارەی حسن کوری بنداری بروجردی باسکرا ئەگەر راست بێت بێ ئاگایی ئەو کۆمەڵە لە "قورئان" و زانیاری دەربارەی ئیسلام دەردەخات، لە کاتێکدا کە یەزید

---

٢٠- الملل و النحل، شەهرستانی ل١٢١.

٢١- هەمان سەرچاوە.

٢٢- حەلوان لە دەورەی ئیسلامدا گشت شارەکانی (خانەقین)، قەسری شیرین و سەرپێل زەهاوی دەگرتەوە، (ر.ك) دراسات کردیە في بلاد سوبارتو ، جمال رشید، ل١٢

٢٣- سمعانی، عبدالکریم عبدالکریم بن محمد، الانساب، ل٦٣٩.

خۆی بە جێشینی پەیامبەری خودا و سەربەو ئاینە دەزانی.ئەسمەعانی بەدوو بەلگە ئێزیدیەکان بۆسەر (یەزیدی کوری مەعاویە) دەباتەوە:-

١- هەرچەندە بەهەڵە لەباتی ئیزیدی (یەزیدی) یان بیدەڵێت و بۆسەر (یەزید) وکام (یەزید)یان دەیاتەوە.

سەمعانی پێنج ساڵ دوای عودەی کوری موسافیر (٥٥٧ کۆچی) مردووە[٢٤] و هاوسەردەمی ناوبراوبووە (دواتر بەدرێژی باسی دەکەین) لە بنچەدا بۆ سەر ئەمەویەکان دەگەڕێتەوە لە گەڵی (لالش) لە نێو ئیزیدیەکاندا ژیاوە زانیاری هەبووە زۆربەی ئەو نوسەرانەی پاش (سەمعانی) لەسەر ئیزیدیەکان نوسیویانە، بەتایبەتی نوسەرانی عەرەبی زمانی سەردەم، ئەم دیدەی (سەمعانی)یان دووبارە کردۆتەوە، بۆنمونە: بەبڕوای (عباس العزاوی) نوسەری پەراوی (تاریخ الیزیدیە)، ئێزیدیەکان موسڵمانی خواپەرستن و بڕوایان بە پێشەوایەتی (یەزید) هەیە[٢٥]، هەروەها ناوبراو لەو بڕوایەدایە بەهۆی لێکچۆنی چەند پیتی (یەزید) لەگەڵ (یەزدان)دا دروست بووە فورلانی لە پەراوی ( Religious texts of the Yazidi) ئەوانی بە مەجوسی زانیوە، بەڵام ئاشکرایە (عزاوی) خۆشی بەهۆی ئەو لێکچونەوە توشی ئەو هەڵەیە بوەتەوە، ئێستا دابنێین ئەم ناوەی کە بەرێز عەزاوی ئیزیدیەکانی بۆسەر (یزید) پێبردۆتەوە راستیش بێت، ئەی دەربارە ناوەکانی وەکو (مێرگان) کە یەکێك لە ناوچە گەورەکانی "شەنگال"ە یان "بادینان" کەناوی ناوچەیەکە لە دوری (٧٠کلم)ی ناوچەی جێنشینی (عزاوی) خۆی و جێگەی گەرمیان و کوێستانی هۆزە کوردەکانە و لەوانە ئیزدیەکانیش، ئەی دەربارەی زۆربەی وشەکانی زمانەکەیان چی دەڵێت؟

"عبدالرزاق الحسنی"یش لە پەرتووکی ((الیزیدیون)) دا ئەو هۆزەی بۆ (یزیدی کوری معاویە) بردۆتەوە، سوریشە لەسەر ئەوەی بناغەی باوەری ئەوان (مەجوسی)بێت،

---

٢٤- ابن الاثیر، الکامل فی التاریخ، بەرگی ١١، ل٢٨٩، بیروت، ١٩٧٩.

٢٥- العزاوی، عباس، تاریخ الیزیدیە و اصل عقیدتهم، ل٩،بغداد

بەلام دەلێت: بەهۆی ئەوەی زیاد لە پێویست باوەریان بە چاکی ( یزیدی کوری معاویە ) بووە بەم ناوە ناونراون[٢٦]. بەلام هیچ باسی پەیوەندی (مجوسی) و (یزیدی) نەکردووە.

بەشی کۆتایی دیدی (الحسنی) پشتی بەووتەکانی (سمعانی و احمد تیمور پاشا) بەستووە، أحمد تیمور پاشا لەو باوەرەدایە پێش سەدەی شەشەمی کۆچی هیچ کۆمەلێك بەو ناوەوە نەبوون، کاتێك کە (عدی کوری مسافر) چووە ناویانەوە بەخواپەرستی و چاکی ناسرابوو، کۆمەلێك لە کوردەکان بوونە موریدی و پەیرەویانکرد.

ئەو تەریقەی (عدویە)ی دامەزراند و ئەم کۆمەلە بە (عدویە) ناویان کرد. بەلام سەردەمی گۆرینی (عدویە) بە (یزیدیە) دیارنیە، لەوانەیە لەچەرخی کۆتایدا دەرکەوتبێت[٢٧]. ئەوەی هەتا ئێرە رونکرایەوە نزیکەی پوختەی دیدو بۆچوونی نوسەرانی عەرەب و عەرەبی نوسانە کە دەربارەی ئێزیدیەکان نوسیویانە. ئێستا با بزانین دید و بۆچوونی نوسەرانی رۆژئاوا و رۆژهەلاتناسان چیە؟ مینورسکی لە کتێبی (کورد) دا نوسیوەتی "یەزیدی ناوی میللی کۆمەلەی یەزیدیەکانە، ئاشکراشە ئەم ناوە لە وشەی (ئێزەد)ی ئێرانی کۆنەوە کەواتای (خودا)یە هاتووە.........[٢٨] رۆژلسکو دامەزرێنەری ئەم ئاینە بە (عدی کوری مسافر) دەزانێت و دەلێت ئەوان لە بنەرەتی ئاینی ئیسلام لایانداوە.[٢٩] بەبروای پرۆفیسۆر مار، ئاینی ئێزیدی ئاینی کۆنی کوردانە پێش ئەوەی موسلمان بن پەیرەوی ئەو ئاینەیان کردووە[٣٠]. نیکیتین هەرگیز ئێزیدیەکانی بە موسلمان دانەناوە و دیدی (پرۆفیسۆر مار)ی دەربارەی ئەوان لا پەسەندە[٣١] فورلانی دەلێت ئەم ناوە سیفەتی مێنیەی یزیدیە کە ناوێکی زۆر ئاساییە لە نێو عەرەبەکاندا، لێکدراوە و

---

٢٦- الحسنی، عبدالرزاق، الیزیدیون ل٢٠

٢٧- بەوەرگرتن لە: الحسنی، الیزیدیون ل١٤

٢٨- مینورسکی، کورد وەرگێرانی حمه سعید ل١١٢ بغداد ١٩٨٤

٢٩- بەوەرگرتن لی:نیکتین، کوردو کوردستان ل٤٧١

٣٠- هەمان سەرچاوە ل٤٧٢

٣١- هەمان سەرچاوە ل٤٧٢

ناوی (یزیدیە) تا ئەندازەیەك لەوەوە سەریهەلداوە. کە ئەم کۆمەڵە بەهۆی (یزید)ەوە پەیدابووبێت، کە هەندێك لە نوسەران بە (یزیدی کوری معاویە)ی ئەمەوی دەزانن.

لە [٣٢] Encgc Oiopidia Beitenica هاتووە کە لەوانەیە ئەم ئاینە لە ئاینی مەسیحیەوە هاتبێت بەلام پێکهاتەکانی لە ئیسلام و مەزهەبە رۆژهەلاتیەکانەوە وەرگرتبێت، بەلام سەبارەت بەناوی ئاینەکە هیچی نەوتووە. ئەنسکلوپیدیای ئەمریکا ئاینی ئێزیدی بە یەکیك لە ئاینە کۆنەکان داناوە و لەبارەی (یزید)ەوە هیچی نەوتووە [٣٣].

لە راگەیانراوی "کۆمیسیونی کۆمەڵەی گەلان"دا کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم بۆ کوردستانی عێراق هاتووە، کوردە ئێزیدیەکانی بە (کوردانی زەردەشتی) ناو بردووە. [٣٤]

لە دیدگای رۆژهەڵاتناسانەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە جگە لە(رۆژلسکۆ) هیچیان ئەم ئاینەیان بۆ (یزیدی کوری معاویە) نەگێراوەتە و رەنگە ئەمەش لەدوای ئەو سەرنجانەوە بێت کە لە بیروباوەر و کلتور و هەلس و کەوتی ئێزیدیەکانیان داوە، بەلام هەر سەرنجەکانی ئەوانیش بەس نیە.

ئینجا با چەند نمونەی دیدی نوسەرانی کورد و فارسی نوسان بدەین: شەرەفخانی بەدلیسی لە پەرتووکەکەیدا نوسیوەتی: تیرەکانی طاسنی و خالدی و پسیان و هەندێك لە تیرەکانی بوختی و مەحمودی و دنبەلی کە ئاینزای (یەزیدی)یان هەیە لە موریدانی شیخ عدی کوری مسافرن کە یەکێك لە شوێنکەوتوانی خەلیفەکانی زنجیرەی مەروانی بووە و خۆی بۆسەر ئەو بردۆتەوە.....)) [٣٥].

دەکرێت بلێین ئەم نوسەرە کوردە زانیاریەکی زۆری دەربارەی ئێزیدیەکان هەبووە، چونکە لەلایەن دەولەتی ((صفوی)) و ((عوسمانی))ەوە لە ناوچەو دەوروبەری دانیشتنی ئێزیدیەکان وەکو: ئاران و بەدلیس فەرمانرەوایی کردووە، شەرەفخان لەبارەیپەیوەندی

---

٣٢- V.32-P.807.

٣٣- Engolopedia Americana v.23.

٣٤- سیسیل جی ئامۆندز کردها و تورك ها عرب ها، ترجمە ابراهیم یونس، مقدمە مترجم،ص.

٣٥- بدلیسی، شرف خان، شرفنامە (تاریخ مفصل کردستان) ص٢٦-٢٧.

ئـەوان بـە ((یەزیـد))وە هیچـی نـەوتووە، لـەبارەی "شـێخ عـدی کـوری مسـافر" کـە دامەزرێنەری "طریقـەتـی عدویـە"[36] بـووە، ووتویـەتی خۆیـان دەبەنـەوە سـەر ئـەو؟!
ئەمەش خۆی پرسیارێکی (محمد امین زەکی)ە کە نووسیویەتی ((خاوەنی "کتاب تـاریخ موصل" دەڵێت: هۆکاری ناونانی پەیرەوانی ئـەم کۆمەڵەیـە بە(یزیـدی) بـەهۆی ووشـەی (یەزید) یان (یەزدان)ەوەیە، ئەم ناوە (یەزید) هەمانشێوە کە هەندێك لە نوسەران دەڵێن لەگەڵ (یزیدی کوری معاویـە) یـان (یزیـدی کـوری سـلمی) پەیوەنـدی هەیـە لـە ئـەقل و راستیەوە دوورە.
لەلایەکی دیکەوە (نبوفاینس) مێژوونوسی یۆنانی کەلەچەرخی حەوتەمی زایندا ژیاوە، دەلێت:- ئێمپراتۆر (هراکلیس) لە نزیك شاری "یەزدم" لایدا، مێجەر رۆلینسـون دەڵێـت رەنگە ئەم شاری "یەزدم"ە نزیکی (حدیاب=موصل) بووبێت و دەشێت ئێزیدیەکان لـەم شارەوە بڵاوبووبنەوە.[37] محمد امین زەکی لەم بارەیەوە هیچی نەوتووە،دیارە دوو دیـدی سەرەوەی پێ راستبووە ئەگینا رای خۆی رادەگەیاند.
رشید یـاسمی نوسـیویەتی: ریشـەی ئـاینی یەزیدیـەکان، یـەزدان پەرسـتیە، درێـژەی پێـدەدات و دەلێـت: یەزیدیـەکان خۆشـیان لەسـەرئەوەن کـە (یزیـدی کـوری معاویـە) دامەزرێنـەری ئـەم ئاینـە نیـە بـەلکو ئـاینی یەزیـدی بـەهێزکردووە و بایـەخی پێـداوە، دامەزرێنەری بنەرەتی ئەم ئاینە (شاهدی کـوری جـراح). کـە کـوڕی (ئـادەم)ە[38]. بـەلام ئەمـەی رەشـید یـاسمی لـەبارەی ئێزیدیەکانـەوە نوسـیویەتی راسـت نیـە بـەلکو لـە سەرچـاوەی سـاختەوە وەریگرتـووە و ئێزیدیـەکان بۆسـەر (یزیـد) بردۆتـەوە و رشـید یاسمی[39] لە دلپاکی خۆی دووبارەی کردۆتەوە.
پرۆفیسـۆر توفیـق وهبـی نوسـیویەتی: ((ئـەو سەرچـاوە باوەرپێکراوانـەی کـە لێکۆلینەوەی زۆربەی لێکۆلەران دەگرێتەوە بەو راستیەمان دەگەیەنێت کە ریشەی نـاوی

---

٣٦- عدویە ناو پیروان طریقت شیخ عدی بن مسافر اموی است.

٣٧- محمد ابن زەکی (کردو کردستان — بغداد ل٢٨١-٢٨٢).

٣٨- محمد ابن زەکی (کردو کردستان — بغداد ل٢٨١-٢٨٢).

٣٩- یا سمی، رشید، کورد و بیوسنگی نژادی و تاریخی، ل١٢٨-١٢٩.

یەزیدیەکان لەناوی (یزیدی کوری معاویە)ەوە هاتبێت، بەلام پاش بەدواداچوونی زۆری ئەو وێنانەی لە پاشماوەی دێرینی شاری (هاتزا)[40] لە خوار (موصل–عێراق) یان ئیلهام لە نوسینەکانی (کومانت) سەرنجی جۆرێك پەیوەندی نێوان یزدیسم و مثرانیسم دەردەکەوێت[41]. یەکێکی دیکە لە نوسەرانی کورد بەناوی (شاکر فتاح) دەنوسێت: دروست بوونی (یزیدیە) لە (یزیدی کوری معاویە)وە سەیر دێتە بەرچاو!!

(شێخ محەمەد مەردۆخ کوردستانی)یش لەو باوەڕەدایە بردنەوەی ئێزدیەکان بۆسەر (یزیدی کوری معاویە) هەڵەیە[42]، ئەو دەڵێت: ئەوان بە یەزدان پەرست ناو دەبرێن، ئینجا سەبارەت بە ووشەی یەزدان دەدوێت.[43] دکتۆر حشمت الله طبیبي دەربارەی ناونانی (یزیدیە)، بۆچوونی دملۆژی و شهرستانی دەهێنێت و لە کۆتایدا دەڵێت: قسەی دروست ئەوەیە ناوی (یزیدیە) ڕەگەکەی فارسی یە، هەروەکو (مانزل)لە دائرە المعارف اسلامی (فرانسی)دا دەڵێت:

ناوی یەزیدیەکان نە لەناوی (یزید کوری معاویە ) و نە لەناوی (یزید کوری أنیسە) و نەلە شاری (یزد)ی ئێرانەوە وەرگیراوە بەلکو ڕەگی نوێی (ئێزد) کەلە ئاڤێستادا (یەزتە) و لە (پەهلەوی) دا (یەزد) کە بە فارسی نوێ بەمانای (خودا) دێت هاتووە.[44]

عباس اقبال، "یزیدیە)ی بەناوی یەکێك لە کۆمەڵەکانی (شیعە) هێناوە و لەو بروایەدایە هەموو نەوەکانی (ئیمام حسین) باش یان خراپ لەکاتی نوێژدا ئیمامەتی بۆ ئەوانە، هەتا یەکێك لەوان زیندوبێت لە پشتی کەسی دیکەوە نوێژ دروست نیە.[45]

(لغت نامە دهخدا) دەربارەی یزیدیە، سێ بۆچوونی بنەڕەتی، یانی بردنەوەی ئیزیدیەکانی بۆسەر (یزید کوری أنیسە)، (یزیدی کوری معاویە) و ئیزەدی باس کردووە و

---

٤٠- وهبی، توفیق مختصر از تاریخ ادیان کردان، وەرگێرانی سید جمال الدین حسینی ل١٣.

٤١- وهبی، توفیق مختصر از تاریخ ادیان کردان، وەرگێرانی سید جمال الدین حسینی ل٢٣–٢٤.

٤٢- فتاح، شاکر یەزیدیەکان و ئاینی یەزیدی ل١١.

٤٣- مردوخ کردستانی، شیخ محمد (تارخ کرد و کردستان) ب١ ل١١٦.

٤٤- فخرالکتاب میرزا شکرالله تحفە ناصری، حشمت الله گیبی ل٤٦–٤٧.

٤٥- اقبال عباس، خاندان نوبختی، ل٢٦٢.

ئەوانی بە پەیرەوانی شیخ عدی کوری مسافر زانیووە[46] هەروەها دەڵێت: یزیدیە ناوێکی دیکەی شاری (شماخ)ی سەنتەری (شیروان)ە.دەربارەی ووشەی (یەزدان)یش دەڵێت : یەزدان ناوی تایبەتی زنجیرەی شیروانشاکانە، چونکە یەکێك لە باوانی ئەوان ناوی (یەزید) بووە، گوایە دامەزرێنەری ئەو زنجیرەیە محمد کوری یزید بووە... بەپێی فەرهەنگی (مصاحب)[47] . مینورسکی لە کتێبی (تأریخی از شیروان و دربند) لێکۆلینەوەی درێژی دەربارەی شیروانشاکان ئەنجام داوە و بەپێی ئەو لێکدڵێنەوانەی فەرهەنگی ناوبراو شیروانشاکانی بە چوار زنجیرە داناوە، کونترینیان زنجیرەی تەبار و ئێلی (سامان)یان بوون و فەرمانبەردار و گوێرایەلی باشی ساسانیەکان بوون، دوای ئیسلام (یزیدی کوری فریدی شەیبانی) دووجار فەرمانرەوای (شیروان) بووە، دووجار سالی ١٨٢ ه.ق دابوو، دوای ئەو بنەمالەکەی فەرمانرەوایی ئەو ناوچەیەیان کردووە بە تێپەربوونی کات و بەهۆی دوری لە نەتەوەی عەرەب و بەهۆی تێکەل بوونی لەرێی ژن و ژنخوازیەوە لەگەل خەلکی ناوچەکە تێکەل بوون و بوون بە هۆزێکی ئێرانی. ئەوان وایان رادەگەیانند کە بۆسەر (بەهرامی گور) دەچنەوە و لەگەل ئاداب و کلتور و فەرهەنگی ئێرانیدا راهاتن، بە ئاشکرا محمد کوری یزید کە دایکی لە ئەشرافی ناوچەکەبوو، خۆی بۆسەر ساسانیەکان دەبردەوە. یزید کوری احمد (٣٨١– ٤١٨ ه.ق) منالەکانی بەناوی ئێرانی وەکو قوباد، مەنوچەر، سالاری ناو دەنان[48]. سالی ٤٢٥ مەنوچەری کوری یزیدی ناوبراو بە دەسیسەی ژنەکەی خۆی کە کچی (فضل شدادی) بوو بەدەستی براکەی خۆی کوژرا و ئەو برایەی لەسەر تەختی شایەتی دانیشت و براژنەکەشی مارەکردەوە. شایەنی باسە ئەم شەدادیانە سەرۆکی هۆزەکوردەکان و ئەشرافی ناوچەکەبوون و سەردەمانێکیش فەرمانرەواییان دەکرد.[49]

---

٤٦- لغت نامه دهخدار، زیرواژه یزیدیه

٤٧- فرهنگ مصاحب ل١٤٦٩

٤٨- فرهنگ مصاحب ل١٤٦٩

٤٩- فرهنگ مصاحب ل١٤٦٩.

دەربارەی پەیوەندی ئیزدیەکان و شیروانشاکان لە لاپـەرەکانی دواتـردا روونکردنـەوە دەدەین.

ئێستا با بزانین ئێزیدیەکان خۆیان دەربارە ناوی خۆیان چیدەلێن؟ بەداخەوە زۆربەی لێکۆلەران لـەوە بـێ ئاگـابوون یـان بەئەنقەسـت ئاماژەیـان بـەوە نـەداوە، کەئێزدیـەکان لەزمانی رۆژانەی خۆیاندا کەزمانی کوردییە، خۆیـان بـە (ئێـزدی–Ezdi) ناودەبـەن لـەو پەرتووکانەی لەم دووابیانەدا خۆیان دەربارەی خۆیان بلاویانکردۆتەوە هەمان دەربرینـی (ئێزدیان) بەکارهێناوە، هەتا برا کوردە موسڵمانەکانیشیان لـە کۆن و لـە ئێستاشـدا بـە ئێزدی ناویان هێناون، هەر لە دێرزەمانیشەوە خۆیان بە ئێـزدی نـاوبردووە، ئـەم سـەبقە ش بۆ بەلگە دەهێنینەوە:

| | |
|---|---|
| سولتان ئێزی ب خۆپادشایە | سوڵتان ئێزی خۆی پاشایە |
| هەزار و ئێك ناڤ ل خۆدانایە | هەزار و یەك ناوی لە خۆی نایە |
| ناڤێ مەزن هەر خودایە | ناوی مەزن هەر خودایە |
| سوڵتان ئێزی دزانە ل بەحرا چەند کەشکول ئاڤە | سولتان ئێزی دەزانێ چەند کەشکول ئاو لە دەریایە |
| ئەڤ دنیایە لباوی سەعەت و گاڤە[50] | ئەم دنیایە لای ئەو یەك سەعات و یەك تاوە |
| ئەوی هەوا کرە بوك، ئادەم کرە زاڤە | ئەوی هەوای کردە بوك و ئادەم زاوە |

ووشەی ئێزیدی کە ئێزدیـەکان خۆیـان وا ناودەبـەن، لەوانەیـە لـە(ئێزی=ئێزد)ەوە هاتبێـت. (خـدری سـلێمان) لێکۆلـەرێکی ئێزدیـە لـە راپۆرتێکیـدا لـە رۆژنامـەی (العمـل الاسلامی) دا نوسیوەتی: ناوی دروستی ئـەم کۆمەلـە (ئێـزدی)ە نـەك (یەزیـدی)ە و لـەو بروایەدایە کە (ئیزەد لە ئەزدا) = منی دا یان ئافریندەی من، ووشەی خودا (خۆی دای)[51] . ئەمە لێکدراوێکی هەرەمیانەیە و خودا پەیوەندیەکی بە (خۆی دای)ەوە نیە.

بەپێی ئەو تێبینیانەی رونکرانەوە ناکرێت ئێزیدیەکان بۆ سەر (یزیدی کوری معاویـە) بەرینەوە، چونکە:

---

٥٠- فەرهەنگی خالّ (ووشەی گاڤ).

٥١- العمل الاسلامی، السنه العاشره، العدد ٤٠٧١ شبات ١٩٩٢م.

١- لەهیچ یەك لە نوسراوە مێژوویەكاندا بەتایبەتیش لە (الملل و النحل) دا نەهاتووە یزیدی كوری معاویە، ئاینێكی نویێ داهێنابێت، (یزید) لە دەوڵەتداریشدا هیچ گۆرانكاری و داهێنانی نەكردووە هەرچی كرابێت باوكی كردویەتی و هیچ لە رێگەی باوكی لاینەداوە.

٢- لەبەرئەوەی شێخ عدی كوری مسافری ئەمەوی لە "بیت الفار"ی شامەوە بۆ چیای "لالش"ی هەكاری باكوری موصل هاتووە، ئەمە وایكردووە نوسەرانی وەكو سەمعانی والێبكات ئێزیدیەكان بۆسەر یزیدی كوری معاویە بەرنەوە، لە كاتێكدا نوسەرانی پێش (بغدادی ٤٢٩ كۆچی) هەتا "شەهرستان"یش كە هاوسەردەمی ئەوبوو لەبارەی ئەو ئێزیدیانەوە هیچیان نەوتووە.

٣- پێش هاتنی "شیخ عدی" بۆ ناو ئێزیدیەكان، ئاینی ئێزدی هەر لەناو كوردانی شیروانی و ئازەربایجان دا هەبووە. بەپێی ئەوەی كەشەرفخانی بەدلیسی دەربارەی هۆزەكانی دنبەلی-مەحمودی، پسیان لە شەرەفنامەدا[٥٢] باسی دەكات هەتا سەردەمی سەفەویەكانیش زۆربەیان ئێزیدی بوون. بۆ نمونە سالی ٣٠٦ كۆچی ابو طاهر شروان شاهی شاری (یزیدیە)ی لە نزیك شماخی دروست كردووە[٥٣] لە "لغت نامە دهخدا"شدا هاتووە ئیزیدیەكان لە گوندەكانی "رهال"ی شارۆچكەی هۆمەی شاری "خۆی" بوون، شایەنی باسە یەكێك گوندە گەورە (ئێزدی)نشینەكانی شەنگال[٥٤] یش "رەهال"ی ناوە .

٤- ئایا ئەگەر ئەوان بۆسەر (یزیدی معاویە) بچونایەتەوە، نوسەرێكی وەكو شەرەفخان كە هاوزەمانی ئەوان بووە و فەرمانرەوای ناوچەیەكی دەكرد كە ئێزیدیەكانیش سەر بەویێ بوون و چەندجار بەكینەوە باسیشی كردوون، بۆ ئەوانی بۆ سەر "یزید" نەبردۆتەوە، تەنها ووتویەتی موریدی "شیخ عدی"ن و خۆیان بەوەوە دەبەستنەوە.

٥- درەوشانەوەی ناودارانی وەكو حەلاج و شمس تەبریزی و .... لەریزی مەزنانی ئەواندا و پەیوەندی بەتینی ئیزیدیەكان بەوانەوە، پەیوەندی ئەمان بە "یزید"وە بیێ بنەما دەكات.

---

٥٢- شرفنامە، ل٢٦

٥٣- ر.ن، فرأی، تاریخ ایران، وەرگێرانی حسن انوشە ب٤ ، ل٢١٣

٥٤- یەكێك لە شارەكانی پارێزگای (نەینەوای عێراق)ە زۆربەی دانیشتوانی ئێزدیین

- بۆ نموونه دووبەند لەو وێردی تایبەتی "حسین حەلاج" دەهێنینەوە:

| | |
|---|---|
| حســـــــین حەلاج | حســـــــین حەلاج |
| ئەوی ڤەخوار بوو کاسا سیەو میلاتیە، | ئەو خواردی کاسی رەش و ئاوێتـــە، |
| حسێن سەرێ خۆ دکرە ئارمـــــانجە، | حسێن سەری خۆی دەکردە ئامانجە، |
| ل هۆرمـــــێ حـــزن و شـــینە، | لە هـــورمێ غــــەم و شــــینە، |
| ل بەغدایـــێ شـــاییە و مزگـــینە، | لە بەغــــدا شـــاییە و مـــزگینە، |
| کوشتبو حسێنێ مسکینە[55] | کوشتبوویان حسێنێ هەژار |

-ئەمەش دوو بەند لەبارەی شمس تەبریزی یەوە:

| | |
|---|---|
| چێ بازیـــەکی بــهنرە، | چـــــبازەکی بە هونــەرە |
| فری چۆ عەرشێد سەری | فری چووە عەرشێ ســەرێ |
| من نە زانی سۆرا(شێشمسێ تەتەرە) | نەمزانی وێنەی شێخ شەمسێ تەتەرە |
| مســـــــتم ژ دیـــــــوانــــێ | مەســــــتم لـــــە دیـــــــوانێ |
| دێ ب شێشـــــم دەیـــن بەیـــانێ | دەربارەی شێخ شەمس دەدەین بەیانێ |
| یا شێشم تە ئەم ئینانە سەر ئەرکانێ[56] | یا شێشم تۆ ئێمەت هێنایە سەر ئەرکانێ |

٦- خۆیـان شەروانشـاییەکان جارێك بـە یزیـدی کـوری معاویـە ئەبەسـترانەوە، ئـەم بابەتە ئەگەرچی لەو تێکچوونی دەربرین زیاتر نیە رەنگە لایەنی بیروباوەریشی تێدا بێـت (خاقانی) دەربارەی یەکێك لە شاکانی ئەم خانەدانە وای ووتووە:

| | |
|---|---|
| ای ظلم تو مخرب ملك یزیدیان | ئەی تەلەم تۆی تێکدەری مولکی یەزیدیان |
| لافی از علی مزن کە یزید تۆئی | لافی عەلی لێمەدە کە یەزیدی دووەم تۆی |

٥٥- ئێزدیاتی، ل١٣٦

٥٦- ئێزدیاتی، ل١٢٧و ١٢٩

کاتێ کە شا اسماعیل سەفەوی بەسەر شەروانشاییەکاندا سەرکەوت، بە سوپاکەی خۆی ووت: ((لەبەرئەوەی خەلکی شەروان دوژمنی خانەدانی پەیامبەرن، کەلوپەلەکانیشیان گلاوە دەبێت هەرچیان هەیە تالان کرێت و لە ئاوی رووباری بهاون))[57] ناوبراو نەك تەنها شاروانشاکانی بە دوژمنی بنەماڵەی پێغەمبەر دەزانی بەلکو گشت ناوچەی (شەروان)یش بە دوژمن دەزانی. پوختەی ووتە ئەوەیە کە بنەماڵەی شەروانشا عەرەب نەژادەکان کەوتنە ژێر کاریگەری بیروباوەر و کلتورو نەریتی ناوچەی (شەروان)ەوە، ئیتر نەژادی عەرەبی خۆیان فەرامۆش کرد، ناوە عەرەبییەکانی خۆیان وەکو محمد، خالد، یزید و علی یان بە قوباد، منوچهر، سالار و فریدون گۆری، ئەوان بەزمانی خەلکی ناوچەکە بە(الله)، ئێزەدیان ووتوە هەمان شێوەی ساسانیەکان، بوون بە ئەهلی دین و سیاسەت، خاقانی چەند بە باشی ئەمەی لەو دێرانەی خوارەوەدا گونجاندووە:

**گردو شود قبلەمان نی عجبی پس از انك — او بە شماخی نهاد کعبە دیگر بنا**

**گەر قبلەمان بێ بەدوو سەیر نابێت — چونکە ئەو لەشماخی، کەعبەیەکی کەی دانا**

**شهر سیاست خطە دربندرا أحتشام بیت — المقدس است شماخی را أقتدار**[58]

**شاری سیاسەتە پلانی لە خۆ گرتووە— پیرۆزە شماخی رێزی لێبگرن**

ئاشکرایە لە رووی سیاسیەوە زەمانە سازبوون و سودیان لە ناوی "یزیدی کوری مزید"ی باوانیان دەبینی کاتێك لاواز و بێتوانا بونایە و فەرمانرەوایانی بەغدا بەهێز بونایە، عەرەب نەژاد و یەزیدی بوون و کاتێ توانا و تینێکیان دەبوو، ئێرانی نەژاد و ئێزدی بوون، خاقانی لەمەسەلەی باوەردا بەم دوو بەیتە رای خۆی دەربریووە، ئەگینا "شماخی" بۆ بە "بغداد" و پایتەختە سیاسیەکانی دیکەی ئەو رۆژگارە بەراورد دەکرد؟

هەلبەتە خۆ گونجاندنی ئەم بنەمایە جێگەی سەر سورمان نیە، چونکە ئەم پیلانە لە کۆنەوە بۆ هێرشکردنە سەر ئێرانیەکان سەنتەری بیانوی بە هێزبووە و راپەرینی "بابەکی خورەم دین" لە سەردەمی عەباسیەکاندا باشترین بەلگەی ئەم بابەتەیە.

---

٥٧- لغت نامە دهخدار، ب٥، ل١٩١

٥٨- لغت نامە دهخدا ب٣١، ل٥٥٩

## مێژووکەی ئێزدیان:

هەرچەندە باوەر و کلتور و نەریتی ئێزدیەکان بۆ قوڵایی ناخی مێژوو دەگەڕێتەوە، بەلام ئێمە لەم بەشەدا تەنها باسی سەردەمی ئیسلامی ئەم ئاینە دەکەین، چونکە بەدووداچوونەکەی ئێمە لە ئەدەبیاتی ماوەدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوەی لەم ئەدەبیاتەدا لەبەردەستدایە، باسی حاڵی ئەو کەسایەتی و رووداوانە دەکات بەو

سەردەمەوە پەیوەستن هەروەها باسی ئەو کەسایەتیانە دەکات کە بۆ پەرەپێدانی باوەرەکانیان بۆ ناوچەی ئێزیدیەکان هاتوون.

## جعدی کوری درهم:

دوای کۆچی پەیامبەری موسڵمانان و خەلیفەکانی راشدین، چەند کەسێك پەیدابوون بەسوود وەرگرتن لە هەندێگ لە ئایات و گێرانەوە، باوەری تەواویان بە قەزاو قەدەر هەبوو، موسلمانانیان بۆ بەرگەگرتنی جەوری دەسەلاتداران و بە پاساوی قایل بوون بە قەزا و قەدەری خودا ملکەچ دەکرد.

فەرمانرەوایانی ئەمەوی لەم دیاردەیەی ئاینی ئیسلام سودێکی زۆریان دەسکەوت و بەپێی ئەوە فەرمانی خۆیان رادەگەیاند و زۆریشیان لە خەلکی دەکرد کە ملکەچی فەرمانەکانیان بن گوایە خواستی یەزدانی لەسەرە.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە موسلمانان بێزاربن و ئەمە بە پێچەوانەی یەکسانی خودایدا بزانن و ئەو ئایەت و گێراوانەی ئەمەویەکان پشتیان پێدەبەست بە جۆرێك لێکبدەنەوە کە لەگەل یەکسانی خودایدا بێتەوە و ئایەتی دیکەشیان هێنا کە لەگەل هەلبژاردە (اختیار)ی مرۆڤەکان و توانایاندا بێتەوە و لە ووتار و کردارەکانیاندا پشتیان پێبەست و راپەرینێکیان بە ناوی (قدریه)وە ئەنجامدا.[٥٩]

---

٥٩- محسن جهانگیری قدریان ، مجله معارف، دوره(٥)، ژماره١، ل٧ سالی ١٩٧٨

ابن الاثیر دەربارەی جعدی کوری درهم کە یەکێك لە پێشەوایانی "قدریە"بووە، دەڵێ: مەروان نازناوی (حمار و جعدی) هەبوو چونکە لە "جعدی کوری درهم"ەوە بابەتی دورستکراوی قورئان و ڕێبازی "قدریە" و ئەوانە فێربوو. دەڵێن "جعد" زەندیق بووە، میمون کوری مهران ئامۆژگاری کرد بەڵام نەك بە قسەی نەکرد پێی ووتبوو: من شاقوبادم لە ئاینەکەی تۆ زیاتر خۆش دەوێت، لەسەر ئەمە میمون لە دژی جعد شایەتی دا و لەسەرئەوە "عبد الملك کوری هشام" ئەوی زیندان کرد و بە "خالد قسری" سپارد و دواتر کوشتیان، لەسەر ئەوە خەلکی "مەروان"یان سەرزەنشت دەکرد.

١- محسن جهانگری قدریان ، مجله معارف، دوره(٥)، ژمارە١، ل٧ سالی ١٩٧٨
٢- ابن الأثیر، الکامل ب٥، ل ٤٢٩
٣-

محسن جهانگیری[٦٠] لە ڕاپۆرتێکی زانستیانەیدا کە باس لە (قدر)یانی یەکەم جار دەکات، دەلێت "جعدی کوری درهم" لە پێشەوایانی "قدریە"کانە و بەدروستی شوێنی لە دایکبوونی دیارنیە، هەندێك بە "خۆراسان"ی و هەندێك بە"حران"یان زانیووە[٦١]. وەك دەگێرنەوە "جعد" موالی بووە، بنەماڵەی مەروان ئازادیان کردوە، بەگێرانەوەیەکی دیکە (سویدی کوری غفلە ٨٢٩ کۆچی) ئازادی کردو، ناوبراو لە (دیمەشق) دانیشتوەو باسی دروستکراوی (قورئان)ی کردووە، کاتێك کە (مەروانی کوری محمد) دوا خەلیفەی ئەمەوی، لە (جزیرە) والی بوو، بۆ ئەوێ ڕۆشت و خەریکی فێرکردن و وانە پێدانی "مەروان" بوو. زانیاریەکانی "جعد" هێندە کاریان لە "مەروان" کرد، ناوبانگی بە "مەروانی جعدی" بلاوبوەوە. "جعد" لەشاری "جزیرە" بیروباوەرەکەی خۆی

٦٠- ر.ك . جهانگیری، محسن، قدریان نخستین، مجله معارف، دوره "٥" ژمارە ١ ساڵی ١٩٧٨

٦١- "حران" شارێکی دێرین و بەناوبانگی جزیرە بوە و لە ئورفە (٣٥)کیلۆمەتر دوورە، لە کەناری ڕوباری گولاو (جلاب) دایە، ئیمڕۆ گوندێکی وێرانەیە، مێژونوسانی ڕۆمی ئەم شارە بە (کارە) ناودەبەن. ر.ك فەرهەنگی معین.

بلاودەکردەوە خەڵکێکی زۆری لێ کۆبوەوە کە "هشام" بەم کارەی "جعدی" زانی ئەوی بۆ "کوفە" دورر خستەوە، کە "جهم بن صفوان" سەردانی کرد ئەویش سەرسام و گێرۆدەی بوو.

ابن الندیم لەبارەی کوشتنی "جعد"ەوە دەڵێ: زیندانیەکەی درێژەی کێشا، مناڵەکانی لە تەنگدەستی و درێژەی زیندانیکردنەکەیدا دووچاری گرفت بوون، داوای یارمەتیان لە خەلیفە هشام کرد، بەهۆی ئەوەوە هشام بۆی دەرکەوت "جعد" ماوە، نامەیەکی بۆ "خالد قسری" نووسی لەرۆژی جەژندا بیکوژێت، خالدیش فەرمانەکەی خەلیفەی لە جەژنی قورباندا ئەنجام دا. دەڵێن "جعد" لە تابعین بووە بەڵام بەهۆی زیرەکی و شارەزای زمانی خۆیەوە توانی بەپایەی مامۆستای خەلیفە و کوری خەلیفە بگات[٦٢].

لەبەر ئەوەی باوەری بە قەزاو قەدەر نەبوو قورئانیشی بە دەستکرد دەزانی و رۆژی هەستانەوەی رەت دەکردەوە و ملکەچ نەبوو بەپێی "قورئان" زەندیق بوو، هۆنەرێك سەبارەت بە "جعد" ئەمەی ووتووە:

**اتاك قوم برجال جرد    مخالفا بنصر دين الجعد**

**مكذباً بجحد يوم الوغد**[٦٣]

دەبێت ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین لەکاتی "مەروانی خەلیفەی ئەمەوی" دا زۆربەی دانیشتوانی جزیرە و سەنتەری ئەو شارە کورد بوون و کێوو دەشت و دەرەکانی جزیرە جێگەی هاتوچۆی کوردەکان و بەتایبەتیش هۆزی کوردی هەکاری بوون، کەلەسەرەتای سەدەی شەشەمەوە یەکێ لە نەوەکانی هەمان (مەروانی ئەمەوی) بەناوی "شیخ عدی کوری مسافر"[٦٤] لەناو ئەواندا لە "لالش" دانیشت و بووە بە یەکێك لە کەسایەتیە بەرجەستەکانی ئێزدیەکان.

---

٦٢- محسن جهانگیری، گۆڤاری معارف، سوری پێنجەم، ژمارە (١)، ل١٩-٢٠

٦٣- لسترنگ جغرافیای تأریخی سرزمینهای خلافت شرقی، ترجمه محمود عرفان. ل٩٥-٩٦

٦٤- الدلیل العراقی ساڵی ١٩٣٦، ل٧٤٩

**مەیمونی کوڕی دیسان:-**

یەکێکی دیکە لەو کەسایەتیە باوەڕدارو ئەدیبانەی بۆ وڵاتی کوردان هات، مەیمونی کوری دیسان بوو، عبدالقادری بغدادی ٤٢٩ کۆچی ئەڵێ مەیمون لە دامەزرێنەرانی (باطنیة)یەو بە(قداح) بەناوبانگ بووە، ناوبراو لە خزمەتگوزارانی (امام صادق) ١٤٨ کۆچی و خەڵکی (ئەهوان)بووە، کاتێك کەزیندان بووە لەگەڵ والی عێراق و چەند کەسێکی دیکە کۆبونەتەوە و ئاینزای "باطنیە"یان دامەزراندووە.[٦٥]

کەلە زیندان ئازادبووە لە ناوچەی "توز"[٦٦] دەستی بە بلاوکردنەوەی ڕێبازەکەی کردووە. کۆمەلێك لەکوردانی شاخ لەگەل خەڵکی "البدین" باوەرەکەیان وەرگرت، ئینجا مەیمون بەرەو رۆژئاوای ئەو ناوچەیە رۆشت و خۆی بە "عقیل کوری ابن طالب" دەناساند، کاتێك کۆمەڵێك لە رافضیية و هلولیەی پێوە نوسا، واخۆی نیشاندەدا لە نەوەکانی "محمد کوری اسماعیل کوری جعفر صادق"ە هەندێك لەو خەڵکە لەرووی ساویلکەییانەوەبە سەریاندا تێپەری[٦٧]. لە قسەکانی "بغدادی"ەوە وا دەردەکەوێت پەیرەوانی "مەیمون" پەرەیان بە رێبازەکەدا و دەبێت ئەوەش بلێین "بابەکی خورەم دین" لە ناوچەی "بەدین"[٦٨]، (ناوچەی بانگەوازەکەی مەیمونی کوری دیسان) راپەری، بابەك باوەری بە "مەزدەك" هەبوو، رێبازی باطنیة و باوەرەکانی "مەزدەك" یەکیان گرت[٦٩]. بەپێی قسەکانی "بغدادی" بابەك و مەیمون هاوزەمان بوون و گریمانەی نزیك بوونەوەی ئەم دوو باوەرە و ئاوێتە بوونیان بەهێز دەکات.

---

٦٥- بەو کەسانە دەوترێت کەمانای ناواخنی قورئان لە بەرچاو دەگرن، بۆ هەر فەرمانێکی دەرەکی ناواخنی دەهێننەوە

٦٦- شارێك بووە لە ناوچەی فارس لە نزیك روباری کارون ر.ك بەلام لەوانەیە لێرەدا مەبەستی لە ناوچەیەکی نێوان شارەکانی هەولێر و کەرکوکی عێراق بێت.

٦٧- بغدادی "عبدالقاهر" الفرق بین الفرق، محمد زاهد الکوثری (١٩٤٨) ل١٦٩

٦٨- لە (الکامل) ابن الاثیردا ئەو ناوچەیەی کە بابەك لەوێدا راپەری و ئەوێی کردبووە مڵبەندی راپەرینەکەی

٦٩- الفرق بین الفرق ل١٦٩

شایەنی باسە هێشتا یەکێك لە هۆزە ئیزدیەکان بە "داسنیّ" بەناوبانگە خودی شاری "دهۆك" سەنتەری بادینانی کوردستاتی عێراق بە "دهۆکا داسنیا" ناوی دەرکردووە، بەپێی ئەوەی ل (دلیل العراق) دا هاتووە، لە بنەرەتدا هەموو ئیزدیەکان بە "داسنای" ناوبراون. لەوانەیە ووشەی "داسنێ" لە دەربرینێکی هەرەمەکیانەی "دیسان-دیصان"ەوە هاتبێت.

## خوڕەم دینان و بابەکی خوڕەم دین:

خورەم دینان ناوی پەیڕەوانی ئەو ئاینەیە کە لە سەدەی دووەمی کۆچیدا لە ئێران سەریهەڵدا. لە هەندێك لە نوسراوەکاندا "خۆرەم دینان" بە کۆمەڵەی "باطنیة" دانراون[٧٠] ، وەك چۆن پێشتر باسمان کرد "مەیمونی کوری دیسان" بەدامەزرێنەری باطنیة دانراوە. خواجە نظام الملك نوسیویەتی: (( هەرکاتێك خورەم دینان راپەری بن "باطنیان" بەگیان و بەمال لەگەلیان دەبوون و پشتیان دەگرتن.))[٧١] . "خورەم دینان" لە پێش "بابەك"دا پەیرەوی "جاویدانی کوری شەهرەك یان سەهرەك یان سەهل"یان دەکرد، هەروەها دەڵێت: لە سەردەمی مهدی خەلیفەی عەباسی (١٦٢ کۆچی)، خورەم دنیان لەگەڵ "ئالاسورەکان" هاودەست بوون و نەوەیەکی " ابو مسلم خوراسانی" رابەرایەتی دەکردن و تاشاری "ڕەی" هاتن. درێژەی پێدەدا کە جارێکی دیکە "خورەم دینان" لە ناوچەی "سپاهان" شۆرشیان کردەوە و خەڵکی رەی و هەمەدان و دەشتی "بیە"یان پێوە لکا، ئیتر "هارون الرشید، عبدی کوری مالك"ی لە خوراسانەوە بۆ ناردن، خورەم دنیان ترسیان لێنیشت و بەرەو ناوچەکانی خۆیان گەرانەوە، ماوەیەك دوای ئەوە هەستانەوە[٧٢]، ساڵی ١٩٢ کۆچی بەهۆی هێرشی لەشکرەوە سەرکوت کران و زۆرێك لە ژن

---

٧٠- نفیس، بابك خرم دین، ل٢١

٧١- خواجە نظام ملك، سیاستنامە، ل٢٧٩

٧٢- سیاستنامە، ل٢٨٠

و مناڵەکانیان پێوەبوون[٧٣]، ساڵی ٢٠١ کۆچی "بابەك" پێشەوایەتی خورەم دینانی گرتە دەست[٧٤].

لەبارەی بن و بنەچەی "بابەك"ەوە ووتەی دژبەیەك زۆرن و زۆربەشیان ووتەی دوژمنەکانیەتی[٧٥] گومانی تێدا نیە هەرکاتێك یەکێك لە ئێرانەوە بەهۆی نایەکسانی کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە دەنگی بەرزکردبێتەوە زۆربەی مێژونوسان بەبێ دین و کفر و زەندیق تاوانباریان کردوە[٧٦]، بەلام "دینەوەری" زۆر بە ویژدانەوە باسی "بابەك"ی کردووە و دەڵێ: بابەك لە کورانی "مطهری کوری فاطمەی کچی ئەبومسلم خوراسانی"[٧٧] بوو، چۆن "بابەك" جێگەی "جاویدان"ی گرتەوە، ئەوە بۆ بەشی دووەم دادەنێین، ئێستا باسی جەنگەکانی بابەك و سوپای دەولەتی عەباسی دەکەین.

ساڵی ((٢٠٤))ی کۆچی "یەحیای کوری معاویە" یەکێك لە سەردارانی خەلیفەی "بغداد" لەگەل "بابەك" کەوتە شەرەوە، بەڵام هیچیان سەرکەوتونەبوون، ساڵی ٢٠٥ مأمون، عیسی کوری محمدی کوری خالدی راسپارد و ساڵی ٢٠٦ بابەك، "عیسی"ی تێکشکان، ساڵی ٢٠٧ عبدالله کوری طاهر بووە فەرمانرەوای "خۆراسان" سەرکردایەتی جەنگی "بابەك"یشی کرد، بەلام بەهۆی ئەوەی لە "دینەوەر" دواکەوت، ساڵی ٢١٢ مأمون محمد کوری حمید طوسی یان لە رێگەی "موصل"ەوە نارد، ساڵی ٢١٤ بابەك توانی محمد کوری حمید و کۆمەلێك لە لەشکرەکەی بکوژێت. ساڵی ٢١٧ خەلیفە مأمون فەرمانرەوای "جبال"ی بە "طاهر کوری ابراهیم" سپارد و جەنگی "بابەك"یشی لە ئەستۆی ئەونا. ساڵی ٢١٨ خەڵکێکی زۆری "جبال، هەمەدان، ئەصفەهان و....." ئاینی (خورەم)یان وەرگرت و لەهەمەدان لەشکرگەیان کردەوە.

---

٧٣- تاریخ طبری، ب٨، ل٥٥٦ و الکامل فی التأریخ ب٦، ل٣٢٨

٧٤- فشاهی، محمد رضا، تحولات فکری و اجتماعی در جامعه فئودالی ایران، ل٨٢

٧٥- بابك خرم دین دین،ل٤٢

٧٦- تحولات فکری ل٨٣

٧٧- تحولات فکری، ل٨٣

معتصم خەلیفەی عەباسی، "ئیسحاق کوری ابراهیم"ی بە لەشکرێکەوە بۆ ناردن، لە هەمەدان جەنگ دەستی پێکرد، گوایە شەست هەزار کەس لە خۆرەم دینان کوژراون و ئەوانی دیکەشیان بەرەو وەلاتی رۆم هەلاتوون، سالّی ٢١٩ ئیسحاق بە کۆمەلێکی زۆری دیلی خۆرەم دینانەوە روەو بەغداد گەرایەوە، جگە لە ژن و مندالّ سەد هەزار کەسیان لێکوشتن، ئەوانەی لە جەنگی "هەمەدان" دەربازیبوون هەمان سالّ پەنایان بۆ تئوفیل ئیمپراتۆری "قسطنتینیة" برد دوای ماوەیەك کە مەیدانی بابەك تەنگ بوو، نامەیەکی بۆ ئیمپراتۆری رۆم نارد و داوای هاوکاری لێکرد، ئەویش خۆی بۆ هاوکاریان ئامادەکرد، بەپێی ئەو پەیمانەی کەبە "بابەك"ی دابوو سالّی ٢٢٣ لەشکری بۆ سەر مەرزەکانی خەلیفەی ئیسلام هێناو کۆمەلێك سەربازی خەلیفەی کوشت و کۆمەلێکی زۆریش دیلی لێگرتن لەوانە پتر لە هەزار ژنیشیان تێدابوو، بەلام پەنادانی خۆرەم دینان و هاوکارر کردنیان بۆ "بابەك" و جەنگ کردنیان دژی خەلافەتی ئیسلام بە شکستی رۆمەکان شکایەوە و شاری "ئاموریە"[٧٨]ی لە دەستدا.

سالی ٢٢٠ کۆچی "معتصم" سەرداری ئێران "ئەفشین" (حیدری کوری کاوس)ی بۆ والی "جبال" دانا و ئەوی بۆ جەنگی "بابەك"رەوانەکرد. ئەفشین شاری "برزند"ی بە لەشکرگەی بنچینەیی خۆی دانا و هەمان سالّ رووبەرووبوونەوە دەستی پێکرد. چەند فەرماندەیەکی "بابەك" توانیان دەست بەسەر ئازوقەو کەلوپەلێکی زۆردا بگرن کەبۆ لەشکری ئەفشین دەهات. سالّی ٢٢١ چەند جار پێکدادان روویدا بەلام کاریگەری بۆسەر لەشکری بابەك نەبوو، ئەفشین لە دەوروبەری (مەراغە) توانی سەردارێکی بابەك کەناوی "تەرخان" بوو بکوژێت. سالّی ٢٢٢ (معتصم) هاوکاریەکی زۆری لەرێی "جعفری کوری دینار" بۆ سەر ئەفشین نارد.

هەمان سالّ رووبەروبونەوەی سەخت لە نێوان یەکێك لە سەردارانی پایەبەرزی بابەك و لەشکری "ئەفشین"دا رویدا، لەم جەنگەدا هەندێك لە ژن و مندالانی ئەم سەرکردەیەی

---

٧٨- ئاموریە: شارێکی دێرینی بەناوبانگە لە نیوە دورگەی ئەناضولی

بابەك بەدیل گیران. هەروەها توانیان شاری "بەز"ی بارەگای سەرەکی "بابەك"یش داگیربکەن، بابەك لەگەڵ کور و دایك و خێزانی و چەند کەسێك لە پیاوەکانی هەڵاتن، بەلام دواتر بە فێڵی ئەفشین و "سەهل کوری سنباط"ی خەلکی ئەرمەنستان توانیان بابەك دەستگیربکەن. شایەنی باسە کاتێك "بابەك"یان بە زنجیرکراوی بۆ ئەفشین هێنا، خەلکی ناوچەکە لە هەردوو بەری رێگەکە بە غەمباری وەستابوون، کە چاویان بەبابەك کەوت گریان و شیوەنی خەلکەکە بەرزبوەوە لە داخاندا بەسەرو گویلاکی خۆیاندا دەکێشا، ئەفشین کەوتە جنێودان و هۆکارەکەی پرسی، خەڵکەکە وتیان: ئەو پیاوەکاری باشی بۆ ئێمە کردووە. ساڵی ٢٢٣کۆچی، ئەفشین، بابەك و براکەی بۆ "سامەرا" بۆلای "معتصم" برد، ئەویش فەرمانیدا هەرچوار پەلی ببرنەوە و لە ملیشی بدەن سکیشی بدرن، فەرمانەکەیان بەجێهێنا.[٧٩]

بەلگەیەکی زۆری خۆرەم دنیان لە قەولی ئێزدیەکاندا دەبینرێن وەك:

١- لەیەکچوونی باوەری خۆرەم دینان لەگەڵ باوەری ئێزدیان.(لەبەشی دووەمدا باسی دەکەین)

٢- رۆشتنی مەیمونی کوری دیسان بۆ چیای "بەدین" شوێنی خۆرەم دینان و بڵاوبوونەوەی باوەرەکەی لەلای ئەوان و هەمانشێوە ئەم رابەرە کەسایەتیەکی بەرجەستەی بیروباوەری ئێزدیانیشە.

٣- ووشەی "مەحمەر" کە هاورەگە لەگەل " مەحمەر"ی خۆرەم دینان[٨٠] دا لە نوسراوە ئێزدیەکاندا زۆر بەرچاو دەکەوێت، بۆنموونە لەم دوو بەندەی خوارەوەدا هاتووە:-

| | |
|---|---|
| مـــەحمەر بن فەرعــینیس | مەحــمەری کــوری فەرعینیس |
| شەرابێ کۆنێ مەرەس برەس[٨١] | شەرابی کۆنی مەرەس[٨٢] برەس (بگەیەنە) |

---

٧٩- تأريخ طبری ب٨، ل٥٧٦-٥٨-٦١٩ و ٦٢٢، ب٩، ل١١-٢٨،١٦-٣٠ و ٥٠، الكامل في التاريخ ب٦، ل٣٥٨، ٣٦٢، ٣٧٩ و ٤١٢

٨٠- نفيس، سعيد بابك خرم دين ل٣٠

٤- سەنتەری مەزنی خورەم دینان لە زەمانی "بابەك"دا شاری "ئاران"ی کۆماری ئازربایجانی ئێستاو "دینەوەر"[٨٣] بووە کەلەوسەردەمەدا بەشێکی خەڵکی ئەو ناوچانە کورد بوون. لەو سەردەمەدا ئاران ناوچەیەکی دەگرتەوە کە دەکەوتە باشوری رۆژهەلاتی شاری "دەربەند"ەوە، دواتر بۆ "ئاران" و "شیروانە" دابەش بوو، گەلی "ئالانی" تێدا نیشتەجێ بوون، ئەم "ئالانی"یانە ئاری نەژاد و کورد بوون، بەلگەی بەهێز بۆ ئەم ووتانە زۆرن لەوانە: بوونی پاشماوەی دەرپەرێنراوانی ئەم گەلە لەشێوەی ئێل و هۆزی گەورە و بەهەمان ناوی "ئالانی" لەلای شاری "وان" لە باشوری رۆژهەلاتی تورکیای ئێستا نیشتەجێن. شایەنی باسە یەکێك لە یەکەم داستانە کوردیەکان "مەمی ئالانی" بەناوی کەسێکی ئەم گەلەوەیە.

رۆژەلسکۆی فەرەنسی رۆژهەلاتناسی سەردەم ئەو داستانەی لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە. بێگومان بێش ئەویش هۆنەری ناوداری کورد "شیخ احمدی خانی" ئەم داستانەی لە شێوەی "لەیل و مجنون"ی "نیزامی گەنجەوی"دا هۆنیوەتەوە، لە رۆژنامەی "العراق"یشدا هاتووە کە "ئالان" ناوێکی کوردانەیە و ناوی ناوچەیەکی فراوان و ناوی هۆزێکی گەورەی کوردانیشە"[٨٤] هەر ئەم ئالانیانە=ئارانیانە" بوون کە زنجیرەی شەروانشاکانی هۆزە عەرەبەکانیان ناچارکرد نەژادی عەرەبی خۆیان واز لێبهێنن و خۆیان بۆسەر شاکانی "ساسان" بەرنەوە[٨٥] ئایا راپەرینی خورەم دینان لەم مەسەلەیەدا پەیوەندی نەبووە؟ سعید نەفیسی لەو بروایەدایە ئاینی خورەم دینان پاشماوەی ئاینی مەزدەکی سەردەمی ساسانیەکانبێت.[٨٦]

---

٨١- نفیس، سعید بابك خرم دین ل٣٠

٨٢- نفیس بابك خرم دین ل٣٥

٨٣- حقیقت، عبدالرفیع نهضتهای فکری ایرانیان ل٣٢٥

٨٤- جریدة العراق- الصفحة الثقافیة، عبدالحمید باشا ١٩٨٨/١٢/٨

٨٥- ر.ك بخش و جه تسمیه ایزیدیه

٨٦- نفیسی، بابك خرم دین

**حەللاج:**

ئیزدیەکان هەمان شێوەی پێشەواکانی دیکەیان "حەللاج"یش بە یەکێك لە پێشەواکانی خۆیان دەزانن و لە گەلی لالش کە لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیەوە هەتا ئێستا مەلبەندی پر بایەخی ئیزدیانە نیشانەی[٨٧](٥) هەیە و دەربارەی ئەو "قەول" ێکیان رێکخستووە بەلآم جارێ با پێش قەولەکە ژیاننامەکەی بزانین:

وەکو باس دەکرێت خەلکی "بەیزایی فارس"[٨٨]ە و هەندێکیش دەلێن خەلکی (ئورمێ)[٨٩]یە، بە ووتەی سمعانی باوانی حەللاج ناوی "مەحما" بووە و دەلێ مەحما (محمی) مەگوسی "زەردەشتی"[٩٠] بووە بۆ بیرهێنانەوەش ئێزدیەکان محمد بە (محمی) دەردەبرن، زەرین کوب لەوباوەرەدایە نەیارانی بە ئانقەست ئەوەیان بۆ دروست کردووە، لە سەر زاری (عبدالله کوری خفیف)ەوە داستانی ناوبراوی بە هۆی ئەوەی کە زمانی حەللاج فارسی نەبووە گێراوەتەوە و درێژەی پێدەدات کە لە (بەیزای فارس) لە دایك بووە بەلآم هەر لە مندالّییەوە لەوێ دەرچووە، لە سەفەرە زۆرەکانیدا جار جار رێی تێیکەوتۆتەوە و پێدا تێپەریوە، "سمعانی" یش "بەیزا"ی بەزادگاو (راستەر= شوشتەر)ی بە جێگەی گەشە و دەرکەوتنی زانیووە، زۆربەی گێرانەوەکان لەوەدا یەکانگیرن کە جارێك لە کاتی خۆحەشارداندا خۆی بە (محمد کوری احمد الفارسي) ناساندووە. زۆریش لەوە دەچێت کە لە ناو ئیزدیەکاندا ژیابێت، ئەوان بە (مەحما) ناوی دەبەن جامی ئەوی بە نازناوی "أبو المغیث" ناوهێناوە[٩١]. زەرین کوب نازناوی بە ناوبانگی ئەوی بە "أبو عبدالله" زانیووە و دەلێت ئەویان بە "مغیث، أبو عمار ، أبو

---

٨٧- ئێزدیاتی، ل١٤٤

٨٨- سرودێك کە دەربارەی کەسایەتیە ئێزدیەکان بە زمانی کوردی بوترێت "قەول"ی پێدەلێن بەلام ئەگەر بەزمانی کوردی نەبێت (قصیده)ی پێدەلێن.

٨٩- زرین کوب حستنجو و تصوف ایران ل١٣١

٩٠- ئیزیدیاتی، ل١٣٥

٩١- سمعانی ابو سعید، الانسان، ل٣١٤ ٩- حاجی، عبدالرسن، نخاء الانس ل١٥٠

سعود" یش بانگ کردووه. هەروەها دەڵێت لەوانەیە دۆستانی "حسێن کوری منصور" نازناوی "حەللاج" بە واتای هەڵماڵەر دەرخەری نهێنی نەك بە مانای هەللاجی لۆکە ناویان لێنابێت. بەلاّم کەراماتیش دەخەنە پاڵی و ئاماژە بۆ شیکردنەوەی لۆکەش دەکەن.

لەبارەی کەرامات و هەلاجیەوە جامی دەلێت: "رۆژێك حەلاج لە دووکانی هەلاجێکی دۆستی دەبێت کابرای هەلاجی بۆ کارێك ناردووە، حەلاج لەبەرخۆیەوە دەڵێت رۆژەکەیم ئاواکرد، کە ئاماژە بۆ لۆکە دانراوەکە دەکات، لۆکە لەلایەك و ناوکی پەموو لەلایەك جیاوە دەبنەوە، لەوەوە حەلاج یان ناوناوە"[92] ، بەلام بەپێی ووتەی "زرین کوب" باوکی حەلاج لە شاری (واسط) خەریکی هەلاجی بووە و وا پێدەچێت لە باوکیەوە فێربووبێت و ماوەیەك هەلاجی کردبێت.

لە نزیکەی شانزە سالیەوە لە شوشتەر لەگەل سهل کوری عبدالله تستری پەیوەندی بەستووە بەپێی قسەی "عطار" دووساڵ هاودەمی بووە[93]، بە قسەی "زرین کوب"یش دوای ئەوە رێگەی عیرفان و زانستی گرتۆتە بەر.

لە هەژدەسالیدا بەرەو موصل رۆشت، پەیوەندی بە "عمر و کوری عثمان الملکی"وە کرد و ماوەی هەژدە مانگ لەلای مایەوە[94]. زرین کوب وایداناوە کاریگەری سهل تستری و عمر و عثمان الملکی زۆرتر بریتیبوون لە ناشناکردنی حەلاج بە دنیاکانی زوهد و تەریقەتی ئەهلی حەدیث، کاتێ کە لە خزمەت "عمر و کوری عثمان الملکی"دا بوو "یعقوب اقطع" کچەکەی خۆی پێبەخشی[95] "عمرو" بەم کارە رەنجا و نێوانی لەگەل "یعقوب"ی خەزوری "حەلاج" تێك چوو[96]، حەلاج ناچار رۆشت بۆ "بغداد" و بە حەلقەی

---

٩٢- جامی، عبدالرحمن، نغمات الانس. بە کوشش مهدی توحیدی بوو ل١٥٠

٩٣- عطار ، فرید الدین محمد، تذکرة الاولیاء بەکوشش نیکلسون ب١، ل١٣٦

٩٤- هەمان سەرچاوە

٩٥- هەمان سەرچاوە

٩٦- سمعانی، الانساب، ل٢١٦

موریدانی "جنید"ەوە ئاوێتەوە بوو. "زرین کوب" دەڵێت: بەهۆی "جنید"ەوە تێکەڵی تەریقەتی سۆفیەتی بوو، بەرگی سۆفیەتی پۆشی و تەنهای گرتەبەر، بەهۆی سۆفیەکانی هاورێیەوە کۆمەڵێکی سۆفی دیکەشی ناسی.

ابو الحسن نوری، ابن عطا ادمی و شبلی هەندێك لەوانەبوون،نزیکەی بیست سال لە گەڵیان مایەوە، لە "٢٨٢ کۆچی"[٩٧] بۆ "مەکە" چوو، ساڵێك لەوێ بەگۆشەگیری مایەوە، دوای گەرانەوەی بەکۆری یارانی "جنید"ەوە ئالایەوە، دوای ساڵێك خۆی لە "جنید" و یارانی دابری و بەغدایبە جێهشت و بەرەو "شوشتەر" رۆشت[٩٨].

"زرین کوب" هۆکاری دابرانی حەلاج و سۆفیەکانی بەغداد بەو جیاوازیە سەختەی نێوانیان دەزانێت کە لەبواری صحو[٩٩] و سکر[١٠٠] یان لەوەدا کە "انا الحق"ی دەگوت، دەزانیت . نوسەری کتێبی ((ئیزدیاتی)) (ئاینی ئێزیدی) کە خۆی ئیزدیە لەبارەی ئەم بابەتی نیوان حەلاج و جنید نوسیویەتی:(حەلاج وتی: بۆچی چەند کەسێکی دیاریکراو بەبێ رەنج و ماندوبوون سەرمایەیەکی زۆریان هەیە و کەسانێکیش شەو و رۆژ لە رەنج و ماندوبوندان وشتێکیشیان نیە؟! جنید لە وەڵامدا ووتی:

ئیتر خوداوەند بەم جۆرە بەشی کردووە. حەلاج ووتی: جا بۆچی خوداوەند لەمە باشتر دابەشی ناکات؟.. ئاخ خۆزگە تەنها رۆژێك فەرمانی بەمن دەدا، خۆم دەمزانی چیم دەکرد، هەموو خەڵکیم رازی دەکرد.))[١٠١]

---

٩٧- جستجو در تصوف، ایران، ل١٣٥

٩٨- سمعانی، الانسابل٣١٦

٩٩- صحو: هۆشیاری لە زاراوەی سۆفیەتیدا بریتیە لە هەست کردن لە دوای غەیبە ر.ك فرهنگ لغات اصطلاحا و تعبیراً عرفانی

١٠٠- مەستی: لە زاراوەی سوفیەتیدا بریتیە لە وازهێنان لە پەیوەستی ظاهری و باطنی وروو لە حەق کردن اصطلاحا و تعبیراً عرفانی

١٠١- خدری سلێمان، ئێزدیاتی، ل١٣٣-١٣٤

بەپێی قسەی "زرین کوب" سۆفیەکانی بەغداد لەپێش شەریعەت زانانەوە قسەی "حەلاج"یان بە نارەوا و ناجۆر لە قەڵەم دا بەلام خۆبە دوورگرتنی سۆفیەکان نەبوە هۆی ئەوەی سزابدرێت چونکە "شێخانی بەغداد" لە ترسی کاردانەوەی سزادانیان نەباپاڵبدات بە ئاینزای شیعەوە چونکە لەو سەردەمەدا لە "بەغداد" مایەی دەردی سەربوون، وازیان لیّ هێنا.

حەلاج دوو ساڵ لە " شوشتر" مایەوە، بەپێی ووتەی "سمعانی" لەویّ خەلکێکی زۆری لێیکۆبوەوە، گومانی تێدانیە خەلکانێکیش ئەمەیان پیّ خۆش نەبوو، یەکێك لەوانە هاوکارەکەی پێشوی خۆی عمر و کوری عـثمانی مکی بوو کە بە نامە ناردن راپۆرتی لێدەدا.[102]

ناچار ئەویشی بەجێیهشت و بۆ خوراسان و ماوراء النهر، سجستان و کرمان و دواتر بۆ فارس رۆشت[103]، ئەم سەفەرانەی پێنج ساڵی خایاند، لە (٢٩١ کۆچی)دا جارێکی دیکە سەری لە (مەکە) دایەوە، لە گەرانەوەدا بۆ "بەغداد" هاتەوە، ساڵێك مایەوە،دیسان رێگەی گرتەبەر بە دەریادا بۆ هندستان لەوێوە بۆ چین و تورکستان رۆشت و بۆ سێیەم جار بۆ "مەککە" هاتەوە و دوو ساڵ مایەوە. ابن الاثیر دەربارەی سەفەری مەکەی کەوا پێدەچێت سەفەری سێیەمی بێت، دەڵێت: ئەو لەمەکە چووە شوێنێك بەناوی "حجر" ساڵێك مایەوە، زستان و هاوین لە چۆل دەمایەوە، بەو هەموو گرفتەشەوە بەرۆژوش دەبوو، کەشەو دەهات خزمەتچی ئەو شوێنە گۆزەلەیەك ئاو و کولێرەیەکی بۆ دەبرد، ئاوەکەی دەخواردەوە و سیّ گازی لە قەراغی کولێرەکە دەخوارد و ئەوەی دەمایەوە لەلایەکەوە دایدەنا دەیانبردەوە و هەتا شەوی داهاتوو بەرۆژو دەبوەوە.

ئەو سەردەمە"عبدالله مغربی" شێخی سۆفیانی مەکە بوو، لەگەل سۆفیەکانی بۆ سەردانی حەلاج دەچن، نایدۆزنەوە، پێیان ووت: بۆسەر شاخی ((ابو القیس)) رۆشتووە

١٠٢- سمعانی، الانساب، ب٣، ل٣١٦

١٠٣- هەمان سەرچاوە

که چوونەلای، بینیان بەسەری رووت و بە پێ خاوسی لەسەر تاتە بەردێك کەوتووە، ئارەق بە ئامباڵایدا دەچۆرێت، شێخ و سۆفیەکانی خۆیان ئاشکرا نەکردو گەرانەوە.

شێخ ووتی: خۆی بۆ بەرگەگرتن رادەهێنێت، دەیەوێت بەرامبەر "قەزای ئیلاهی" بەهێز بێت بەلام خوداوەند تووشی بەڵایەکیوایدەکات کەنە راهێنان و نەتوانای فریای نەکەوێت.[104] لە سالی ٢٩٦ دا بۆ بەغداد گەرایەوە[105] و دەستی بە راگەیاندن و بانگەوازی باوەرەکەی خۆی کرد.

کە سۆفیەکانی بەغداد بەبیر و باوەری "حەلاج"یان زانی، ئەویان بە فێلباز و جادوگەر تۆمەتبارکرد، بەلام تاوانبارکردنی بە بانگەوازی خودایەتی، حەلاج لەگەڵ ئەو راپۆرتانەی هەندێك لە (غلات شیعە) کە باوەریان بەبوونی (جزء الهي) لە کەسێکی خودی پێشەوادا (امام) هەیە[106]، نەك بووە هۆی توورەبوونی یاسادانەرانی ئەهلی سونە بەڵکو شیعەی ئیمامیەشی دژی ئەو جوولاند. "عباس اقبال" لە ووتەی "مصنفین امامیە"وە دەڵێت: کە حەلاج بانگەوازی کردووە و وتویەتی من نێراوی "ئیمامی غائب" و نوێنەری ئەو بەرێزەم ئەم داوایەی بوە هۆی ئەوەی سەرانی "ئیمامیەی قوم" خۆیانی لێبێبەری بکەن و لە "قوم" دەریپەرێنن.

"عباس اقبال" درێژەی پێدەدات، کە ئەم داوایەی حەلاج لە حوکمی راگەیاندنی دوژمنایەتی خانەدانی "نوبەختی"ەکاندابووە، چونکە ابو قاسم حسین روح نوبەختی لە ساڵی ٣٠٥ کۆچیەوە پایەی "بابیەتی"[107] ئیمامی غائبی لە ئەستۆبوو، لەوکاتەشدا یەکێکی دیکە لە "نوبەختی"ەکان بەناوی "ابو سهل علی" بە سەرۆکی ئیمامەی بغداد دادەنرا، لەنێو دەولەتمەدارانی ئەو سەردەمەدا خەڵکێکی زۆری هەبوو، ئەو کەسە زانایەکی مەزن و چالاك بوو، نەیدەتوانی لەبەرامبەر نوسراوە نوێکانی سۆفیەکدا بێدەنگ

١٠٤- ابن الاثیر، الکامل في التاریخ ب٥٨، ل١٢٦

١٠٥- جستبودر تصوف ایران ل١٣٥

١٠٦- جستبودر تصوف ایران ل١٤١

١٠٧- بابیەت: بابیت: نیابت: نوێنەرێتی

بێـت، لەبـەر ئـەوە بـۆ دەرکردنـی حـەلاج و دەرپەرانـدنی و نەهێشـتنی بانگەوازەکـەی ئەوپەری راوێژی خۆی کرد و هەوڵی خۆی دا. لەوانـە لەگـەڵ زانـا ئیمامیـەکان و زاناکـانی (مذهب ظاهري)[108] کە دامەزرێنەرەکەی (ابو بكر محمدى داودى اصفهانى) (٢٩٧ کۆچـی) بوو پەیوەندیان هەبوو تەنانەت لە لقەکانی باوەردا هاوڕابوون. چـــونکە (فقهـی امـامی) لە دیدی خەلیفەکانەوە بە فەرمی نەناسێنراوبوو لەبەرئەوە کە ساڵی ٢٩٦ی کۆچی حەلاج بـــــــۆ "بەغـداد" گەرایـەوە ابـو سـهل پەیوەنـدی بـە ابـو بکـر محمـد داودی ئیمـامی ظاهریانەوە کرد و ئەوی بۆ دەرکردنی ئەو فەتوایەی ساڵی ٢٩٧ کـە بـۆ کوشـتنی حـەلاج دەرکرا، دنەدا.

دۆستایەتی أبو سهل لەگەڵ "أبو الحسن علي کوری فرات" وەزیری بەتوانای عەباسی کە وەزارەتی یەکەمی ئەو لە ٢٩٦ تا ٢٩٩ کۆچی لەکاردابوو، لایەنگیری ئـەو لـە ئیمامیـە لە ئەنجامدانی کوشتنی حەلاجدا بێکاریگەر نەبوو.

ڕەنگە جیاوازی بیروباوەری زانایانی ئاینی دەربـارەی کارەکـانی حـەلاج[109] و نـەبوونی توانای تەواوی دژەکانی ئەو[110] و لایەنگیری هەنـدێك لـە دەسـتەلادارانی وەکـو قشـوری[111] پـەردەداری بـەتوانای خەلیفـەی عەباسـی، بابـەتی بـەدودا چـوون و کوشـتنی حـەلاجی دواخستبێت، بەلام خانەدانی "نوبەختی" و زۆربەی سەرانی ئیمامیە هەر لەسەر دژایەتی حەلاج سوربوون، سـاڵی "٢٨٩ کۆچـی" ژمارەیـەك لـە لایـەنگرانی حـەلاج لەسـەرئەوەی باوەریان بەووتەکانی هەبوو لێپرسینەوەیان لەگەڵ کردن.

حەلاج خۆشی لە "شوش" ڕایکرد، هەتا لە ناچاریدا بە تـەواوەتی ناسـنامەی خۆشـی ڕەت دەکردەوە، سەرئەنجام بەهۆی یەکێك لە موریدانی خۆیەوە کە لـە زینـدانـدا ببوویـە

---

١٠٨- ر.ك بە اقبال- خاندان نوبختی، ل١١٤-١١٦

١٠٩- سمعانی، الانساب، ل٣١٧

١١٠- جستجو در تصوف ايران، ل١٤٢

١١١- لە لاپەرەکانی داتردا دەربارەی قشوری پتر باس دەکەین

بەکرێگیراوی دەستەلاتداران و بۆ هاوکاری و دەستگیرکردنی "حەلاج"ی شێخی خۆی دەستی تێکەل کردبوو ناسرایەوە[١١٢].

"زرین کوب" نوسیوەتی: کاتێك حەلاج لەژێر پارێزگاری خەلیفەو دایکیدا بەند دەکرێت و رادەگیرێت "توقیف"، نصری قشوری دەکەوێتە ژێر کاریگەری حەلاجەوە، بەلام ئەم ووتەیە راست نایەتە بەرچاو چونکە ناوبراو لە هۆزی کوردانی "قشوری" ناوچەی "هەکاری"بووە کە زۆربەیان "ئێزیدی"ن ، ئەو کاتانەی حەلاج سەفەری دەکرد یان خۆی دەشاردەوە لەلای کوردانی هەکاری خۆی حەشاردەدا، گریمانەی ئەوە هەیە لەپێش راگرتنەکەشیدا کەمەندکێشی بووبێت.[١١٣]

پارێزگاری خەلیفە و دایکی و نصری قشوری بۆ حەلاج هیچ کاریگەرییێکی لە چارەسەری فەرمانی زانایانی ئاینیدا نەبوو چونکە لە رۆژانی راگرتنی "حەلاج"دا لە شاری کوردنشینی "دینەوەر" لێپرسینەوە لەگەڵ کابرایەکدا دەکرێت کە نامەی "حەلاج" پێبووە لە سەرووی نامەکەوە نوسراوە: لە (رحمن الرحيم)ەوە بۆ فلانی کوری فلان...[١١٤] ئەم نامەیە بووە هۆی پێداگری " حامد کوری عباس"ی وەزیری "عەباسی"، و دادگا بریاری کوشتنی "حەلاج"ی دەرکرد، چونکە حەلاج نکۆلی لە نامەکە نەکردبوو، ووتبووی وایە لای ئێمە بەشێوەی کۆ دەخوێندرێتەوە و ئاساییە[١١٥].

شایەنی باسە کوردانی دانیشتوی شاری "دینەوەر" و دەوروبەری ئێستاش باوەریان لەگەل ئیزدیەکان زۆر نزیکی هەیە، جگە لەوەی کە بەپێی ئەوەی لەنامەکەدا هاتبوو "حەلاج"یان بە خواوەندێتی تۆمەتبارکرد ئەویان بەکاری جادوگەریش کە (لەلایەن بوکەکەیەوە خرابووە پالی) بارگرانترکرد. سۆز و خۆشەویستی خوداوەند ئەوی بۆ ئەو ووتانە دەبرد و بەدگومانی خەلکیش ئەوی بەو دەردە برد چونکە دوژمنەکانی ووتەکانی

---

١١٢- جستجو در تصوف ایران ل١٤٣

١١٣- یەکێك لە تیرەکانی هەکاری ناویان "هەلاجی"ە، ر.ك محمد امین زکی کوردو کوردستان ل٣٤٨

١١٤- جستجو در تصوف ایران، ل١٤٥

١١٥- لەناوانی (توحید)ە ر.ك فرهنگ لغات و اصطلاحا و تعبیرا عرفانی

ئەویان بەجۆرێك لە زەندەقەوە دەبەستەوە و بۆ ووتەکانی "مانەوی" یان دەبردەوە کەبە پێی ئەوە هەست بەبوونی بەشێك لە خوداوەند "جزء الهي" لە مرۆڤدا دەکرێت و کێشی بەشەکانی رووناکی بۆ چەقی رووناکی دەکات لێکیان دەدایەوە[116]. حەلاج بە درێژایی دادگاکردنەکەی ئەو تۆمەتانەی ڕەتکردەوە و شایەتمانی دەهێنا، بەلام حامدی وەزیر لەسەر تاوانبارکردنی مکوڕبوو، بلام بەلگەو شایەتێکی وەهانەبوو کەزانایان پشتی پێببەستن و ئازایانە بریاری خۆیان بدەن. تاسەر ئەنجام بەلگەیەکیان دەسکەوت کە "حەلاج" بۆ یارانی خۆی نوسیووە: " هەرکەس دەیەوێت ئەرکی "حەج" بە جێبهێنێت و پارەی نیە دەتوانێت لە مالّی خۆیدا "محراب"ێك دانێ و ئادابی پێویستی خاوێنی و "احرام" پۆشین و "تەواف" ئەنجام بدات وەکو ئەوە وایە لە لای "کعبە" حەجی کردبێت."[117]

لە دادگادا ئەم ووتەیەی دایە پال "حسن نصری" و ووتی: لە پەراوی "الاخلاص"ی ئەودا هاتووە، (ابو عمر ٣٢٠ کۆچی) کە یەکێك لە دادوەرە گەورەکانی ئەو سەردەمەی "بغداد"بوو ئەم ووتەیەی "حەلاج"ی رەتکردەوەو بە کفرو زەندەقەی دانا. "حامدی کوری عباس" بەم بەلگانە دەستکراوەتربوو. دەلێن جگە لە بابەتی حەج کردن، لەباتی "رۆژو نوێژو زەکات"یش جێگرەوەی بۆدانابوون. بەهەرحالّ حامدی کوری عباس بەوەی کە حەلاج پەیوەندی لەگەلّ "قرامطة" هەبووە و داوای خواوەندێتی کردوە پشت ئەستووربوو دەستی کێشایە ناو دادگایکردنەوەکەوە، بەلام ئەوەی کە پتر دادوەرەکانی زالّ دەکرد بابەتی گۆرینی حەجکردنەکەبوو چونکە جگە لە لایەنی ئاینی بەلایەنی سیاسیشەوە بەستیانەوە....[118] پەیوەستی حەلاجیش بەم بابەتەوە لەلای حامدی وەزیر روونبووەوە.

---

١١٦- جستجو در تصوف ایران، ل١٤٧

١١٧- جستجو در تصوف ایران، ل١٤٧

١١٨- جستجو در تصوف ایران، ل١٤٩

ئـيتر دوا هـەولّی بـەرگری لـە حـەلاج کۆشـش و هـەولّی "نصـر قشـوری" و "سـیدە شغب"ی دایکی خەلیفە بوو بەڵام ئەوانیش هیچیان پێنەکرا و فـەرمانی کوشـتنی لـە ذی العقدەی ساڵی ۳۰۹ی کۆچـیدا دەرکـرا، دەڵـێن کاتێـك کـە حـەلاج بـۆ بەرقـەنارە دەبـەن بەهاوار و خرۆشەوە ئەم هۆنراوەی ووتوە:-

ندیمي غیر منسوب الی شيء من الحیف
سقاني مثل ما یشرب کفعل الضیف بالضیف
فلما دارت الکأس دعا بالنطع و السیف
کذا من یضرب الراح مع التنین بالصیف[119]

پەشیمانیەکەم هیچ بەداخەوە پەیوەست نابێت، هەر لەوەم خواردەوە کە هاوینان لـە میوانداریدا دەدرێت. هەر لەگەڵ جام سـوڕایەوە شمشـێر و ئـازاردەری خواسـت، ئەمەیـە سزای ئەو کەسەی کە بیەوێت لە هاویندا لەگەڵ ئەژدیهادا شەراب بنۆشێت.[120]

وا باشە لێرەدا "بەندێکی تایبەت بە حەلاج" کە وێردی سەر زمـانی قـەواڵانی ئیزدیـە بهێنینەوە:

ژ بادا نەی دینم — لە بادە دیوانە نیم
مەستا مەلو مێنن — مەستان لۆمە مەکەن
وەرن حاڵی حسێن ببینن — وەرن حاڵی حسێن ببینن
ژ باناوە فەربووە — لەبەر ئێوە تووش بووە
حسێن چو بێ رەجوە — حسێن چەند نا ئۆمێدە

---

۱۱۹- بۆ زانینی چۆنیەتی کوشتنی حەلاج دەتوانی سەیری تذکرة الاولیاء، عطار، بەهەولی نیکلسون، ل۱٤۳-۱٤٤

۱۲۰- جستجو در تصوف ایران، ل ۱۵۰

حسێن سەریێ خۆ دابوە
حسێن ل حسەینە
ئەوی ڤەخوار ژ کاسا بەینە
لەو سەریێ خۆ دابو فەر ل عەینە
حسێن ل حەلاجە.
ئەوی ڤەخواربو ژ کاسا سیەو میلانچە.
(لەو بو شرعا قازی یە) .
حسێنی سەری خۆ کرە ئارمانجە.
ئەی چاکو ژ چاکێد مەدا.
حسینو چاکیێ جەودا.
پادشیێ من کاسەك ب تەدا.
لەو حسێنی سەری خۆ ل
بەر ری و ئیعتقادا خۆدا!
حسین ل بەغدیدی.
ئەوی ڤەخوار بو ژ کاسا هێدی.
حسێن سەری خۆ کر فیدی.
حسین ل بەغدەلی،
له بەر ویێ سوریێ نە صەبری
(لەو بو شرعا قادیا).
حسین ب سەری خو بو مشتەری
حسین ل حەلاجە
ب رەڤا خوی رەهوانچە
لەو ڤێرا گەهشت بو نەعجە
وی ل میهی مسکین
هەی باز بو ژ هیلینی

حسێن سەری خۆی دا بە ئێوە
حسێن لە حسەینە
ئەو کاسێکی رۆشنی نوشیوە
سەری خۆی دا ناچار بووە (فرض العین)بوو
حسێن لە حەلاجە
ئەو کاسیك بادەی سیاو ئاوێتەی نوشی بوو
فەرمانی قازی لەوکرا
حسێن سەری خۆی کردە ئامانج
ئەو چاکی لە چاکانی ئێمەدا
حسێنو چاکی لەودا
پاشای من کاسێکی بە تۆدا
بۆیە حسێن سەری خۆی لە
بەر ڕێی باوەری خۆی دا
حسین لە بەغدایە
ئەوی لە سەرخۆ لە کاسەکەی خواردبوەوە
حسین سەری خۆی بەخشی
حسین ل بەغدایە
لەبەر ئەو وێنەیە ئارامی نەما
(لەو بو شەرعی قازیا)،
حسێن بۆ سەری خۆی بوە مشتەری (کڕیار)
(حسین)ی حەلاجە
بە ڕێی خۆیدا ڕەوانە (دەڕوات)
گەشتە ئەویێ بو بە مەڕ
وای لە مەڕی بێچارە
هەی بازی لە هێلانە

| | |
|---|---|
| ل خو مەگرە رەڤینی | لە خۆ مەگرە راکردن |
| ئەم ژ تەبایی تە هاتینە بەروی سکینی. | ئێمەش لە بەر تۆ هاتوینەتە بەر چەقۆ |
| میها سەر ژ بەرانە | مەری ئێمە ئەڵێی بەرانە |
| وا ل حسینی ددەت تەعنانە | وا لە حسین دەدات تانە |
| حسێنو رەڤین عەیبە بۆ مێرانە. | حسێنو راکردن بۆ میران عەیبە |
| کوشتنا مێرا نە عەجێبە | کوشتنی مێران نە سەیرە |
| حسێنۆ رەڤین عەیبە | حسێنو راکردن عەیبە |
| خاسمە سەری تەی ب حسێبە | نەخوازە سەری تۆ گرنگە |
| حسین ل ڤان مەعنیایی ب ڤارە | حسین لە وان مەعنایان دلتەنگە |
| ئەوی ل خۆ گرتبون بەر و دارە. | ئەوی خۆی گرتبوو لە ناو بەرد و دارە |
| ئەو هاوارەکە بریێ ئاخرەتیێ[121]را دهتارە. | ئەو هاوار لەئاخرەتی (کۆتایی) برای ئاخری دەکات |
| هاوارەکە بریێ ئاخرەتیێ را دەهشتە | هاوار دەکات برای ئاخرەتی دەهەستە |
| خەجیجا ژ خۆرستانی هاتو گەهشتە | خەجیجە لە خۆرستانەوە هاتو گەیشتە |
| ئەوی ژك حسێن ب تەعنا دکوشتە. | ئەوی کە حسێنی بە تانە دەکوشتە |
| خەجیجا ل خۆرستانە | خەجیجە لە خۆرستانە |
| ریێ یا سێ مەهانە | رێی سێ مانگانە |
| هاتبوە هەفت گاڤانە | بوە حەوت هەنگاوانە |
| حسێنۆ گیان تە چی گیانە | حسێن گیان تۆ چی گیانە |
| بچوك ل من برانە | بچوك لە من دەروانە |
| گیان بسپێرە خودیێ و دۆستێد عەزمانە | گیان بسپێرە خودا و دۆستی ئاسمانە |
| گیان بسپێرە برایە | گیان بسپێرە برایە |
| لانەکا من بە ساڤایە | ساوای من لە بێشکایە |
| نانا من لەسەر سێلی مایە | نانی من لە سەر ساجی مایە |

---

١٢١- هەموو کەسێکی ئێزدی خوشك و برایەکی ئاخرەوی (کۆتایی) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت ، ئەم خوشك و برایەی لە کاتی سەرەمەرگدا لە لای ئامادە دەبن، بۆ ئەوەی کفن و بەرێکردن و ناشتنی بۆ ئەنجام بدەن.

مێڤانێ من ژ پیرڤەی وەستایە
گیان بسپێرە دۆستێد خودایە
گیان بسپێرە و هەرە
مە مێڤانیك هەیە ژ سەفەرە
هەتا روح ژ قالبی تە بێتە دەرە
خوشکێ خەجێ بەلێ بەلێ
ب وێ رۆژێ کەم رۆژا ل عەنزەلێ
من کاسەك ڤەخوار ژ سەرێ کەلێ
کاسا کەرەمە و دا پی بچین بەلی
خەجی خوشکا خۆمە
من سەرێ دایە و بدەمە
دابزانن دنیا و عالەمە
یا مێرا سۆرە و کەرەمە
هەی حسینو برێ منێ ئاخرەتێ
هەرۆ کو رۆژ هلتێ ژ ملی ئومەتێ
هەفت کاسی قودرەتێ
تێنن بۆ من حورمەتێ
ئێکی روژەکی راستی ژ دلی من دەرنەتێ
هەرۆ کو رۆژ هلتی یە
هەفت کاسی قودرەتی یە
تین بۆ من حورمەتی یە
قەت راستی یەك ژ دەڤی من دەرتی یە
حسێن دسپارە
ل بەغدایی و چەندی شارە
حسێن مسکین دئازارە

میوانی من لە سەر پێ راوەستایە
گیان بسپێرە دۆستی خودایە
گیان بسپێرە و هەرە(برۆ)
میوانێکمان هەیە لە سەفەرە
هەتا گیان لە لەشی تۆ بێتە دەرێ
خوشکە خەجێ بەڵێ بەڵێ
بەو رۆژەی بێ رۆژا ئەزەلێ
کاسەیەکم خوارد لەسەر کوپەڵێ
کاسە بەخشینە دەبێ بچین بەڵێ
خەجێ خوشکی خۆمی
من سەرم دایە و دەیدەمی
بابزانن دنیا و عالەمی
یا مێری سورو کەرەمێ
هەی حسێنۆ برای کاتی مەرگێ
هەر وەکو رۆژ هەڵدێ لە ملی میلەتێ
حەوت کاسی قودرەتێ
بۆم دەهێنن حورمەتێ (ژنان)
هیچ رۆژێك راستی لە دڵی من وەرناچێ
هەر رۆژێك کە خۆر هەڵدێ
حەوت کاسەی قودرەتیە
دێن بۆ من حورمەتیە
قەت نهێنیەك لەدەمی من دەرناپەڕێ
حسێن دەسپێرێ
لە بەغدایێ و چەندی شارە
حسێن ی هەژار لە ئازارە

ل هورمێ حزن و شینه
ل بەغدایێ شاییە و مزگینه
کوشتبو حسینی مسکینه
ل بەغدایی و چەندی شاره

لە هورمێ غەم و شینه
لە بەغدایێ شاییە و مزگینه
کوشتیان حسێنی بێچاره
لە بەغدایی و چەندین شاره

شای دبوون کفاره
حسێن زەرگون و ئازاره
حسێن گولەکە د گولێ دا
هنجینێ هات بەرەك لێدا
و شیخ جنید گولەك لێدا
حسێن گولەکە نۆ کامله
وی ل بەغدایە هۆیە زالمه
و هنجیێ هات لێدا بو کەڤره
شێخ جنید گولەك لێ بەرداڤکره
دەرصاد (سەعەت) ژی مابو دله
حسێنی گولەکە نۆشکفتی
و بایا تەحیا دئاخفتی

شاد دەبون کوفاره
حسێن گونازەرد و بە ئازاره
حسێن گولێکی گوڵزاره
هەرچی هات بەردێکی لێدا
وە شیخ جنێد گولێکی لێدا
حسێن گولێکی نوێی تەواوه
وەی لە بەغدایە هەی زاڵمه
هەرچی هات لێدا بو بەرده
شێخ جنید گولێکی بۆ هەڵدابوو
ساتێ کە دڵی هێزی مابوو
حسێن گولێکی نوێ پشکوتی

ئەو شەریعەت بی شکفتی
هەی شێخ جنیدۆ بری منێ ئاخرەتی
چەند داروبەرێ پێ ڤێ ئومەتی
هەموو بۆ من و گیانی من تێ
هەتا رۆژا ئومە ل قیامەتێ
نالینێد من ژ دەستێ گولاتەتی!
شیخ جنیدۆ چەندی دگریم چەندی دنالم

شەریعەت پێشی خستی
ئەی شێخ جنیدۆ برای منی ئاخرەتی
چەند داروبەری بنی ئەم ئومەتێ
هەموو بۆ من و گیانی من تێ
هەتا رۆژی ئومە[١٢٢] لە قیامەتێ
ناڵینی من لە دەست گوڵێ تە تی!
شێخ جنیدۆ چەندی دەگریم چەندی دەناڵم

---

١٢٢- ئومە: امە: خەلك

| | |
|---|---|
| کەسی نەزانی ئەزی ب چی حالم | کەس نازانێ من لە چ حالم |
| هەتا رۆژا ئوم ل قیامەتی دێ | هەتا رۆژێ هەستانەوە دێ |
| ژ دەستێ گولا تە نالم | لە دەست گولێ تۆ دەنالم |
| حسێنی سوری بو | حسێنێ سوری بوو (رەنگە مەبەستی باشی بێت) |
| رێ یا هەق ناسی بو | رێگەی هەقی ناسی بوو |
| ئەو شیخ جنید لێ خوری بو | ئەو شێخ جنێد لێی توورەبوو |

**نصری قشوری:**

وەکو پێشتر باسمان کرد یەکێك لەوانەی بەرگریان لە "حەلاج" دەکرد، نصری قشوری بوو، نصر لەتیرەی قشوری ئێلی ئەرتوشی[١٢٣] کوردانی هەکاری بوو، بەشێك لەو ئێلە رەشمالنشین نەبوون بەڵکو لە دەوری "ئەلقۆش"، زاخۆو دهۆك[١٢٤] و بەشێکیان لە دەوروبەری "بیت الشباب"، خۆشاب و شتاخ لە خواروی رۆژهەلاتی تورکیا نیشتەجێن، ئەم ئێلە تازە جێگیربوون.

نصر لەم ئێلە بووە و لە پیاوانی "المعتضد بألله" خەلیفەی عەباسی بوو، ئەم خەلیفەیە ساڵی ٢٨٢ کۆچی ئەوی بە بەرپرسی کۆکردنەوەی دارایی "موصل" و دامەزراندنی فەرمانبەرانی دارایی ئەو ناوچەیە دانا، لە کاتی پێویستدا لە بەرژەوەندی خەلیفە و دژی بەرهەڵستکاران بەشداری دەکرد.

هەر لەو ساڵەدا "معتضدی خەلیفە" ئەوی لەگەڵ وصیف موشگیر ناوێکدا بۆ بانگهێشتی "حمدان کوری حمدون تغلی" گەورەی خانەدانی حەمدانیەکان نارد، لەشکری خەلیفە لە "باسورین" لەگەڵ "حمدان" و پیاوەکانی کەوتنە شەرەوە، سەرئەنجام

١٢٣- زکی بگ، محمد امین، کوردو کوردستان ل٢٤٥-٢٤٦

١٢٤- ئەم سێ شارە لە باکوری موصل لە مەڵبەندی پارێزگای (نینوی) ە ئێستا دهۆك مەڵبەندی کوردانی "بادینان" ە کە بەشێکن لە کوردانی هەکاری.

"حمدان" به هەندێك پێویستیەوە بە قەیاغێك لە دجلە پەریەوە و لەوێوەوە بۆ دیاری بنی ربیعەی سوریا هەڵات، دوای کەوتن بە ناچاری لەرێگەی "اسحاق کوری ایوب" ەوە خۆی رادەست کرد. هەمان ساڵ "نصری قشوری" ژمارەیەك لە پیاوانی خۆی لەگەڵ عامل "معلشایا"[125] بۆ ئەو شارە نارد، لە رێگە کۆمەڵێك لە "خوارج" پەلاماریان دان، هەتا شەو شەر بەردەوام بوو، لەم شەرەدا لێپرسراوێکی "خوارج" ەکان کوژرا کە سەر بە "هارون خارجی" بەرپرسی یاخیەکانی دەوروبەری "موصل" بوو.

نصر لە دوای شەرەکە نامەیەکی هەرەشە ئامێزی بۆ هارون نووسی، بەڵام هارون لە سەرکێشی نەکەوت ناچار "معتضد" فەرمانی بە والی موصل "حسن بن علی" کرد جەنگی "خوارج" بکات. خوارجەکان شکستیان هێنا و "هارون"ی سەرکردەشیان لەگەڵ چەند کەسێکی دەربەدەر بوون و دواتر لە ساڵی ٢٨٣ کۆچی لە ناویشیان برد[126].

سمعانی نوسیویەتی: "علی کوری عیسی "ی وەزیر لەسەر ئەوەی کە نصری قشوری لەگەڵ "حەلاج" نێوانی خۆش بوو لەگەڵ حەلاج تێکچوو، رەنگە ئەمە لە سەردەمی وەزارەتی یەکەمی علی کوری عیسی (٣٠٠-٣٠٤ کۆچی)[127] بووبێت چونکە لەو کاتەدا "نصری قشوری" پەردەداری مەزنی خەلیفە بوو، ئاشکراشە دوەمین و دوا وەزارەتی ناوبراو لە (٣١٤-٣١٦) بووە و ئەو کاتەش حەلاج لە ژیاندا نەمابوو

"طبری"یش نوسیویەتی کاتێك کە حەلاج لە زینداندا بوو کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی وەکو "نصری قشوری"[128] دەکەونە داویەوە، بەڵام هەندێك دەنگۆ ئەوە نیشان دەدەن کە پێش گیرانیشی ئاشنایەتیان هەبووە، وەکو باسمان کرد بە "محمی" ناوبردنی و بوونی بەندێکی تایبەتی حەلاج لەنێو قەولی ئیزدیەکان و بوونی "ئێل" ێکی ئیزدیەکان

---

١٢٥- معلشایا: شارێکە لە خوار شاری حسنیە کە نزیکەی ١٥٠ میل باکوری (موصل)ە رەك لسترنج، جغرافیای تأریخی سرزمینهای خلافت شرقی. ترجمه محمود عرفان ل١٠٠

١٢٦- أبن الاثیر، الکامل فی التأریخ ب٨، ل٤٧٣

١٢٧- سمعانی، الانساب ب٤، ل٣١٧

١٢٨- تأریخ طبری، ب١، ل١٤٣، مصر

بەناوی "هەلاجی" لـە خـواروی شـاری "وان" ی توركیـا و جێگەكـە شـیان هـەلاجی كـە كوێستانە هەواری ئیزدیەكان بووە[129] دەكرێت بەڵگەی نزیكی حەلاج و ئیزدیەكان بن.

كاتێك "نصر" بۆ جەنگی "قرامطة" بەرەو كوفە رۆشـت، لـە رێگـا نـەخۆش كـەوت و بەرەو بەغدا هێنایانەوە و لە ساڵی "٣١٦" دا كۆچـی دوایـی كـرد، "احمـد"ی كـوری لـە جێگەی باوكی بە پەردەداری خەلیفە دانرا[130] و پێشتریش كـورێكی دیكـەی "محمـد" بـە فەرماندەی سوپا و كاروباری موصل دانرابوو[131].

## شێخ عدی كوڕی مسافر "شێخادی":

ئەوانەی پێشتر باسی ژیاننامەی "شێخادی" یان كردووە شارۆچـكەی "بیـت فـار" ی دەشتی "بقاع"ی لوبنانی ئێستایان بە شوێنی لە دایكبونی داناوە.[132]

لە قەولی ئیزدیەكانیشدا وا هاتووە:

| | |
|---|---|
| شێخادی ژ شامی هاتیە | شێخادی لە شامەوە هات |
| ل لالش دكەت خەباتە[133] | لە لالش دەكات خەبات |

جـامی دەربـارەی نـاو و بنچینەی ئـەو دەڵێـت: عـدی كـوری مسـافری شـامی ئینجـا "هەكاری"[134]ە. عبدالرزاق الحسني دەڵێت: ((شرف الدين أبو الفضل عدي كـوری مسـافر كوری اسماعیل كوری موسی كوری مەروان كوری الحسن كوری مەروان))[135] ی ئەمەویە.

---

١٢٩- محمد أمين زكى بگ، كوردو كوردستان، ل٣٤٨

١٣٠- ابن الاثير، الكامل في التأريخ ب٨، ل١٨٢

١٣١- هەمان سەرچاوە ل ١٢٩

١٣٢- الحسنى، عبدالرزاق، اليزيديون ل٢١

١٣٣- ئیزدیاتی، ل١٦٢

١٣٤- نفحات الانس، ص٥٣٢

١٣٥- اليزيديون، ل٢١

بەلام نوسەری ئیزدی "خدری سلیمان" دەلێت: ئەگەر شێخ لە بنەچەدا کورد نەبێت، چۆن دەیتوانی ئەم خەلکە زۆرە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە؟

بەلام بەسەرنجدان لەو نوسراوە جیاوازانەی دەربارەی ئیزدیەکان نوسراون، ئەوە دەردەکەوێت هەر کەسێك ئەو مەرجانەی خوارەوەی تێدابێت بە پیشەوای خۆیانی دەزانن:

١- دژی دەسەلاتی سەردەم بێت (بە مەرجێك ئەو دەسەلاتە بەلای ئەوانەوە بێگانە بێت).

٤- راستگۆ، پێشینە باش، خواپەرست و دادپەروەربێت.

٣- بە کردار دەریبخات کە خۆی لە رەشە خەلکەکە جیاناکاتەوە و بەرگری لە ماف کۆمەلایەتی ئەوان بکات، ئەوان گشت ئەو خالانەیان لە "شێخادی" دا دەبینی. جگە لەوەش بە درێژایی ژیانی لەناو ئەواندا مایەوە، "بابەك" ئاسا بە ئاشکرا خەباتی بۆ ئەکردن ئیزدیەکان بەهۆی ئەوەوە توانیان دوژمنەکانیان کوێر بکەن و لە سایەی ئەودا خۆیان پەنهان بکەن. سالی لە دایکبونی شێخادی زۆر روون نیە، لە فەرهەنگی "دهخدا" دا سالی ٤٦٧ ی کۆچی دیاری کراوە[١٣٦] بەلام زرین کوب ٤٧٠ ی داناوە[١٣٧].

لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا ٥٥٧ی کۆچیان بە سالی مەرگی داناوە، لەوانە "الکامل في التأریخ"[١٣٨] ي ابن الاثیر، وفەرهەنگی "دهخدا" یە، بەلام زرین کوب ٥٥٥ ی داناوە.

هەر کەسێك دەربارەی شێخادی نوسیووە، لە رووی چاکیەوە، هەول و خواپەرستیەوە، دانیان بە چاکی و خواپەرستی ئەودا ناوەو ئەویان بە پیری خاوەن کەرامەت و دامەزرێنەری تەریقەتی عدویەی "تصوف" داناوە.

شێخادی لەگەل زانایانی پایە بەرزی وەکو شێخ عبدالقادری گەیلانی و احمد غزالی پەیوەندی هەبووە و کاریگەری ئەوانی لەسەربوو[١٣٩].

---

١٣٦- لغت نامە دهخدا، ژێر ووشەی عدی کوری مسافر

١٣٧- جستجو در تصوف ایران ل١٠٧

١٣٨- الکامل في التأریخ ب١١- ل٢٨٩

گۆرەکەی لە "لالش"ی باکوری رۆژهەلاتی "موصل"ه و بە گەورەترین مەزارگەی پیرۆزی ئێزدیان دادەنرێت، ئیزدیەکان لە زۆربەی وێردو پارانەوەکانیاندا ستایشی شێخادی دەکەن و کەراماتێکی زۆری دەخەنە پالّ، ئەمەش یەکێك لەو وێردانەیە:

| | |
|---|---|
| شێخادی خودانی کەرەمی. | شێخادی خاوەن کەرەمە |
| داهریو ل عەرەبی ل عەجەمی | دەرکەوت لە عەرەب و لە عەجەمە |
| داهریو ل بیت ل فارە | دەرکەوت لە بیت الفارە |
| قەسدکر هاتە هەکارە. | هەستا هاتە هەکارە |
| ((لالشی مێر لێ جەما دبونە)). | لە لالش مێران لێیکۆبونە |
| ل مغارە قەسدکر هاتە لالشە، | لە ئەشکەوت هەستا هاتە لالشە |
| بەر گوهێد وان کەفتبو گوشگوشە. | بەر گوێیان کەوتبوو گوشگۆشە (لەم گوێ بۆ ئەو گوێ) |
| ئەو شای دبون، دل بێ بونە خۆشە | ئەوان شاددەبوون بەوە دڵخۆشە |
| شێخادی ژ شامێ هاتە، | شێخادی لە شامی هات |
| ب شەرقا کر خەباتە، | بە رۆژهەڵاتدا کردی خەبات |
| مەحمەد رەشان کر خەلاتە | مەحمەد رەشانی کرد خەڵات |
| خەلات کر مەحمەد رەشا، | خەڵاتی کرد مەحمەد رەشا |
| دابوی مەعاشی شەشا | دابویە موچەی شەشا (شەش کەس) |
| (ئەو کرە سەروەرێ میرا). | ئەویکردە سەروەری میرا |
| خەبەرە ل ناڤ سەییدا، | هەواڵە لە ناو سەییدا |
| داهر بو شیخەکی شەدیدا | دەرکەوت شێخێکی شەدیدا (توند) |
| ل لالشی لێ جەمادبون مریدا | لە لالشێ لێیکۆبونەوە مریدا |
| خەبەرە ل ناڤ عەجەما | هەواڵە لە ناو عەجەما |
| داهر بوو شیخەکی ب کەرەما، | دەرکەوت شێخێکی بە کەرەما |
| لالشی مرید لی دبون جەما، | لە لالش مورید لێییدەبن جەما (کۆدەبنەوە) |
| خەبەرە دناڤ عەجمستانی، | هەواڵە لەناو عەجەمستانێ |

---

١٣٩- جستجو در تصوف ایران ل ١٠٧

| | |
|---|---|
| ((داهر بو شیخەکی ب مەعنی)) | دەرکەوت شیخێکی بە مانیٚ (مەعنا) |
| لالش مرید پی کرن دیوانی. | مورید لالشیان پێکرد بە دیوانیٚ |
| هاتن شێخێد کەرەمدار، | هاتن شێخی کەرەمدارە |
| بۆرشێرە، قامچیی وان مارە، | بۆریان شێر، قامچیان مارە |
| ل شێخادی دکەن پسیارە. | لە شێخادی دەکەن پرسیارە |
| ئەو بون شێخێد ئەهل خێرە، | ئەو بون شێخی ئەهلی خێرە |
| قامچییٚ وان مارە، بۆر شێرە، | قامچی ئەوان مارە، بۆریان شێر |
| ناڤی شێخادی دکەن پسێرە. | ناوی شێخادی دەکەن پرسیارە |
| ئەو بون شێخیٚ ژ ئەبول قاتی، | ئەو بوو شیخی لە ئەبول قاتی (قاتانی) |
| هاتبون با شێخادی حکیاتی، | هاتبوون لەگەڵ شێخادی بکەن بە سەرهاتی (حکایات) |
| گۆ: شێخادی قوتبی زەمین، ئەم ل قاتی | بڵیٚ: شێخادی قوتبی زەمین ئێمە بۆ لای تۆ هاتین |

| | |
|---|---|
| شێخادی کریو فروارە | شێخادی کردی هاوارە |
| شێر مەحمەد رەشان ل بەرەکی کر سوارە، | شێر مەحمەد رەشانی لەبەردێك کرد سوارە |
| ((گو:گەلی مێرا وە چی هەیە ل بالە)) | ((ووتی: گەلی میران چی هەیە لەو باڵە)) |
| یا مەحەمەد رەشان سواریە ل بەرەکی، | یا مەحەمەد رەشان سواریە لە بەردەکی |
| ئەوان مێرا بی شیوار نەما ل دەرەکی، | ئەو مێرانە درەنگ دەکەون لەجێییەکی |
| ژوان بپرسە خەبەرەکی | لەوان بپرسە هەواڵەکی |
| هەر ب بەخت و کەرب و کینە، | هەر بە بەخت و دڵرەقی و کینە |
| ژوان بکە پرسینە، | لەوان بکە پرسینە (پرسیار) |
| برینە زەرب و کەرامەتا وان چینە. | بروانە لێدان و کەراماتیان چینە (چۆنە) |
| ژنو پاش بەر وان کەڤە بۆ من بینە. | ئینجا پێشیان کەوە و بیانهێنە |
| شێخ ب رێبون ژ مالە. | شێخ بە ڕیٚ بوون لە ماڵە |
| ب گورن ب گەڤن ب گالە، | بە گوڕن توڕەن بە گاڵە |
| مەحمەد رەشان دبیژت: وە چی هەیە ل بالە. | مەحەمەد رەشان دەڵێت: چی هەیە لەو باڵە |

ژمێژه ئەون دریبەرن،
نەقیبن ب سەروەرن،
شێخادی کەرەم کریە هون وەرن،
سەید ئەبو وەفا دەنگ هلتینی،
کبارێ دەینن دا ئەم بچین مسکینی،
سەید ئەبو وەفا دبێژتە وان سەروەرا،
مە گەلەک شێخ دیتن ل هەموو دەرا،
پەدشا ئەوێ روح دشینە بە بەرا
چەند سەیدینە،
دەنگ دکەن ب نەهینە،
ئەڤ بەرە روح تی نینە.

لە مێژە ئەوان ڕێبەرن
هەڵبژاردەن سەروەرن
شێخادی فەرمووی وەرن
سەید ئەبو وەفا دەنگ هەڵدێنێ
گەورەیی دانێ با بچینە مسکینیی (هەژاری)
سەید ئەبو وەفا دەڵێت بە سەروەران
ئێمە گەلێك شێخ مان دیت لە هەموو دەران
پادشا ئەوەیە گیان بکاتە بەر بەردان
چەندێ سەیدینە
دەدوێن بە نهینە (نهێنی)
ئەو بەردە گیانی تیا نینە (تیانیە)

وێ دبێژن شێخێ سەیدا.
((گاڤا مەحمە رەشان دیتا))،
تو شێخی ئانی مریدا
ئەز مەحمەدێ رەشیمە،
سواری بەریمە،
ئەز بخو مریدێ شێخادیمە.
هاتن شێخێد تەباقە
توی سەروەرێ هەمیا،
هەکە تە پشتا خو ب مغارێ ڤەنیا،
ل تە و مێرا فرا بێ جیا
سەید ئەحمەد دەنگ دکەت ب شینە،
هێژا مە ئاڤەك دڤێ یە،
ژ پێشادا ئەم پێ بگرین دستا و نڤێژە

ئەو دەڵێت شێخی سەیدانن
کاتێ مەحمە رەشا دەبینن
تۆ شێخی یا موریدن
من مەحمەدێ ڕەشیمە
سواری بەرد یمە
من خۆم موریدی شێخادیمە
هاتن شێخان پێکەوە
تۆ سەروەری هەموانی
کە پشت بە ئەشکەوتەوە دەنێی
لە تۆ و میران دەبێ فراوانی
سەید ئەحمەد دەنگ دەکات بە شێنەیی
گەورەی ئێمە ئاومان دەوێ
لە پێشدا ئێمە بگرین دەستنوێژێ

| | |
|---|---|
| شێخادی خۆش سلتینه، | شێخادی خۆش سوڵتێنه (سوڵتانه) |
| دەنگ دکەت ب نهینه، | دەنگ دەکات بە نهێنە (نهێنی) |
| حەوجەیا مە ب ئاڤێ نینە | پێویستیمان بە ئاو نینە |
| دەستنڤێژ ژ مە بزینە. | دەستنوێژ لەمن بستێنە |
| شێخادی دبێ گەلی مێرا: | شێخادی دەڵێ گەلی میران: |
| ئاڤەکی ژ خۆرا دەرکەن، | ئاوێك بۆ خۆتان دەرکەن |
| دەستێ خۆ سونەتێ ڤەرکەن، | دەستی خۆتان سونەت و پیرۆزکەن |
| ژ تۆ پاش میرێ خۆ ب نەدەرکەن. | لە ئێستاوە خۆتان بۆ میر نەزرکەن |
| شێخادی ب نەدەرە، | شێخادی بە نەزەرە |
| وەکاز دابوە بەرە، | گۆچانی دا لە بەرە (بەرد) |
| دەنگ ل ئاڤێ دکرە، | دەنگ لە ئاو هاتەدەرە |
| گوتی: تەعال یا زمزم وەرە | گوتی: وەرە ئەی زمزم وەرە |
| ژ قەولێ بسێ چـــــــەمی | بە ووتەی کوڕی جەمێ |
| تەنێ شێخادی ب کەلمی | تەنـــها شیخادی دەدوێ (قسەیکرد) |
| ئـــاڤ دێ دەرکـــــەڤی | ئاو دێت دەردەکـــەوێ |
| ژ برکا عەین زمـــــــزمی | لە چاڵی سەرچاوەی زەمزەمێ |
| وێ ل شێخادی دکەن صلاڤە | ئەوان لە شیخادی دەکەن سلاوە |
| شیخادی ژ کەرەمێ عەلێك ڤەداڤە | شیخادی لە کەرەمی وەلامی داوە |
| شێخادی ب خۆ سلّتانە | شێخادی بەخۆی سوڵتانە |
| ئێ ب ئەدەبە، ئێ ب ئەرکانە، | بە ئەدەبە بە ئیمانە |
| ئەوی جیهێ مێرا نیشان دانە، | ئەو جێی میرانی نیشان دانە |
| مەحمەد رەشان سەکنی ل بەوارێ | مەحمەد رەشان وەستا لە بەوارێ[140](1) |
| گوت هون بخێر هاتن ڤیجارێ، | گوتی بەخێربێن ئەمجارە |
| شێخ ئەز نینم، شێخ ئەوە ل مغارێ، | شێخ من نیم، شێخ ئەوەی مغارە (ئەشکەوت) |

١٤٠- بەوارێ: شوێنێکە لە چیای مقلوب نزیك شاری موصل

| | |
|---|---|
| مێر ل مەحمەد رەشان فكرین، | مێر لە مەحمەد رەشانیان روانی |
| رابـــــــون تێك زنزلـــــــین | هەستان لەیەك هالین |
| ل دەریێ مغاری وەصلین | لە دەری ئەشكەوت وەرین |
| میر وەصلین ل دەریێ مغاریێ | میر گەیشتە دەری مغاریێ (ئەشكەوت) |
| ب روا چۆنە خـــــواریێ | لەسەر خۆ چونە خواریێ |
| گو: ئورد و شباش ژێۆ خودانیێ هەكاریێ | بلێ: وێرد و شاباش بۆ خاوەنیێ هەكاری |
| سەید ئەحمەد[١٤١](٢) هات ل جەنگا، | سەید ئەحمەد هات بە گاگۆلكیێ |
| خدر هلتینیێ دەنـــگا | خدر هەلدەبڕیێ دەنگە |
| گۆ: جیێ مێرا ساعەتی تەنگا. | بلێ: جێگەی میران ئێستە تەنگە |
| مەحمەد رەشان دبی سەید ئەحمەدا، | مەحمەد رەشان دەلێ سەید ئەحمەدی |
| یا مێرا مەعنیە و چێرە | یا میری مەعناو |
| چـــــیی وان خواست بوە | ئەوان چیان خواستبوو |
| شێخادی ئینابو ژێرە | شێخادی هێنابویە ژێریێ |
| تزبی و وەكازی سەید ئەحمەد ل كبیر ئینابوە | تەزبیح و گۆچانی سەید ئەحمەدی گەورەی هێنابوو |
| وە دبێژت مەحمەد رەشانە، | وا دەبێژێت مەحمەد رەشانە |
| شێخادی بخۆ سلتانە | شیخادی بۆخۆی سولتانە |
| ئاڤ ئینا بۆ میران | ئاوی هێنا بۆ مێرانە |
| چەنـــــــدی ســـــەیینە | چەندی سەیدینە |
| دەنگ دكەن ب نەهینە، | دەدوێن بە نهێنە (نهێنی) |
| تاقەتا مەل ئاڤ بەردانیێ نینە | ئێمە توانای ئاوبەردانمان نینە |
| شێخادی ب نەدەرە | شێخادی بە نەزەرە |
| دەنگ ل ئاڤیێ دەكرە | دەنگ لە ئاویێ دەكـــات |
| ئاڤ گورگور چودەرە. | ئاو گوڕەگوڕ چوە دەریێ |
| هون شێخی ب ناسن، | ئێوە شـــێخ بناسن |

---

١٤١- سید احمد رفاعی ابو الوفا

لەگەل ئێك و دوب رازن،
ئالیکا شێرا ژ شیخادی بخوازن.
وە دبێژت خدر نەقیبە،
پادشای منوی حەبیبە،
بۆر ژمە دخوازن نەصیبە
وە دبێژت کیلا
کێشا بو لبەر شێخادی دەخیلا
گو ئالیکا شێرا چیلا
شێخادی وە دکر فروارە،
چێلێ ب ناڤ شێرا دهنارە
نە چێلا شێر هیلان نە مریشکا مارە
ل ناڤ نەقیبا بو بەیـــانە،
گوگرین دل مـــــــانــــە،
ل ناڤ نەقیبا بو ئەستەخبیرە
ل ناڤ حزن و نەهێلە
گو حەیا مە ژوان نەما شێرە
گو شێریدمە چۆن ئەم پەیا مانە
مەحمە رەشان گۆ:
سەید ئەحمەدێ توب ڤی یەکی ناسپێری
قایم نابی ئیکی بیری،
چما توب تنی خۆ بدەستی شیخادی ناسپێری
هەکە تەباوەری ب ڤی تەنی
کەرەمکە ئەم بچین سەر چیای ناڤ مشەتی
بایەك وێ تی ژ رەحمەتی.
کەرەمکە ئەم رابن سەر پێیە

لەگەل یەکدا برازن
ئالیکی شێران لە شێخادی بخوازن
وا دەبێژێت خــدر نەقیبە
پادشای منەو حەبیبە (خۆشەویستە)
بۆر لە ئێمە دەخوازێت نەصیبە (بەش)
وا دەبێژێت بەبێ زمانان
لە شێخادی پەنا دەخوازن
بڵێ ئالیکی گاو شێران
شێخ هادی کردی هاواران
گا کەوتنە ناو شێران
نە گا شێری هێلاو نە مریشك ماران
نەقیبان بۆیان بوو رەوان
بڵێ گریان بێ دڵ مان
لەناو نەقیبان بو ئەستەغفیرە
لەناو غەم و پەژێرە
بڵێ نەمان ماوە شێرە
بڵێ خۆمان پیادە شیرنەمانە
مەحمە رەشان بڵێ:
سەید ئەحمەدێ تۆ بەو یەکە خۆت ناسپێری
بەهێز نابیت بە یەکی پیری
ئەی بۆ بەتەنها خۆت بە شیخادی ناسپێری
ئەگەر تۆ باوەرت بەوە نایێ
فەرموو بچینە سەر چیا ناو کۆڕێ
بایەك وادێ لە رەحمەتێ
فەرموو باهەلسینە سەرپێ

| | |
|---|---|
| هنجی میرێ حوکم کەت زی و سمبێلید خویە | هەتا مێرێ پتر ریش و سمێل بهێلێ |
| شێخینی بۆ وی ل جیە | شێخیتی بۆ ئەو دەمێنێ |
| شێخادی ل وان دەنگ دکەتە | شێخادی لێیان دەکا هاوارێ |
| کەرەمکە ئەم بچینە سەر چیایی ناڤ مشەتە | فەرموو بچینە سەرچیا ناو کورێ |
| "دا بفکرین بەیانە سلتان شیخادی" | با بڕوانین روونە سولتان شیخادیە |

### ابو بکر زەمیلە ساز (زەمیلەچن):

ابو بکر کوری اسماعیل تەبریزی لە شێخانی شمس الدین محمد تەبریزی بوو، لە دەرخستنی دڵاندا (کشف القلوب) بێ وێنەی سەردەمی خۆی بوو، شمس دەربارەی ئەو ووتوویەتی گشت گەورەییەکان لەودا هەیە، بەڵام کە پایەی بە بڵندی گەشت، دوای "شێخ.اکملی" کەوت.[142]

رەنگە هۆکاری ئەوەی کە "شێخۆ بکر" یان بە"بابادین" زانیووە ئەو دەستپێشکەریە بووبێت کە بۆ رێنمایی شمس کردووە، هەروەها ئەو خەلکی ناوچەی نیشتەجێ بوونی"ئیزدیەکان" بوو، هەرچەند پایەی ئەو لە شەمس خوارترە، بەڵام نەوەکانی لە رێز و ئەدەبدا سەرمەشقن و ئێستا میری ئیزدیان لە بنەماڵەی شێخوبەکرن.

کات و سەردەمی شێخو بەکر و هەروەها پەیوەست بوونی شمس بەوەوە لەو بەلگە گرنگانەن کە ئەو یەکێك لە حەوت فریشتەکانە.

### شەمسی تەبریزی (شێشەمس):

جامی نازناوی شەمس لە "مولانا جلالالدین"ی رومیەوە بەم شێوەیە دەگێرێتەوە: "المولی الاعز و الداعی الی الخیر خلاصته الارواح ر المشکوة و الزجاجة و المصباح شمس الحق و الدین نورالله فی الاولین و الأخرین"[143] و ناوی ئەوی بە محمد کوری ملکداری

---

١٤٢- زندگای مولانا جلال الدین، ل٥ و تأریخ ادبیات در ایران، ل٣، بەشی١، ل٤٥٤

١٤٣- نفحات، ل٤٦٤

تەبریزی داناوە. فروزانفر ناوو نازناوی بە "شمس الدین محمد کوری ملك داری تەبریزی" ناوهێناوە.[144]

خدری سلێمان خاوەنی پەرتوکی ئیزدیاتی ناوی باوکی "شمس"ی بە "ئیـزدین مـیر" نوسیووە.[145] فروزانفر ساڵی لەدایك بوونی بە ٥٨٢ کۆچی داناوە . شمس لە سەرەتاوە موریدی شێخ ابو بکری زەمیلەچن یان زەمیلە سازی تـەبریزی بـووە، بـەڵام کـە پایـەی بڵندبوەوە ئیتر بە شێخەکەی خۆی رازی نەبوو، وێڵی خولیاکـانی مێشـکی بـوو گەشـت و گەرانێکی زۆری کرد، هەر لەبەر ئەوەشە بە شێخی باڵداری ناودەبەن.

ئیزدیەکان لەم بارەیەوە دەڵێن:

**چیٚ بازیەکی ب هنەرە**      **چی بازێکی بە هونەرە**

**فری چو عەرشید سەرە**      **فڕی چووە عەرشێت سەرە**

**من نەزانی سۆرا شمسیٚ "تەتەرە"[146]**      **نەمزانی نوێنەری شەمسی تەتەرە**

هەندێك بە موریدی "شێخ رکن الدین سجاسی" یان داناوە و هەنـدێکیش بـە موریـدی "بابا کمال جندی"[147] یان زانیوە، جـامی دەڵێـت هاوکـات "فخرالـدین عراقـی" شـاعیری کۆتایی سەدەی حەوتەمیش لە حەلقەی موریدانی بابا کمال بوو. شەمس سەرەرای گەران و گەشتە زۆرەکانی، کاری رۆژانەی خۆشی ئەنجامدەدا و بە کاسپی دیکەوە خەریك بـوو، لە بەغداد هامشۆی خانەقاکەی ((اوحد الدین کرمانی)) زانای سەدەی حەوتەمیشی دەکرد و یەکتریان دەبینی، بەلاَم بە پێی ئەو دیدارانە وەها دەردەکەوێت "شـمس" بایـەخی بـە کارە رووکەشەکانی خواپەرستی و بابەتەکانی دیکەی نەداوە.

فروزانفر لەم بارەیەوە دەڵێت: ((شمس الـدین بـە هـەموو توانایـەوە رووی لـە خـاڵ و چـەقی راسـتی کردبـو و لـە هەڵسوکەوتیشـیدا رەنگـی دابـوەوە و لـەو پەسـەند و نـا

---

١٤٤- زندگانی مولانا جلال الدین، ل٤٩

١٤٥- ئیزدیاتی، ل١٢٧

١٤٦- ئیزدیاتی، ل٤٩

١٤٧- زندگانی مولانا جلال الدین، ل ٥٤

پەسەندانەی کە پوچەڵەکان بناغەکەیان دانابوو خۆی لادەداو گوێی بە رێورەسمی مزگەوت و خانەقاکانی ئەو رۆژگارە نەدەدا کە سەرمایەی خۆفرۆشی و خۆپەرستی هەندێك لەو کەمتوانایانە بوو کە خۆیان بە چلەنشین دادەنا و لە جیهانی بێ سنور و کەشی ئازاددا بەو پەری سەربەستیەوە پەروباڵی هیمەتی کردەوە......))

شمس بەربەیانی ٢٦–جمادی اخرەی ساڵی ٦٤٢ کۆچی بۆ قۆنیەی شوێنی "مولانا جلال الدین" رۆشت، دەربارەی دیداری شمس و مولانا گێرانەوەی جۆراوجۆر هەیە کە فروزانفر ئەوانەی لە پەرتووکەکەیدا بەناوی "ژیانی مولانا جلال الدین محمد بەڵخی"ەوە نوسیوە و هەموو گیرانەوەکانیش پایەبەرزی وکەراماتی شمس دەسەلمێنن.

فروزانفر یەکەم دیداری مەولانا و شمس لەحەلەب یان شام بەدوور نازانێت[١٤٨]. وەئەم ئاشنایەتیەی شمس و شێخ مندی ئەمیری ئەوسای "حەلەب"ی سەر بە "ئەیوبی"یەکان کە نۆ ئاشتکردنەوەی شمس و شێخ بۆ لالش هات بەهێزدەکات.

بەهەرحال بەیەککەیشتنی شمس و مەولانا گۆرانێکی لە ژیانی مەولانا سازاند و مەولانا لەباتی نوێژدا بەستن و کۆری وەعزدان، سەماو سوڕان و دانیشتنی سەماعی دامەزراند و لەجێی ووتی، ووتی خوێندنگەو مشتومری ئەهلی بەدوداچوون، گوێی بۆ ئاوازی گیان سۆزی نەی و روباب و گۆرانیە دڵنەوازەکان هەڵخست[١٤٩] و بوویە هاودەمی شمس و لەیارانی جارانی دابرا.

خزم و یاران و شاگردانی مەولانا، "شمس"یان بە بێباك و بە کەسێك دانا کە گوێ بە هیچ نادات و زۆربەی خەڵکی شاری قۆنیە لێی تووڕە و بێزاربوون و موریدەکان دەستیان بەسکاڵاکرد.

بەڵام مەولانا لەوەی لە دەوری دەگوزەرا هیچ باکی نەبوو، بەو پەندانەش بەندی سەخت تر دەبوو، بێپەروا رۆژ پەرستی دەکرد[١٥٠]، "شمس"یش لەوەی پێشهاتبوو

---

١٤٨- زندگای مولانا، ل٦٠

١٤٩- لالش بەمەڵبەندی بنەرەتی ئیزدیانە، لە باکوری رۆژهەلاتی "موصل"ە

١٥٠- زندگانی مولانا، ل٦٤

ماندوتووڕەبوو ناچار ڕۆژی پێنج شەمەی (٢١ شەوالی ٦٤٣ کۆچی) بێدەنگ قونیەی بە جێهێشت.

مەولانا لەدووری یارەکەی تێکچوو، کەوتەئەملاولا، دوای هەولێکی زۆر بۆی دەرکەوت یارەکەی لە دیمەشق گیرساوەتەوە. چەندجار هەولیدا بیگەڕێنێتەوە، سەرئەنجام سالی ٦٤٤ کۆچی مەولانا (سولتان وەلەد؟)ی کوری نارد بەشوێنیا[١٥١]، شمس گەرایەوە مەیل و پەیوەستی و هۆگری مەولانا هێندە پەرەی سەند بێپەروا شەمسی مـن و خـودای منـی دەوت! دیسانەوە خەلکی قۆنیە و موریدەکانی بێزاربوونەوە و مەولانایان بە شێت و "شمس"یان بە جادوگەر ناودەهێنا.[١٥٢]

لەبەرئەوەی یارانی مەولانا چاکی دوژمنایەتیان لەبەرامبەر "شەمس"دا بەستوو، ئەویش دلی لە "قۆنیە" هەلکەنراو بریاری دا ملی ڕێگە بگرێت ، جۆرێکیش خۆی وون بکات کەس سۆراغی نەزانیت، سەرنجام سالی ٦٤٥کۆچی سەریخۆی هەلگرت و سەرنگوم بوو.[١٥٣]

لەبارەی وونبوونی "شەمس"ەوە گێرانەوەی جیاواز و دژبەیەك زۆرن، بەلام ئەوەی سولتان وەلەد ی کوری مەولانا باسی کردوە، بەراسترین گیرانەوە دەژمێردرێت شایەنی باسە کاتێ وونبوونی "شەمس" و سالی کوژرانی شیخ حسن کوری عدی دووەم ٦٤٤ کۆچی نزیکیان هەیە.

دەبێت ئەو بەلگە گرنگانەی بوونەتە هۆی ئەوەی کە شەمس لە شێخانی ئیزدیان دابنرێت روونبکەینەوە، کە ئەمانەن:

١. لە پارانەوە و نوسراوە ئیزیدیەکاندا دەق هەیە بەناوی "شەمسی تەبریزی"ەوە دەوترێت، لەوانە مەسنەویەکی ئاوێتەیە بە ووشەی "کوردی و فارسی و تورکی" ، نوسراوە:

---

١٥١- هەمان سەرچاوە

١٥٢- هەمان سەرچاوە

١٥٣- ئیزدیاتی، ل١٣٢

جـــــان بوئين چيچـــه‌كي    گيانم به‌قوربان ئائه‌و چيچه‌كه (ناوی گوڵه)

شه‌مس ته‌وریزی كوچه‌كی    شـه‌مسی تـه‌وریزی كـوچه‌كه

٢. شه‌مسی ته‌ورێزی له‌ناو نوسراوه‌ ئیزدیه‌كان هاوسه‌رده‌می شێخ حسـن عـدی بـووه‌ كه‌ ساڵی ٦٤٥كۆچی به‌ فه‌رمانی بدرالدین لۆلۆی فـه‌رمانره‌وای "موصـل" كـوژرا، بـه‌پێی ئه‌وه‌ له‌باره‌ی كاته‌وه‌ هیچ گومانێك نامێنێته‌وه‌ كه‌ ئه‌م "شه‌مس"ه‌ هه‌مان مامۆسـتاكه‌ی "مه‌ولانا" بێت.

٣. ره‌فتارو كرداری شه‌مس و ئه‌و حاڵاته‌ی مه‌ولانا دوای دیداری شه‌مس به‌سـه‌ریهات، زۆرێك له‌ ره‌فتار و كرداری ئیزدیه‌كان به‌یاد ده‌هێنێته‌وه‌ كه‌له‌به‌شـی تایبـه‌ت بـه‌ بـاوه‌ر و ئاداب و نه‌ریتی ئیزدیه‌كاندا لێیده‌روانین.

٤. ئیزدیه‌كان له‌ كۆنه‌وه‌ له‌گه‌ڵ ته‌ورێز و گشت ناوچه‌كانی ئازه‌ربـه‌یجان په‌یوه‌نـدیان هه‌بووه‌ و به‌یه‌كێك له‌ ناوه‌نـده‌كانی خۆیانیـان ئـه‌ژماردووه‌، یـه‌كێك لـه‌ تاوسـه‌كانیان كـه‌ دواتـر به‌درێـژی باسـی ده‌كـه‌ین، تایبـه‌ت بـه‌ ئێزیدیـه‌كانی تـه‌ورێز و ده‌وروبـه‌ری بـووه‌، ئه‌مه‌ش یه‌كێك له‌ نوسراوه‌كانی "شه‌مس":

"قه‌ولی شێشمسی ته‌ورێزی"    قه‌ولی شێخ شه‌مسی ته‌ورێزی

مـه‌ســـــتم ژ قـــــه‌ده‌هـــێ    مه‌ســـــتم لــــه‌ قــــــه‌ده‌حێ

لالـــــــشێ خودانـــێ قوبه‌هێ    لالــــــشێ خاوه‌ن گومــــــه‌زێ

دێ ب شێشمس ده‌ین مه‌ده‌هێ    دێ به‌ شێخ شه‌مس ده‌ین مه‌ده‌حێ

مه‌ســـــــتم ژ دیــــــــوانی    مه‌ســــــتم لــــه‌ دیــــــوانێ

دێ ب شێشم ده‌ین به‌یانێ    بابه‌ شێخ شه‌م به‌ین به‌یانێ

یاشێشم ته‌ ئه‌م ئینانیه‌ سه‌رئه‌ركانێ    یا شێخ شه‌م تۆ ئێمه‌ت هێنایه‌ سه‌ر ئه‌ركانی

پاشێشم توی ره‌حیمی    یا شێخ شه‌م تۆی ره‌حیمی

خالقێ من ژ قه‌دیمی    ئافرێنده‌ی من له‌ قه‌دیمی

له‌ هه‌موو ده‌ردای حه‌كیمی    له‌ هه‌موو ده‌ردێ حه‌كیمی

یا شێشم توی رەحمانی
خالقی منـــی جانــی
"لو هەموو دەردا توی دەرمانی"
ل هەموو خەلقا توی رەحمانـــی
یا شێشم تو مەفەری
خالقی منی هەروهەری

رزقا ددەی و رزقا دبەری
هەرە مارە، هەرە مشکە
هەرە تەرە هەرە هشکە
ئەوان ژك ب شێشم هەبت پارویشکە

هەرە رەقە، هەرە مادە
هەرەبا، هەرە دهارە
ئەوان ژك ب شێشم هەبت پشك و پارە
ژمالێ هەتا ب مالێ
شێشمس خودانێ سیقالێ
ئەم شێشمس نابرین ژخیالێ
ژ دەرەچێ هەتا دەرەچێ
شێشمسە خودانێ فەرەجێ

دەست و دامانێد شیشمس دێ
طواف کـــــەین
شونا کەعبەت ل لالشێ و حەجێ
ژ ستونێ هەتاب ستونێ
چەند مفتە هەینە ل هندرێ خزینێ

یا شێخ شەمس تۆی رەحمانی
ئافریندەی منی گیانـــــی
لە هەموو دەردا تۆی دەرمانی
لە هەموو ئافەریدان تۆی رەحمانی
یا شێخ شەمس تۆ مەفەری "پەنای"
خالقی منی و هەروهەری (هەتا هەتایە
خالقی منی)
رزق دەدەی و رزق دەبری
ئەگەر مارە، ئەگەر مشکە
ئەگەر تەرە ئەگەر ووشکە
ئەوانیش لە شێخ شەم هەیانە پشك
وپارە
ئەگەر رەقە ئەگەر مادە
ئەگەر وونە، ئەگەر دیارە
ئەوانیش لە شێخ شەم هەیانە پشك و پارە
لە مالێ هـــەتا مـــالێ
شێخ شەمس دلێ دەمالێ
شێخ شەمس نابرین لە خەیالێ
لە دەرەچێ تا دەرەچێ (پلە)
شێخ شەمسە خودانی فەرەجێ
(رزگارکەرەوە)
دەست و دامێنی شێخ شەمس دەبێ
ماچ کـــــەین
جێگەی کەعبە لە لالەشێ و حەجێ
لە ستونێك هەتا بەستونێ
چەند کلیل هەیە لە نێو خەزینێ

یا شیشمس تەدا دەستێ مەعریفەتێ یا ناسینێ

ژ چاڤا هەتا دەڤی
مۆرا شێشمس ئێ دکەڤی
یا شێشمس مێرا، مەلەکا، ژ گەرما
ناهێلن ئەم بنڤی
ژ سەری هەتا پێیا،
یا شێشم تە ئەم نەخشاندین دانانینە
سەرێد رێیا،
ئەم شێشم نابرین ژ هێڤیا
یا شێشم تە ئەم خوندینە سەر ڤی خلمەتێ،
ل مە ڤەکە دەریەکی رەحمەتی،
روونایەکی بدەیە بەر مە و چەنەی سونەتێ
سونەت کو سونەتە،
زەبونە کێم تاقەتە،
ئەوان ژی ب شێشم هەبون ئەینەتە

سونی کو دسونینە،
زەبونێد دئیمان دینە،
ئەوان ژی ب شێشم هێڤینە
چەندی طەیر وێ دفرن،
سەر چەنگ و باسکێد خودا دنێرن،
یا شێشم ئەوژك ل با تە ب سورن
جهۆ کو جهونە،
سەلەفخۆرن دبوهتان نەبونە،

یا شێخ شمس تۆ پێتداین مەعریفەت و
ناسینێ
لە چاو هەتا دەمێ
مۆری شێخ شەمسی لێدەکەوێ
یا شێخ شەمس مێران، فریشتان لە گەرما
ناهێڵن ئێمە بنوین
لە سەر هەتا پێیا
یا شێخ شەمس تۆ ئێمەت وا نەخشاندوە
سەر ڕێیا
ئێمە لە شێخ شەمس نابرین هیوا
یا شێخ شمس تۆ ئێمەت هێنایە سەر خزمەتێ
لێمان بکەوە دەرویەکی رەحمەتێ
ڕۆشنایەك بدە بە ئێمە و هەرچی سونەتێ
سونەت کە سونەتە,
زەبونە کەم تاقەتە,
ئەوانیش بە شێخ شەمس هەیانە ئەینەتە
(ئیمان)
سونی کە سونینە,
زەبونن لە ئیمان دینە,
ئەوانیش هیوایان بە شێخ شەمسەدینە
چەند باڵندە هەن دەفڕن,
لە پەر و باڵی خۆیان دەنۆڕن,
یا شێخ شەمس ئەوانیش لای تۆ بە مۆرن
جولەکە کە جوونە,
سەلەمخۆرن لە بوختان نەبوونە,

ئەوژك پی شێشم دچونە. | ئەوانیش لە پێی شێخ شەمس دەچوونە.
فەلە کو دفەلەنە، | فەلە کە لە فەلەنە، (گاور)
پیٚ ب کەشیش و ئابەنەنە، | پیٚ بە کەشیش و ئابونەنە,
ئەوژك پیٚ شێشم دەەرەنە. | ئەوانیش لە پێی شێخ شەمس دەچوونە.

صدرالدین قۆنیەوی، لەوانەیە "ناصرالدین" بێت.

محمدی کوری ئیسحاق (٦٧٣ کۆچی) ناسراو بە "صدر المعالی" خەڵکی قۆنیەیە ولە مەزنانی تصوف و زانا بەناوبانگەکانە، ژمارەی دانراوەکانی کەخۆی لە (٤٥) نوسراو دەدات لەناو زانایان و لێکوڵەراندا ناو بانگێکی باشی هەیە. دەڵێن دایکی شوی بە زانای بەناوبانگ "محی الدین العربی" کردۆتەوە، لەسایەی ئەودا پەروەردەبووە، لە خەڵکی پتر لە هۆکارەکانی عیرفانی و بەتایبەتی یەکێتی بوون ئاشنابووە رێگەیەکی گرتبوەبەر کەلەگەل شەریعەت بگونجێت، بۆیە ناوبانگی پەیداکردو زانایان پشتیان پێدەبەست.

صدرالدین لە قۆنیە گۆشە و خوێندنگەی تایبەتی خۆی هەبوو، لەگەل کۆمەلێك ناوداری ئەوسەردەمە، وەکو سعدالدین حموی، مۆیدالدین جندی و فخرالدین عراقی هامشۆی هەبوو، خواجە نصرالدین طوسی(٦٧٢ کۆچی) لە مامۆستایانی ئەوبوو بە بەرزیش ناوی بردوە، دەربارەی تصوف (مفتاح الغیب)، نصوص و فکوك و نفحات الکهبیة)ی ئەو سەرچاوەی زانستخوازان بووە.

لەسەرەتاوە شێخ صدرالدین مەولانای رەتدەکردەوە، بەلام سەرئەنجام بەهۆی "شیخ سراج الدین أرموی"ەوە خۆی لە بازنەی دلسۆزانی "مەولانا"دا دیەوە، دوای ئەوەی لە خزمەت مەولانا گەرایەوە، فەرمووی: ((ئەم پیاوە پشتیوانی خواپەرستانە))، هەمیشە بەرێزەوە پێشوازی لە مەولانا دەکرد و دەیگوت: مەولانا سوپاسالاری فیقهی محەمەدیە، مەولاناش بە نۆرەی خۆی لەرێزی شیخ صدرالدین بیٚ دریغ بوو، کەرێزی لە مەولانا دەنا بەهۆی گەورەی و بەتەمەنی مەولاناوە نەبوو، صدرالدین لە شێخانی پایە بلندی دیکەش وەکو (شێخ اوحدالدین کرمانی)ش بەهرەمەندبوو.

صفا له حاجی خەلیفەوە دەگێڕێتەوە: (( کەلە پشتی هەندێك لە نوسخەکانی کتێبی عرفانی پارسی(تبصره المبتدی و تذکره المنتهي) شیخ ناصرالدین محدث ، دا نوسراوە،[154] و ئاشکرایە کە:

١. وەکو پێشتر باسمان کرد صدرالدین هاوسەردەمی زانا پلە باڵاکانی ئێزدیان بووە.

٢. صدرالدین لەگەڵ ئەو مەزنانە دۆست و هاودەم بووە و بە مامۆستای فخرالدین عراقی ئەژمار دەکرێت.

٣. خۆی لە مەزنانی تەریقەت بوە و دوای محی الدین العربی ئەو ڕابەری تەریقەت دەگرێتە دەست و ڕێکەوتیش نیە کە لە ووتەی (جندی)دا هاتووە: ناسردینی بابانە.

## شێخ حسن کوری عودەی دووەم:-

یەکەم جێنشینی شیخ عودەی یەکەم (ابو البرکات حسن کوری صخر کوری مسافر)ی برازای خۆی بوو. گوایە شیخ عودەی لە جێگەی خۆی داناوە. ناوبراو پیاوێکی زاناو خۆپارێز چلەکێش بوو و هەتا کۆتایی تەمەنی لەسەر ڕێگەکەی مامی لاینەداوە، هەرچەند بە پیری مردوە بەلام کاتی مردنی دیارنیە. دوای ئەویش کورەکەی "ابو المفاخر عدی" کە بە"کوردی" ناوی ڕۆشتووە، ڕابەری ڕێگەی عدویەی گرتەدەست، ئەویش لەسەر ڕێگەی باوانی ڕۆشت، پیاوێکی زاناو دۆستی زانستخوازان بوو[155](1)، بەهێزو پارێزگاربوو، لە "هەکاری" و دەوروبەری دەستی بەرێنمایی کرد، ناوبراو بەعودەی دووەم ناوی دەرکردووە، دوای ئەو شێخ حسن (ملك شێخ حسن) کوڕی جێگەی گرتەوە، الحسنی ناوونازناوی ئەوی ئاوا نوسیووە: بە (تاج العارفین شمس الدین ابو محمد شێخی

---

١٥٤- دنباله جستجودر تصوف ایران ١٢٠-١٢٥ و تأریخ ادبیات ایران ب٣، بەشی ١، ل١٦٩ و بەشی دووەم ل ١٣١٦-١٣١٧ و زندگانی مولانا جلال الدین محمد ل١١٨-١٢٠

١٥٥- الیزیدیون ، ل٢٧

کوردان))[١٥٦(٢)] ناوی هێناوە، ساڵی ٥٩١ کۆچی چاوی بە جیهان هەڵهێناوە و ساڵی ٦٤٥ کوژراوە. لەبەرئەوەی ساڵی مەرگی باوکی نەزانراوە ساڵی رابەری ئەمیش ئاشکرا نیە، لەسەردەمی ئەم (شێخ حسن)ەدا دەربارەی پایە و کەراماتی شێخ عودەی و جێگرەوەکانی زیادەرەوی کراوە و لادان لە ئاینی ئێزدیدا سەریهەڵدا. گوایە شێخ چەند کتێبی نوسیووە لەوانە "الجلوه لاهل الخلوه" بەلام لەبەردەستدا نیە[١٥٧(٣)]. شایەنی باسە لەنێوان "شێخ شەمس"ی تەوریزی، کە جەختی لە رێگەی کۆنی ئاینی دەکردو "شێخ حسن" کەرێنمای نوێی بۆ ئەم ئاینە زیادکرد دەمەقاڵێ و رووبەروو بوونەوە رویدا و ئەم دژایەتیە بووە هۆی ئەوەی کە شێخ مەندی میری "حەڵەب"[١٥٨(٤)] و شێخ فخرالدین عراقی بۆ رێکخستەوەی لایەنە ناکۆکەکان بۆ "لالش" بێن و ئەو ناکۆکیەی نێوان تیرەی "شەمسانی" کەسەر بە"شەمس" و تیرەی "ئادانی" کەسەر بە"عودەی"بوو نەهێڵن بەردەوام بێت[١٥٩(٥)]. شێخ حسن بەهۆی ئەوەی بەربەرەکانی "بدر الدين لؤلؤ"ی میری "موصل"ی دەکرد سەرئەنجام ساڵی ٦٤٤کۆچی لەگەڵ چەند موریدێکی لەشاری موصل کوژران.

ئەمەش قەولێکە لە بارەی ((شێخ حسن))ەوە هاتووە:

((قەولێ مەلك شێخ سن))
سلاڤ و سەد سلاڤ
هەی مەلەکێ شرین کەلاڤ

((قەولی مەلیك شێخ سن))
سلاو و سەد سـلاو
هەی مەلەکی شیرین کەلام
(کلام=قسە)

---

١٥٦- هەمان سەرچاوە

١٥٧- ئیزدیاتی، ل١٢١

١٥٨- هەمان سەرچاوە ل١٢٠

١٥٩- هەمان سەرچاوە ل١٢٢-١٢٣

| | |
|---|---|
| يامەلك شێخ حسن! كو باخو شيفەخرێ ئاديا ئەزيم غولام | يامەليك شێخ سن تۆ شانازى ئاديانى منم غولام |
| سلاڤێد مەل مەلك شێخ سنە | سلاوى ئێمە لە مەليك شێخ سنە |
| هەى مێردارۆى مەزنـــــــە | هەى مێـــــــرى مەزنە |
| يا مەلك شێخ سن! ژ هەيبەتا تە دمرن دوژمنە. | يا مەليك شێخ سن! لە بەرزى تۆ دەمرن دوژمنە |
| شێخى منۆ ژ ئاديا | شێخى منى لە ئاديا (ئادانيەكان) |
| ڕيبەرۆ بەر سونيا | ڕێبەرى بەر سونيا |
| يا مەلك شێخ سن! تووێ ل دەرەجا زۆر هێڤيا. | يا مەليك شێخ سن! تۆ لە پلەى زۆر هێڤيا |
| شێخێ منۆ ژ لالشێ | شێخى منى لە لالشێ |
| ژ قەولێ تێ خلاس بون خشێ | لە قەولى رزگاربوون دێ |
| يا مەلك شێخ سن! تو با خۆ شيفەخرێ ئاديا | يا مەليك شێخ سن! تۆى شانازى ئاديا |
| ئەز بەنيێك ژ بەنيا ب تە دژێ. | من بەندەيەكم لەو بەندانەى كە بە تۆ دەژێ |
| شێخێ منۆى تەمام | شێخى منى بەكام |
| ژ گريا تە دگرێت شەرق هەتانێ شام | لە گريەى تۆ دەگرين ڕۆژهەلات هەتا شام |
| يا مەلك شێخ سن! تو با خۆ شيفەخرێ | يا مەليك شێخ سن! تۆ بۆ خۆت فەخرێ (شانازى) |
| ئاديا ئەز غولام. | ئاديا من غولام (خزمەتكار) |
| تو بەحرى ئەز رۆمە | تۆ دەريايى من ڕۆمە (روبار) |
| تو كانى ئەز جۆمە | تۆ كـــــانى من جۆمە (جۆگە) |
| يا مەلك شيخ حسن! تول پاى ئەز ل كۆمە | يا مەليك شيخ حسن! تۆ لە سەرپێى من كۆمە(كەوتو) |
| تۆ بەحرى ئەز كانيمە | تۆ دەريايى من كانيمە |
| تۆ كولەهى ئەز عولێمە | تۆ قەڵاى من بڵـــنديمە |

| | |
|---|---|
| یامەلیك شیخ حسن! تول دەهر ئەز لکویمە | یا مەلیك شێخ حسن! تو لە دونیایی من لە کوێمە |
| تۆ بەحری من شیف | تو دەریایی من شیو |
| تۆ زێری ئەز زیف | تۆ زێری من زیو |
| یا مەلك شیخسن! تو روژی ئەز هەیڤ | یا مەلیك شێخ سن! تۆ رۆژی من مانگ |
| تو شەمسی ئەز قەمەرم | تۆ خۆری من مانگم |
| تو خوندکاری ئەز با بزەرم | تۆ خاوەنکاری من بەندەم |
| یامەلك شیخ سن! تو عالمی ئەز دەفتەرم | یا مەلك شێخ سن! تۆ زانای من دەفتەرم |
| تو عالمی ئەز ریزان | تۆ زانا و من ڕێبەرم |
| تو سواری ئەز چوگان | تۆ سواری من چۆگانم |
| یا مەلك شێخ سن! تۆ گۆی کەری ئەز گۆمە | یا مەلیك شێخ سن! تو پالەوان من مەیدانم |
| تو ئەلفی ئەز رۆمە | تو ئەلفی من ڕێـــمە (پ) |
| تو سواری ئەز کاشۆمە | تۆ سواری من پیادەمە |
| یا مەلك شێخ سن! تو گوی کەری ئەز مەیدان | یا مەلیك شیخ سن! تۆ گۆ من مەیدانم |
| تو ئەلفی ئەز لۆقەنم | تۆ ئەلفی من لۆغەتم |
| تو خالقی ئەز تەربیەتم | تۆ ئافریندەی من پەروەردەتم |
| یا مەلك شێخ سن! تۆ فەرزی ئەز سونەتم | یا مەلیك شێخ سن! تۆ فەرزی من سونەتم |
| تو ئەلفی ئەز بێمە | تۆ ئەلفی من بێمە |
| تو باجێری ئەز ڕێمە | تۆ شاری من ڕێمە (ڕێگا) |
| یا مەلك شیخ سن! ناڤ و دکارێد تەد مەعنێنە | یا مەلیك شێخ سن! ناو و یادی تۆ پر مەعنایە |
| تو باجێری ئەز سوك | تۆ شاری من سۆك(بازار) |
| تو مفتەهی ئەز سندروك | تو کلیلی من سندرۆك(صندوق) |
| یا مەلك شیخ سن! توی مەزنی ئەزی پچوك | یا مەلیك شیخ سن! تۆی مەزنی منم پچوك |
| تو بابی من پسم | تۆ بابی من پسم (کورم) |
| تو مکەهی ئەز قودسم | تو مەکەی من قودسم |

| | |
|---|---|
| يا مەلك شيخ سن! تو ميرى ئەز مەجلسم | يا مەليك شيخ سن! تۆ ميرى من مەجليسم |
| تو ميرى ئەز هەڤال | تۆ ميرى من هەڤال |
| لمن تاجرى ئەز دەلال | لەمن تاجرى من دەلال |
| يا مەلك شێخ سن! تو سوكى ئەز سەدال | يا مەليك شێخ سن! تۆ سوكى من سؤال (پرسيار) |
| تو خنى ئەزى درێژ | تۆ غەنى(دەولەمەند) من درێژ(گەدا) |
| تو مەلحەمى ئەزى رێژ | تۆ مەلحەمى من سارێژ |
| يا مەلك شێخ سن! ناڤ و دكارێد تە (زكرياتە) | يا مەليك شێخ سن! ناو و يادى تۆ زكرياتە |
| دبم هاوێـــــــژ | دەبم هاوێـــــــژ |
| زێو..... تو لالشى | من زەويم.......... تۆ لالشى |
| مەكەهێ تۆ بەرى رەشى | مەكە تۆى بەردى رەشى |
| يا مەلك شێخ سن! لمالدارا تو مال تژى | يا مەليك شێخ سن! لە ماڵداران تۆ مال تژى(پرى) |
| تو هۆصـطايى ئەز كتێب | تۆ ئۆستادى من كتێب |
| بخونە هەكە تێ هەيە عێب | بخوێنە هەكە تێيدابێ عێب(هەڵە) |
| يا مەلك شێخ سن! چێكرن باتە نەعەجيب | يا مەليك شێخ سن! چاكردن لەگەڵ تۆ نەعەجيبە |
| بخۆنە سەرانســـــەرە | بخوێنە سەرانسەر |
| هەكە عێبەك تى هاتەدەرە | ئەگەر هەڵەى لێهاتەدەر |
| يا مەلك شێخ سن! چێكرن باتە فەرە | يا مەليك شێخ سن! چاكردن لەگەڵ تۆ فەرزە |
| تو هوصطايى ئەز بنيات | تۆ وەستاى من بنيان (خانو) |
| تو خەتيبى ئەز جڤات | تۆ خەتيبى من جڤات |
| يا مەلك شێخ سن! تول حەمدى ئەز تەحيات | يا مەليك شێخ سن!تۆ لەحەمدى من تەحيات |
| تۆ عالمى ئەز عەمەلم | تۆ زاناى من كارم |

تۆ میڤانی ئەز مەنزلم        تۆ میوانی من ماڵم

یا مەلك شێخ سن! ل ناڤ و دکاریێ تەی کاملم        یا مەلیك شێخ سن! من بەناو و کرداری تۆ کامڵم

ژ کەسا ماتو کەسی        لەناو کەســـان تۆمان کەسی

ژ وەلی یا ماتو پسی        لەوەلیانمان تۆ پسی (کوڕی)

یا مەلك شێخ سن! هەم تو روحی هەم تو نەفەسی        یا مەلیك شێخ سن! تۆ روحی و تۆ نەفەسی

ژ نەفسا تو سوری        لە نەفسا تۆ سوری (وێنە)

ژ هۆریا تۆ حوری        لە حۆریان تۆ حۆری (فریشتە)

ژ صەدەفا تو دوڕی        لە سەدەفدا تۆ دوڕی

ژ دورا تو صەدەفی        لە دوڕدا تۆ سەدەفی

ژ قورانا تو ئەلفی        لە قورئاندا تۆ ئەلفی

یا مەلك شێخ سن! ژ سوندا تو بۆمە مەصحەفی        یا مەلیك شێخ سن! لەسوێندا تۆ مەسحەفی (کتێبی ئاینی)

ژ دەستای ئەمینی        لە دەستا ئەمینی

قورئانا تۆ یاسینی        لە قورئاندا یاسینی

بەحرێد گران دمەینی        دەریایی گران دەمەینی

تو بۆمە مەسەب و دینی        تۆ بۆ ئێمە مەزهەب و دینی

یا مەلك شێخ سن! خۆزماوی روحی توبدەی و نەصطینی        یا مەلیك شێخ سن! خۆزگەم بەو ڕوحەی تۆ دات و نەستینی

بزۆر دەرەجا گەهینی        بەزۆر پلەی دەگەێنی

صەحی تو مەلك سنی        راستی تۆ مەلیك شێخ سنی

مێردارەکی مەزنی        مێرێکی مەزنی

بینایا چاڤێ منی        بینایی چاوی منی

سونەت ناڤێ شێخادی مەلك شێخ سن سکنی        سونەت بەناوی شێخادی، مەلیك شێخ سن دەمێنی

**سجادین (سراج الدین):**

ابو الثنا محمود کوری ابو بکر احمد أرموی، لە ٥٩٤ کۆچی لە "ئورمی" لە دایك بووە، لەویّ خوێندی، ماوەیەکیش لە موصل و دیمەشق ژیاوە، دواتر بەرەو ئاسیای بچوك رۆشت و لە شاری "قۆنیە" جێگیربوو پایەی "قاضی القضات" بەدەست هێنا، لە زانستەکانی "منطق و حدیث و فقە و تفسیر و حکمت"دا زۆر شارەزابوو، گەورە پیاوانی شار هاتووچۆیان دەکرد[١٦٠]، شایەنی باسە ئەو کاتەی "مەولانا" لە دوری شەمسی تەوریزی بێتاقەت بوو سەری لە چەرخ دەسوو، هۆنراوەو غەزەلی دەوت، بە سەختی سماع و سەمای دەکرد، ئەهلی فقە و توندرەوانی "قۆنیە" پێیان ناخۆش بوو، بۆلای قاضی سراج الدین هاتن و رەفتار و گۆرانی مەولانایان بۆ باسکردو دەردە دڵیان کرد، قاضی لە وەڵامی ئەواندا ووتی: ئەم پیاوە لەلایەن خوداوە پشتگیری دەکرێت، لە گشت زانستە دیارەکاندا بێهاوتایە لەگەڵی تێمەکەون[١٦١].

شایەنی باسە سراج الدین جگە لە ئەهلی شەریعەت لەگەڵ ئەهلی تەریقەت و تەسەوفیشدا نێوانی خۆش بوو. پاش ماوەیەك لەگەڵ "مەولانا" دۆستایەتی پەیداکرد، ساڵی ٦٥٥ کۆچی کتێبی پارسی (لطائف الحکمة)ی بەدووبەش نوسی، لە بەشی یەکەمدا لێکۆڵینەوەی لە باس و ووتەی زانایاندا کردووە و لەبەشی دووەمیشدا باسی خۆ پەروەردەکردن "تهذیب" و راوێژی شوێن و سیاسەتی شارانی کرد، پەرتووکێکی دیکەی بەناوی "مجمل الحکمە" بە زمانی "فارسی"ە و ئێستا لەبەردەستدایە.[١٦٢]

کاتێك قرمەکان لە ئەرمەنستانەوە پەلاماری ئاسیای بچوکیاندا، گرفت و تاڵانیان لەو شارانەدا نایەوە "شاری قۆنیە"ش بێبەش نەبوو، سراج الدین لە بەرگری کردنی ئەو شارەدا رۆڵێکی باشی گێرا، پیاوێکی بە عیزەت و بەرێزبوو بەدرێژای ژیانی پەیوەندی باشبوو لە کاروباری دەولەتیشدا بێ وێنەبوو کۆری دەرس و دەورێشیی هەمیشە گەرم

---

١٦٠- صفاء تأریخ ادبیات در ایران ب٣، بەشی٢، ل١٢٢١

١٦١- زندگانی مولانا جلال الدین محمد ل٨٠-٨١

١٦٢- صفاء تاریخ ادبیات در ایران، ب٣، ل١٢٢١-١٢٢٣

بوو، سەرئەنجام ساڵی ٦٨٢ کۆچی هەر لەوێ سەرینایەوە. ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی ئەوەی کە "سراج الدین"ی ئەرمەوی لەریزی شێخانی ئێزیدی ناوببرێت و بەهەمان "سەجادین" بزانرێت، بریتین لە:

١. سەبارەت بەکات هیچ گومانێك نیە چونکە هاوسەردەمی ئەبوبەکر زەمیلەچن و شەمسی تەورێزی و فخرالدین عراقی بوە، ٥٩٤ لەدایك بووە و ٦٨٢ کۆچی مردووە.

٢. بە درێژای ژیانی لەوناوچە و شارانە ژیاوە کە جێگەی ئێزدیەکان یان جێگەی مانەوەی زانا دارێژەرەکانی ئەوان بووە، ئایا دەشێت لەم دیارە نامۆیەی شام و قۆنیە لەگەڵ مەزنە پیاوانی وەکو شەمس و هەتا فخرالدین عراقی پەیوەندی نەبووبێت؟ بەتایبەتی لە "قۆنیە" ئەم سێ زانایە لەگەل "مەولانا"دا دۆست بوون

٣. لە وێردێکی ئێزدیاندا کە بە "بەیتی جوندی" بەناوبانگە ئاوا هاتووە:

| | |
|---|---|
| کوفی تەبی گرانە | سەربەندی تۆ گرانە |
| فری چۆ بووە عەزمانە | فری چووە ئاسمانە |
| لە عەرشان دەوران دانە | لە عەرشان لە سوڕانە |
| میر سجایێ سجانە | میر سجا زیندان دانە |
| ناسردین بابانە[١٦٣] | ناسرەدین لە مەزنانە |

## فخرالدین عێراقی:

سعید نفیسی و زرین کوب لەبارەی ناوو بنەچەی ئەم هۆنەرە ئێرانیەوە ووتویانە: فخرالدین ابراهیم کورێ بزورگمهری کوری عبدالغقاری هەمەدانی عێراقیە[١٦٤]. لە گوندی "کەمچان"ی دەوری شاری هەمەدان لە بنەماڵەیەکی ئەهلی زانست بەدنیا هاتووە. لە

---

١٦٣- ئێزدیاتی، ل٦٨

١٦٤- کلیات فخرالدین عراقی. بتحقیق سعید نفیسی ص٥ و دنبال جستجو در تصوف ایران ل١٤٣—١٤٥

منداڵیدا قورئانی لەبەرکردوە و بە دەنگێکی ناوازە خوێندویەتی،[165] دواتر دەستی داوەتە خوێندنی زانست و پێش ئەوەی بۆ "مۆڵتان"ی هیند بروات، چەند سەفەری بۆ بەغداد و شام کردووە لەو کاتەدا تووشی رارایی و بێ هیوایی بووە، لە بێزاریدا ملی رێگەی هندستانی گرتەبەر. سعید نفیسی نوسیوەتی فخرالدین ساڵی ٦٤١ بە خزمەت شێخ بهاء الدین و زکریای مولتانی دامەزرێنەری تەریقەتی سەهرەوەردی گەیشتووە، بەڵام زرین کوب ساڵی ٦٤٩ی داناوە. وا گومان دەبرێت عێراقی رێك لەگەرماو گەرمی کوشتنی شێخ حسن کوری عودەی دووەمدا ٦٤٤ی کۆچی دا بۆ هندستان چووبێت، چونکە مۆڵتان زۆر پێشتریش سەنتەری چالاکی کەسایەتی وەکو "حەلاج" بووە، فخرالدین عراقی ماوەیەکی زۆر لە بنەماڵەکەیان دابرا، چەندجار نامەی بۆ شمس الدین احمدی برای ئەنوسی بەلام وەلامی نەئەدایەوە، دوای کۆچی دوایی شێخ بهاءالدین زکریاڀی مۆڵتانی ٦٦٤ کۆچی عیراقی بە نیازی سەردانی باوکی گەرایەوە کە هەواڵی مەرگی باوکی زانی، سەری لە ماڵی خۆیان نەدایەوە، ئایا سەرنەدانەوەکەی لە ماڵەوە پرسیارێکی سەرنجراکێش نیە؟ لە مۆڵتانەوە لە رێگەی "عمان"ەوە بەرەو مەکە رۆشت، پاش سەردانی کەعبە بەرەو ماڵ بەرێکەوت چونکە هەواڵی مەرگی باوکی بیستبوو، کەلکەڵەی "قۆنیە"ی کەوتەسەری کاتێ گەیشت، بینی مەولانا سەرگەرمی رێکخستنی مثنوی مەعنەوی بوو، صدرالدین "قۆنیە"یی زانای چەرخی حەوتەمی ئێرانیش خەریکی راپۆرت و ووتنەوەی پەرتووکی "فصوص الحکم"بوو، مەزنانی شاری قۆنیە رێزێکی زۆریان لە فخرالدین عراقی گرت و بۆ کۆری "صدرالدین قونیەیی" پێشوازیان لێکرد، ئەو زانا مەزنەش رێزی لێگرت.

سەرئەنجام بە ئاماژەی مەولانا و بەهەوڵی معین الدین علی کوری سلیمان پەروانەی وەزیری قلێچی چوارەمی سەلجۆقی، لە تۆقات خانەقایەکیان بۆ درووست کرد.

عـراقیش وەکـو شەمسی تەورێزی رێکارێکی تایبەتی خۆی هەبوو، رووخۆشی و قەلەندەری لەودا بەدی دەکرا. دوای کوژرانی معین الدین پەروانە کەرەنگە لە ساڵی ٦٧٥

١٦٥- نفحات الانس، ل٦٠١

کۆچیدا بووبێت بەرەو میصر ڕۆشت و بووە جێگەی ڕێزی فەرمانرەوایانی ئەوێ و شێخی شیخانی پێبڕا بەڵام کە هەستی بەبێ ڕێزی کرد ڕێگەی شامی گرتە بەرو لە دیمەشق "کبیر الدین"ی کوڕیشی شوێنی کەوت.

ساڵی ٦٨٨ کۆچی بەهۆی نەخۆشیەوە لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد، لە گەرەکی "صالحیە"ی دیمەشق لە نزیك گۆری زانای گەورەی سەدەی حەوتەم شێخ محی الدین العربی بە خاکیان سپارد. فخرالدین عراقی نامەیەکی بەناوی "لمعات" لەبارەی راپۆرتی بیروزانستەکانی ابن العربی و بە سەرنجدانی نامەی (سوانح)ی شێخ احمد غزالی برای محمد غزالی توسی دانا.

لە ئێستادا قەولێك، قەسیدەیەك کە بدرێتە پاڵ فخرالدین عراقی لە نێو ئیزدیەکاندا بەردەست نیە بەلام ئیزدیەکان ئەو بە هۆنەرێکی تەڕ دەست و خۆش ئاواز دەزانن و نازناوی قەواڵی شیخادیان لێناوە و لەفریشتە پیرۆزەکان دادەنرێت (لەبەشی باوەری ئیزدیەکاندا باسی دەکەین)، وەکو باسمانکرد لە ئاشتکردنەوەی (شێخ حسن کوری عودەی دووەم و شەمس) دا رۆلی هەبووە، لە قەولێکدا کە ستایشی (شێخ حسن، دا باسکرا بەهی ئەوی دەزانن، هەتا رادەیەکیش لایەنی "شێخ حسن"ی گرتووە و لە چەند قەولی جیاوازی ئەو ئەم یادەی هاتووە:

**چـێ بـازیەکی ب نـۆرینە ــــ چـێ بازێـکی بـە نۆرینە**

**فـری چـۆ عـەزمێنە ــــ فـڕی چـوە ئـاسمێنە(ئاسمان)**

**من نەدزانی سۆرا مەلك فـەخرەدینە[١٦٦] ــــ نەمزانی وێنەی مەلیك فـەخرەدینە**

گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە "فخرالدین عراقی" لە ریزی شێخانی ئیزدیەکان دا دەنرێت، بریتیە لە:

١. فخرالدینی شیخی ئیزدیان هاوسەردەمی شیخ حسن کوری عودەی دووەم بووە کەلە ساڵی (٦٤٤کۆچی)دا کوژرا، لە قەولێکدا کە فخرالدین بۆ (شیخ حسن)ی ووتوە،

---

١٦٦- ئیزدیاتی، ل١٤٤

دەردەکەوێت فخرالدین لە شێخ حسن بچوکتر بووە، چونکە لەوێدا دەڵێت: تۆ باوك و من کور و ساڵی لەدایك بوونی شێخ حسن (٥٩١ کۆچی)ە و بەپێی ووتەی جێی بروا فخرالدین عراقی ٦١٠ لەدایك بووە.

٢. شێخ فخرالدینی ئیزدی هونەرێکی خۆش ئاوازبووە و "فخرالدین عراقی"یش هۆنەرو دەنگ خۆش بووە.

٣. سەفەرە زۆرەکانی "عراقی" بەتایبەتی پێش رۆشتنی بۆ هندستان و ئاشنابوونی بە شەمسی تەورێزی و رۆشتنی عراقی بۆ لالش، یەکێك لە سەنتەرە گەورەکانی تەسەوفی ئەو کاتە پشتگیریەکی دیکەیە.

٤. رەفتارو شێوە سەربەستیەکەی فخرالدین و دووری و فەرامۆشکردنی لەلایەن بنەماڵەکەیەوە بوونی پەیوەندی ئەو لەگەل لالش بەهێز دەکات.

٥. لەنێو ئیزدیەکاندا تیرەیەك بەناوی "قاتانی"وە هەیە، رەنگە ئەو تیرەیە بۆ سەر "تۆقات" بچنەوە، چونکە ئیزدیەکان پاشگری "ئانی" بۆ ناو زیاد دەکەن، "شەمس" دەبێت بە "شەمسانی" و "تۆقات" دەبێت بە "تۆقاتانی"، بەڵام بەهۆی دووپیتی یەکەمی "تۆقات"، "تو"ە کە مانای "تف" دەبەخشێت و لەلای ئەوانیش "تو=تف" کردن ناشرین و نەگونجاوە، لەبەرئەوە دووپیتی یەکەم لادەبەن و "قاتانی" دەمێنێتەوە، بۆ بیرخستنەوەش خانەقای تۆقات تەکیەگای فخرالدین عراقی بووە.

### شیروانشاکان:-

لەبابەتی ناونانی ئیزدیەکاندا باسکرا نەوەکانی یزیدی کوری مزید بە تێپەرینی کات ناسنامەی "عەرەبی" خۆیان لەدەستداو لەژێر کاریگەری ناوچەی "ئاران"دا خۆیان بۆسەر "ساسان"یەکان بردەوە.

وەکو باسکرا لە ساڵی "٤٢٥کۆچی"دا مەنوچەهری کوری یزیدی کوری احمد بەپیلانی هاوسەرەکەی کە کچی فضل شدادی بوو، بەدەستی براکەی خۆی "ابو منصور علی فرید" کوژرا، ئیتر دەوڵەتی "شەروان"ی گرتەدەست و براژنیشی مارەکردەوە.

دوای ابو منصور علی، قوبادی برای (٤٣٥-٤٤١کۆچی)، دوای ئەو برازاکەی بەخت نصر علی کوری احمد (٤٤١کۆچی) حکومەتی گرتەدەست، دوای ئەویش سالاری مامی (٤٤١-٤٤٥) تەختی بەدەست کەوت، دوای ئەو کورەکەی فریبرز کەپیاوێکی شایستە و کارساز بوو هات، سالّی ٤٥٩ کە ئەلپ ئەرسەلانی سەلجوقی هێرشی بۆسەر "ئاران" هێنا، فەریبورز بە دیاری و خەلاتەوە بەرەو رووی چوو، ئەویش ئەوی لە شوێنی خۆی هێشتەوە، هەتا کاتی مەلیك شای سەلجوقی فەریبورز باجدەر و وابەستەی ئەو بوو، سکەی پارەی فریبورز کە بۆ دەورەی مستظهری عباسی (٤٨٧-٥١٢) کۆچی دەگەرێتەوە لەبەردەستدایە.

ئەفریدون ملکور کوری فەریبورز سالّی ٥١٤ی کۆچی لە جەنگی خەلکی (دەربەند)دا کوژرا و جێنشینی فەریبورز بە ئاشکرا دیار نیە.

شایەنی باسە لە سەردەمی فریبوز یە دوواوە شەروانشاکان بە زنجیرەی خاقانەکان ناویان رۆشت خاقانەکان لە دوو چینی خوارەوە پێك هاتووە:

__چینی یەکەم:__ لە فریبورزەوە (٤٥٥ کۆچی) دەستپێدەکات و بە "هۆشەنگ"ی کوری کاوس (٧٧٤-٧٨٤) کۆتایی پێدێت. منوجهری کوری ئەفریدون کوری فریبورز لە بەناوبانگترین خاقانەکانی ئەو چینەیە و بە خاقانی مەزن بەناوبانگە، لە لایەن "ابو العلاء گنجوی"ەوە شیعری پێدا هەلّدراوە. منوچهر کچی پاشای گورجستانی هێنا و کورێکی بەناوی (ئەخستان) لێبوو، دوای مەرگی منوچهر هاوسەرەکەی بۆ گورجستان گەرایەوە و بوویە راهبەو لە "٥٥٥کۆچی"دا مرد.

دوای هاتنەسەر کاری "ئاخستان" و تا نزیکەی سەد سالیش شەروان سەربە گورجستان بوو، پادشای گورجستان خۆی بە شاروانشایی زانیووە. شایەنی باسە ئێستاش کۆمەلێك لە ئێزدیەکان لە گورجستان دەژین.[١٦٧]

---

١٦٧- أقوام مسلمان اتحاد شوروی، ترجمه محمد حسین آریا ل٣٦١

لە سەردەمی ئێلخانیەکاندا شەروان سەربە گورجستان بووە، ساڵی "٧٨٤ کۆچی" هۆشەنگی کوری کەیکاوس کوری کە یقوباد بەدەستی پەیرەوانی خۆی کوژرا و ئیتر دەوڵەتی ئەم چینەی زنجیرەی خاقانەکان کۆتایی هات.

## چینی دووەمی زنجیرەی خاقانەکان:-

چینی دووەمی زنجیرەی خاقانەکان لە شێخ ابراهیم کوری محمد (لە ئامۆزاکانی هۆشەنگی کوری کەیکاوس)ەوە دەست پێدەکات. شێخ ابراهیم ساڵی ٧٩٧ کۆچی پەیوەندی بە ئەمیر تەیمورەوە کرد، ساڵی ٨١٥ "قەرە یوسف"ی تورکمانی پەلاماری داو "شێخ ابراهیم"ی تەنگەتاو کرد، قسطنطین فەرمانرەوای "گورجستان" بەدەنگیەوە هات لەشەرەکەدا قسطنطین کوژراو "شێخ ابراهیم"یش بە دیلی گیرا، دواتر قەرە یوسف لەبەرامبەر پارەیەکی زۆردا شێخ ابراهیمی ئازادکرد. ئایا ئەم "شێخ ابراهیم خورستانی یان خراسانی"[١٦٨] یە نیە کەلای ئیزدیەکان ناوی "دەرویش ئادەم"ە و یەکێك لە موریدەکانی شێخادیە و شێوەیەکی ئەفسوناویان پێبەخشیووە ونەوەبەنەوە رابەری ئاینی ئەمارەتی دنیایێ "ئیزدیان"یان گرتۆتەدەست.

دوای شێخ ابراهیم خلیل الله کوری جێگەی گرتەوە، (٨٢٥-٨٦٧ کۆچی)، ئەسکەندەر قەرە قۆنیلۆ پەلاماری دا، دوای تاڵان و برۆیەکی زۆر بۆ ئازاربایجان گەرایەوە.

لەدوای ئەم هێرشەوە شاهرۆخ میرزا کوری تەیمور گورگانی (خلیل الله)ی دەپاراست، ئەم رێککەوتنە ئارامی خستە ناوچەی "شەروان"ەوە، فەرەخ یار کوری خلیل الله جێنشینی باوکی بوو لە ساڵی (٨٦٧-٩٠٦)کۆچی فەرمانرەوای کرد، بەداد و دوور ئەندێش بوو، لەسەردەمی ئەودا سولتان حیدری سەفەوی پەلاماری (شەروانی)ی دا بەلام مایەپوچ بوو خۆی کوژرا.

---

١٦٨- خرسان ناوی شارۆچکەیەکی "ئاران"ە

شا اسماعیل سەفەوی کوری لەتۆڵەی خوێنی باوکیدا هێرشی بۆسەر "شەروان" هێناو فەرەخ یاری باوکی کوشت، وەکو پێشتر باسمان کرد شـا اسماعیـل هێنـدە دەمـارگیربوو تاڵانی "ئاران"یەکانیشی بە گلاو دادەنا.

دوای ئەم هێرشە شەروانشاکان بوونە پاشکۆی سەفەویەکان وساڵی ٩٠٧کۆچی بەهرام بەگ لە جێگەی فەرەخ یاری بارکی فەرمانرەوایی گرتەدەست ودوای ئەویش غازی بـەگی برای شەش مانگ دەوڵەتداری کرد ساڵی ٩٠٨ بەدەستی "محمودی" کوری خۆی کـوژرا. لەبەرئـەوەی "محمـود" حـەزی لەسـتەمکاری بـوو دەسـەلاتەکەی درێـژەی نەکێشـا و دانیشتوانی شەروان داوایان لە شێخ براهیم کوری فەرەخ یار ناسراو بە "شێخ شاه" کـرد کەلە "گەیلان" بوو، بێت بە هانایانەوە ساڵی "٩٠٨-٩٣٠"کۆچی دەسەلاتی گرتەدەست و لەگەل شا اسماعیل بە ئاشتی بردیەسەر، دوای ئەو خلیل الله کـوری (٩٤٢) هاتـە سـەر تەخت و یەکێك لە کچەکانی "شا اسماعیل"ی هێنا، دوای خلیل الله شارۆخ کوری فـەرەخ کوری شیخ شاه لەساڵی ٩٤٢ فەرمانڕەوای پێبرا، لەسەردەمی ئەم شەروانشـایەدا "شـاتە هماسپ"ی سەفەوی "شەروان"ی بەئێرانەوە لکان.

کە "سولتان سلیمان" ی عوسمانی لە "٩٥٥ ی کۆچـی" دا پـەلاماری ئازربایجـانی دا برهان علی کوری سولتان خلیل الله پەیوەندی پێوەکرد و بە هاوکاری ئـەوان "شـەروان" ی لـە سـەفەویەکان سـەندەوە و هـەتا ٩٥٨ کۆچـی بـە پشـتیوانی عوسمانییـەکان فەرمانرەوایی کرد. دیسانەوە قزلباشەکان هێرشیان بۆ سەر "شەروان" هێنایەوە، برهان علی پەنای بۆ داغستان برد[١٦٩].

شایەنی باسـە لقێك لـە شەروانشـاکان لـە بەشـێك لـە ئەیالـەتی "وان" دەولەتـداریان کردووە گوایە باوانی ئـەم لقـەیان لـە لایـەنگرانی سـولتانە ئەیوبیـەکان بـوون و دوای لـە ناوچـوونی دەوڵـەتی ئـەیوبی لـە میسـر وشـام "٦٦٢ کۆچـی" هـاتوون لـە "وان"

---

١٦٩- ئەیوبیەکان، بنەماڵەیەکی هۆزی "رەوادی"ن، کەشەدادیەکانیش لقێکی ئەم هۆزەن ولەسوڵتانەکانی ئەم بنەماڵەیە سەلاحەدینی ئەیوبی "٥٨٩کۆچی"ە بەجەنگەکانی خاچ پەرستانەوە زۆر بەناوبانگبووە.

فەرمانڕەواییان کردووە[170]. هەتا کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانیەکان دەستەڵاتی ناوچەی "وان"یان بەدەستەوە بووە و سەربە دەوڵەتی عوسمانی بوون، ئێستاش هەندێك لە هۆزە کوردەکان بە (شەروانی) ناودەبرێن و شاروناوچەی جیاوازیشیان بەو ناوەوە هەیە.[171]

## میرانی جزیرە:

جزیرە یەکێك لە شارە کوردنشینە کۆنەکانە، ئارامیەکان ئەویان بە گزرتاکردو ناوبردووە، لەسەردەمی خەلافەتی "عمر"دا داگیرکرا، ئێستا بەشێکە لە تورکیا و لە خوارووی رۆژهەلاتیدایە[172]. هەرلەکۆنەوە بەدەست میرە کوردەکانەوە بووە، یەکەمین کەسێك لەباوانی ئەوان کەدەسەلاتی گرتە دەست، سلیمان کوری خالدی ناوبووە.

شەرەفخانی بەدلیسی باسی ئەوە دەکات کەماوەیەك دەسەلاتدارانی جزیرە پەیرەوی ئاینی "ئیزدی" بوون و دواتر موسڵمان.[173] بەلام نالێ تاکەی لەسەر ئاینی ئیزدی بوون؟ کام میری جزیرە ئیزدی بووە؟ لەبەر ئەوە بەکورتی لەم باسە دەدوێین، لەنێوان بەرەی (میر حاجی و میر ئەبدالێ)دا دەسەلاتەکانی باوکیان دابەشکرد و ووردە ووردە ئەم بنەماڵەیە بەسەر سێ لقی (عەزیزی، بەدری، عەبداڵی) دابەشبوون.

بنەماڵەی عەزیزی کاروباری جزیرەیان کەوتەدەست، کاتێك کە سەلجوقیەکان لەناوچوون میر عزالدین کوری بدرالدین کوری عیسی کوری مجدالدین کوری میر عزیز فەرمانڕەوای جزیرە بوو، کە تەیموری لەنگ هێرشی هێنا، میر عزالدین بەژیری و راوێژی خۆی توانی میرایەتیەکەی لە گێچەل و جەنگی ئەو بپارێزێت، بەلام پاش ماوەیەك لە گەڵی تێکچوو، ئیتر پەلاماریدا و ئەمارەتەکەی داگیرکرد، لەدوای تەیمور کورانی میر عزالدین میرایەتیەکەی خۆیان بەدەست هێنایەوە و چاکی مەردایەتییان لە ئاوەدانی وولاتدا بەست و هەتا چەرخی نۆزدەیەم میرایەتیەکەیان بەردەوام بوو.

---

١٧٠- شەرەفنامە ل٢٨٩-٣٠٠

١٧١- بیشتر موارد بحث شروانشاها از فرهنگ مصاحب ل١٢٦٩-١٢٧٠پوختەکراوە

١٧٢- هەمان سەرچاوە

١٧٣- صفی زادە، صلاح الدین ایوبی ل١٢٠.

لقی "بەدری"ش هەتا ۱۰۰۵ کۆچی ئەمارەتی "گورگیل"[١٧٤]یان بەدەستەوەبوو لەوە بە دوواوە ئاگاداری پێوستیان لەبەر دەستدا نیە.

لقی "ئەبدالّ"یش لە "فینك"[١٧٥] ئەمارەتێکیان هەبوو، فەرمانرەوایی ئەم لقە هەتا سەردەمی سولتان سلیمان قانونی (عوسمانی)[١٧٦] بەردەوام بوون و دواتر کەوتنە سەر ئەمارەتی جزیرە.

## میرانی کلیسی:

لە شەرەفنامەی بەدلیسی دا هاتووە: کۆمەڵێك لە کوردانی ئیزدی دانیشتوی "ئەنتاکیە"[١٧٧]، کەوتنە ژێر فەرمانی "مەند"ی فەرمانرەوای کوردەکانی (حەلەب و شام)ەوە کەلەلایەن ئەیوبیەکانەوە دانرابوو، لەسەرەتای دەسەلاتی "مەند"دا هەندێك لە ئیزدیەکان بەرهەڵستیان دەکرد بەڵام سەرئەنجام توانی گوێرایەلیان بکات.

لەدوای لەناوچوونی ئەیوبیەکانیش "٦٥٨کۆچی"، بنەماڵەی "مەند" لە فەرمانرەوایەتی بەردەوام بوون بەڵام دواتر چەرکەسەکان[١٧٨](١) توانیان هەندێك لە ئەمارەتە ئیزدیەکان بەلای خۆیاندا رابکێشن و شاری حەلەب داگیربکەن، دوای هاتنەسەرتەختی "سولتان سلیم"ی عوسمانی و داگیرکردنی شام و میصر لەلایەن ئەوانەوە، ئەمارەتی کوردەکان بۆ "عزالدین"ی فەرمانرەوای جزیرە مایەوە. بەڵام کە "سولتان سلیمان"ی عوسمانی خەلافەتی گرتەدەست دوبارە فەرمانرەوایی حەڵەب بۆ بنەماڵەی "مەند" گەرێنرایەوە[١٧٩].

---

١٧٤- گورگیل: کەوتۆتە خوارووی رۆژهەلاتی تورکیای ئێستاوە.

١٧٥- شەرەفنامە، ل١٥٨.

١٧٦- فینك: ئێستا شارۆچکەیەکە لە نزیك شاری جزیرە.

١٧٧- ئەنتاکیە: شارێکە لە خواروی رۆژئاوای تورکیا لە سەر سنوری سوریایە

١٧٨- گەلێك کەلە کۆندا لەباکوری رۆژئاوای قەفقاس و کەناری رۆژهەلاتی دەریای رەش ژیاوون، زۆربەیان بۆ تورکیا و سوریا هاتون.

١٧٩- شەرەفنامە، ل٢٨٧-٢٨٩

## ئەمارەتی سۆران:

ئەمارەتی سۆران "هەولێر و کەرکوك وموصل"یشی دەگرتەوە هۆزێك لە کوردانی ئەوێ بەناوی "عزالدین شێر" لە باوانیەوە پشتاوپشت فەرمانرەوایی دەکرد، ساڵی ٩٤١کۆچی کە سولتان سلیمان "بغداد"ی داگیرکرد لە گەرانەوەدا رووی لە ئەمارەتی سۆران کرد، کاتێك سولتان بەخۆی و سوپایەکەیەوە لەلای عزالدین شێر میوان بوو، عزالدین شێر بەرامبەر دەستوپێوەندەکانی سولتان بەدرەفتاری نواند، سولتان لە عزالدین شێر توورەبوو و کوشتی. ئەمارەتەکەی بە حسێن بەگی داسنیێ، کەیەکێك لە میرزادەکانی ئیزدی بوو بەخشی حسێن بەگ دەستی تەماحی لەگەڵ فەرمانرەوایانی (سۆما)[١٨٠] تێکەل کرد. لەتاوا میرسیف الدین پەنای بۆ ئەردەلانیەکان برد، پاش ماوەیەك میرسیف الدین بەرەو "ئەمارەتی سۆران" هاتەوە، کۆمەڵێك خەلکی لەخۆی کۆکردەوەو بەپیلانێك شاری "هەولێر"ی داگیر کرد و ئیزدیەکانی لەوێ دەرپەراند، "حسێن بەگ" چەندجار هەولّیدا ئەو قەڵایە بگرێتەوە بەلام نەیتوانی، سولتانی عوسمانی لە بێتوانایی حسێن بەگ توورە بوو بانگ کرا بۆ ئاستانە و کوشتیان[١٨١].

## میرانی مەحمودی:

بەپێی گێرانەوەیەك میرانی مەحمودی و میرانی جزیرە خزمایەتیان هەیە، قرە یوسف قەرەقونیلو، شێخ محمود ناوێکی بنەچەی ئەم میرانەی لەخۆی نزیك کردەوە، زیرەکیەکەی سەرنجی راکێشاو سەرپەرشتی ناوچەی "ئاشۆت و خۆشاب"ی سەربە پارێزگای "هەکاری" پێسپارد. کوردانی ناوچەکە لە دەوری کۆبوونەوەو بەتیرەی "محمودی" ناویان رۆشت.

---

١٨٠- سۆما لە پارێزگای ئازربایجانی رۆژئاوایە

١٨١- شەرەفنامە، ل٢٥٥–٢٥٨

دوای ئەو حسێن بەگی کوری کاروباری ئەمارەتەکەی گرتەدەست و توانی فراوانی بکات، دوای ئەوەی لە جەنگێکدا کوژرا "میرحامد"ی کوری جێگەی گرتەوە و گوێرایەڵی سەفەویەکان بوو. ئینجا عوض بەگی کوری میر صامد میرایەتی (خۆشاب" و تیرەی مەحمودی گرتەدەست، لەلایەن (شا اسماعیل)ەوە لە "قەلای وان"دا زیندان کرا. بە هاوکاری "میری بەدلیس" ئازادکرا.

ئیتر خۆی بە دەوڵەتی عوسمانیەوە گرێدا، دوای ئەو حسێن علی بەگی کوری هات، دواتر لایان برد و لە "دیاریەکر" مرد. بایندروی کوری لە "خۆی" قەلایەکی بە هێزی بەدەستەوە بوو. بەلام مامی کەناوی شاعەلی بەگ بوو لە لایەن "شا تەهماسب"وە سەرپەرشتی تیرەی محمودی پێسپێرا و دواتر حسن بەگی کوری عوض بەگ کوری میر حامد جێگەی گرتەوە.

لە شەرەفنامەدا هاتووە میرانی مەحمودی هەتا هاتنەسەر تەختی "حسن بەگی کوری عوض بەگ"یش پەیرەوی ئاینی ئیزدی بوون، ناوبراو یەکەم میر بووە داوای لە دانیشتوانی ئەمارەتەکەی کردوە نوێژ و رۆژ و حەج و زەکات ئەنجام بدەن و ئەندامانی بنەماڵەکەیانی بۆ خوێندنی قورئان و فێربوونی ئەرکەکانی ئاینی ئیسلام هان داوە، کاتێك سوڵتان سلیمان عوسمانی بەرەو ئێران دەچوو کەلە کەوشەنی ئەمارەتەکەی ئەمان نزیك بوەوە "حسن بەگ" ناچار بوو پەپیر سولتانەوە چوو و پێشوازی لێکرد، سولتانیش ئەوی لە میرایەتی خۆشاب و تیرەی مەحمودی هێشتەوە، ئینجا لە جەنگی میری میرانی دنبەلی (وان)دا ئازایەتیەکی بیّ وێنەی نیشاندا، سوڵتان زۆر رێزی لێنا، سەرئەنجام ساڵی ٩٣٢کۆچی کە لەگەڵ سوپای عوسمانیدا هێرشیان بۆسەر تەورێز برد لە "سعد آباد" بەدەستی قزڵباشەکان کوژرا، عوض بەگی کوری کە قەلای "ماکۆك"ی بەدەستەوە بوو جێگەی گرتەوە، ساڵی ١٠٠٢کۆچی مصطفی بەگی کوری عوض بەگ لەلایەن سولتان محمد خانی عوسمانیەوە لە جێگەی باوکی دانرا، ئینجا علی بەگ کوری مصطفی بەك هاتە سەرکار.

شایەنی باسە یەکێك لە کورەکانی حسن بەگ کەناوی شێرەبەگ بوو پیاوێکی سۆفی و ئایین پەروەرو لە خوا ترس بوو لە دوای باوکی ئەمارەتی خۆشاب و سەرپەرشتی تیرەی "محمود"ی بەرێوە دەبرد،[182] ڕەنگە ئەمارەتی مەحمودی هەتا سەرەتای سەدەی یازدەیەمی کۆچی بەردەوام بووبێت.[183]

## ئەمارەتی دەنبەلی:

دەڵێن خەڵکی جزیرە بوون دواتر لەلایەن سوڵتانی عوسمانیەوە ناوچەی "سکمەن ئابادی خۆی"یان پێدراوە[184]، بەڵام مەردۆخی لە "مشاهیری کورد"دا لەزمانی دینەوەریەوە دەڵێت: زنجیرەی میرانی دنبەلی بۆسەر (عیسی) ناوێك دەگەرێتەوە ئەویش لەنەوەی بەرمەکیەکان بووە[185]، علی اصغر سعیدی لە راپۆرتێکدا بنەچەی دونبەلییەکانی بۆ "موسی"ی بچوکترین کوری یەحیای بەرمەکی ئێرانی وەزیری خەلیفەی عەباسی بردۆتەوە[186].

دونبەلیەکان سەر بەئاینی ئیزدی بوون، دواتر هەندێکیان موسڵمان بوون و ئاینزای سونەیان هەڵبژارد. ئەوانەشیان کەلە ئێران نیشتەجێ بوون لەژێر فشاری دەولەتی "سەفەوی"دا بە ئاینزای شیعەوە ئاڵان.

- دووبەیتی خوارەوە کەلەلایەن حەیران خانمی دونبەلی نەخچەوانی شاعیری کوردی سەدەی سیانزەیەمی کۆچی ووتراوە:

---

١٨٢- شەرەفنامە، ل٣٨٨-٣٨٩

١٨٣- کوردو کوردستان، محمد امین زکی ٣٧٦

١٨٤- شەرەفنامە، ل٣٩٩

١٨٥- روحانی، بابا مردوخ، تاریخ مشاهیر کرد ب٣، بەشی دوو ل٨٥

١٨٦- ضرغام، شهریار، گزار شهای تلگراف اخرین سالهای عصر ناصر الدین شاه ل٢٥٥

پرس اگر نسب حیران دلـــفکار - أز خاندمان شیر خدا شاه دین علی أسبت
باشـد و راحب ز عزیزان نخچوان - أورا ولی نســب و کـریمان دنبلی[187]

گەر لە بنەچەی سەرسورمێنەروو بەرز دەپرسی - لەخانەدانمان شێری خودا شای دین عەلیە
ئـــەوا جێگەی ڕێزن یـــاران نە خچەوان - ئـــەو بنەچەی وەلی و بەخشندانی دنبەلیە

أحمد بەگی کوری عیسی بەگی دنبەلی لە سەردەمی ئاق قونیلوەکاندا بە پایەی بڵنـد گەیشت و هەندێك لە ویلایەتی هەکاری داگیرکرد. دوای مەرگی احمد بەگ، شیخ بـەهلولی کـوری جێگـەی گرتـەوە و دوای ئـەویش "حـاجی بـەگ"ی کـوری، بـەهۆی ئـەوەوە کـە پەیوەندی لەگەڵ شاتە هماسپ باش بوو ناوچەی خۆی و سکمن ئابادی پێدرا و نازنـاوی حاجی سولتانی پێبەخشی و پارێزگاری سـنورەکانی ئازربایجـانی پێسـپارد، بـەڵام پـاش ماوەیەك بـە فیتـی حسـن بـەگی مـەحمودی و لـە پێلانێکی غافلگیرانـەدا خـۆی و چـەند کەسێك لە سەرانی دونبەلی کوژران. احمد بەگی برای حـاجی بـەگ لەسـەردەمی براکەیـدا ناوچـەی "سـکمن ئابـادی" بـەرێوە دەبـرد دوای کـوژرانی حـاجی بـەگ بـاری عەشـایری دونبەلی تێکچوو جارێك سەر بەعوسمانیەکان بوون و جـارێ سـەر بـە دەوڵـەتی سـەفەوی بـوون. ئـەم ئەمبەرەوبـەرە شـاە تەهماسـبی تـووڕەکرد، احمـد بـەگ و دووبـرای و چـەند سەرکردەیەکی دونبەڵیەکانـی کوشت، یەکێك لە بنەماڵەی دونبەلیەکان کەناوی منصـور بـەگ کـوری محمـد بـەگ بـوو تـوانی خـۆی دەربکـات و پـەنا بـۆ عوسمانیـەکان بـەرێت، دونبەلیەکان لێی کۆبونەوە و بەسەرداری خۆیانیان دانا.دوای ئـەویش وەلی بـەگی کـوری لەلایەن سولتانی عوسمانیەوە لە جێگەی باوکی دانرا و هەتا سـاڵی ١٠٠٥کۆچـی لەژیانـدا بوو.

---

١٨٧- صفی زادە، صدیق، پارسی گویان کرد.

وەكو پێشـتر باسمـان كـرد حـاجی بـەگ بـە پیلانـی حسـن بـەگی مـەحمودی كـوژرا، منداڵێكی دوو مانگی لە پاش جێما بـەناوی باوكیـەوە ناویـان نایـەوە، شـاتە هماسـب ی سـەفەوی كەسـێكی سەربـەخۆی بـۆ دانـا كـە پێشـتر لـە لایـەن "سـولتان بایەزیـد"ەوە بەرپرسیارێتی "ناوچـەی ئـەلكاو"ی پێسپێدرابوو، هەتـا گەورەبوونی حسن بەگی كوری حەسەن بەگ سەرپەرشتی ئـەمارەتی دونبـەلی بكات، دوای ئەو ئەمارەتی دونبەلی بە سولتان علی بـەگی كـوری جەمشـید بـەگی كـوری بەهلول بەگ گەیشت، دوای ئەو نظر بەگی كوری هات، كاتێـك كـە "ئـەیرەوان" دەسـت عوسمانیەكان كەوت فەرمانرەوایی چاڵدێران، سلێمان سـەرای و سـكمەن ئاباد بـە نـظر بەگ و قلیچ بەگی برای درا دواتر لەسەر ناوچەی سكمەن ئاباد نـاكۆكی لـەنیوان ئـەوان و "مەحمودی"ەكاندا پەیدابوو، نـظر بەگ و هەشتا كەڵەمێردی "دونبەلی"ەكان تیاچوون، دوای شەرەكە بریاردرا مەحمودیەكان دەست لە سكمەن ئاباد هەڵبگرن و نـەوەی حـاجی بەگ فەرمانرەوایی بكات و ناوچەی "چالدێران"یش بۆ قلـیچ بـەگ بێـت[188]، ئـیتر میرانـی دونبەلی هەتا سەردەمی "شابازخان" فەرمانرەواییان كـرد سـەرئەنجام لەلایـەن "عبـدالله پاشاوە"وە لە "قەڵای خۆی"دا ئابلوقە دران، ناچار خۆی بەدەسـتەوەدا، سـاڵی مـەرگی ئەو ١١٤٤كۆچی یاداشت كراوە. میر ئەحمەد میرێكی دیكەی دونبەلیەكان كە پەنجا سـاڵ و شەش مانگ ئەمارەتەكەی بـاپیرانی بەدەسـتەوە بـوو، سـەرئەنجام بەدەسـتی كـورانی شـابازخانی دونبـەلی كـوژرا، نجمعلـی خـان كـوری شـابازخان كـە لەسـەردارانی نـادر شـا ساڵی ١١٩٦كۆچی دوایی كرد[189]. شایەنی باسـە عبـدالرزاق كـەنازناوی "مـەفتون"ە لـەم تیرەیەبوو ولە شاری "خۆی" لە دایك بووە، كوری نجمعلی خان بووە ساڵی ١١٧٦ كۆچی دوایی كردوە، مەفتون هۆنەرێكی بەتوانا وزانایەكی بەرێزبوو، ماوەیەك لەشاری "شیراز"

١٨٨- شەرەفنامە، ل٣٠٨-٣٠٩

١٨٩- كورد و كوردستان ل٢٨٢

ژیا، بەڵام دوای مەرگی "کەریم خانی زەند" بۆ "خۆی" گەڕایەوە و خەریکی یاداشتەکانی بوو، دواتر سەرنجی "عباس میرزا"ی ڕاکێشا، سەرپەرشتی دیوانی پێسپارد. مەفتون دانراوی زۆری هەیە (حدائق الجناب)،(تجربة الأحرار)، (وسیلة الابرار)، (حدائق الادباء)، (نگارستان دارا) و (ریاض الجنة) هەندێکیانن[190]. شایەنی باسە نجفقلی خانی صبە، مەحمود خانی ملك الشعراو، ملك الشعرای بهار و ابو الحسن صبای باوکی مۆزیسیۆنی نوێی ئێران لە دونبەلیەکانی "کاشان"ن.[191]

## کــــوردانی دەرســـــــیم[192]:

شایەنی باسە هەندێك لە کوردانی ئەم ناوچەیە موسلمان دەهاتنە پێش چاو بەڵام پەیرەوی ئاینزایەکیان دەکرد لە ئیزدی دەچوو، موسڵمانانی ناوچەکە جارێك ئەوانەیان بە "توزیك" و جارێك بە "قزڵباش" ناودەبرد، ئەم کوردانە هەتا نیوەی سەدەی نۆزدەیەمی "زاینی"ش بێلایەن بوون.[193]

## شەڕی نێوان ئیزدین میرزای داسنی و هێزی قزلباش لە بەغداد:

بەهۆی ئەوەی کە ئیزدیەکان تایبەتمەندی و ئاینی تایبەتی خۆیان هەبووە، هەمیشە لەلایەن موسڵمانانەوە ڕق و کینەیان لێکیشراوە، لەناو موسڵمانانیشدا شیعەکان بەهۆی نزیکی ناوەکەیان لە "یەزید"ەوە هێندەی دیکە لێیان بەقین بوون. کاتێك ئیسماعیل سەفەوی لەگەڵ ئیزدیەکانی شەروان جەنگی ئەو ناوەیانی بەناونیشانی جەنگی دژی

---

١٩٠- صفی زادە، صدیق پارسی گویان کرد، ل٢٩-٣٠.

١٩١- گزارشهای تلگراف أخرین سالهای عصر ناصرالدین شاه ل٢٥٥-٢٦٧.

١٩٢- درسیم شارێکە لە باشوری تورکیا.

١٩٣- نیکتین، واسیلی، کردو کردستان ترجمه محمد قاضی ل٤٩٢.

ئــەوان بــەكارهێنا و ســەركەوتوش بــوو، ڕەفتــاری دوژمنانــەی "تەهماســپ" دژی دونبەلیەكان لەو بازنەیە دەرناچێت.

ئێزدیەكانی ژێر ڕكێفی سەفەویەكان وورده وورده ناچاركران یان خۆیان بگۆڕن یان ئەوناوچانە بەجێ بهێڵن، بەڵگەی ئەم ووتانەش وونبـونی یـەكجارەكی ئـەم ناوەیـە لـەزۆر شوێنی جیـاوازی ئازاربایجـان، كرماشـان، دینـەوەر، چـونكە لـەزۆر لـەو نوسـراوانەی لـە ئێزدیەكان جێماوە باس لەوەدەكەن كە ئێزدیـەكان لـە ناچـاریدا خۆیـان لەسـەر ئـاینزای سونەی موسڵمان ئەژمار كردووە.[194]

كاتێــك "بەغــداد" بەدەســت ســەفەویەكانەوە بــوو، ئێزدیــەكان شــان بەشــانی عوسمانیەكان دژی سەفەویەكان جەنگین، "ئێـزدین مـیرزای داسـنیٚ"ی ئێـزدی هێنـدەی ئازایەتی نوانـد بـەهۆی ئـەو دلسـۆزی وئازایەتیـەوە لەلایـەن سـوڵتان مـورادی چـوارەمی عوسمانیەوە ساڵی ١٠٦١كۆچی فەرمانرەوایی "موصـل"ی پێبەخشـرا و نزیكـەی سـاڵێك حوكمران بوو[195].

## ڕووداوەكانی ساڵی ١١٢٧ كۆچی:

ساڵی ١١٢٧ ئێزدیەكانی شەنگال دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕین، سوپای عوسمـانی هێرشی بۆ هێنان، دوای جەنگێكی سەخت و كوشتن و برینێكی زۆر ئێزدیەكان شكستیان هێنــاو پــەنایان بــۆ قەڵــا پچـوكەكەی "خاتونیــە" بــرد، لەشــكری عوسمــانی دوای ئابلوقەدانیان، خۆیان بەدەستەوە دا، ژن و كچ و مناڵەكانیان فرۆشتن[196].

---

١٩٤- ئێزدیاتی، ل٣٥

١٩٥- ئێزدیاتی، ل١٧٠-١٧١

١٩٦- الیزیدیون، ل١٤٠-١٤٩

## هێرشی میری ڕەواندز بۆسەر ئێزدیانی شێخان[197]:

الحسنی نوسیویەتی لەنێوان علی بەگی میری ئێزدیان و علی ئاغا باڵتەیی "ئەلقوشی-مزوری" دوژمنایەتی هەبوو، ڕۆژێك عەلی بەگ بانگهێشتی عەلی ئاغای کرد وەکو ئاشت بوونەوە هەواڵی بو دەنێرێت کە دەیەوێت کورەکەی لە دامێنی ئەودا سونەت بکات[198]، عەلی ئاغا بە میوانداریەکە قایل دەبێت و بۆ "باعەدرێ" دەچێت، پیاوەکانی "عەلی بەگ" لە میوانداریەکەدا پەلاماریان دەدەن تەنها دوانیان دەرباز دەبن، ئەوانی دیکە دەکوژرێن، برازایەکی عەلی ئاغا ناوی "ملا یەحیای مزوری"بوو پەنا بۆ میرانی دەوروبەر برد و داوای هاوکاری لێکردن.

میری ڕواندوز بەدەمیەوە چوو، ساڵی "١٢٤٧کۆچی" هێرشی بۆسەر ئیزدیەکان کرد، ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا، هەندێکیشیان پەنایان بۆ شاخ و کێوەکان برد، بەڵام میری ڕواندوز دوایان کەوت و عەلی بەگی کوشت، حسین بەگی کوری دەرباز بوو[199].

## کردنەوەی خوێندنگەی زۆرەملێی ئاینی ئیسلامی لە مەزاری "شێخ عودەی"دا:

ساڵی ١٣٠٨ کۆچی دەوڵەتی عوسمانی بە بیانووی وەرگرتنی باج و سەربازگیری سوپایەکی بەسەرکردایەتی سەرتیپ "عمر وەهبی پاشا" بۆ "موصل" نارد، ئەویش بۆ ترساندنی خەڵکی دەستی بە زەبرو زەنگ کرد.

سەرانی ئێزدی لە "موصل" کۆکردەوە و بەمەبەستی موسڵمان کردنیان فەرمانی بە دادوەری موصل دا "ئایەتی توحید"یان بۆ بخوێنێت، میری شێخان "میرزا بەگ" و کورە منداڵەکەی ودوو کەسی ئاسایی، ملکەچی موسلمان بوون بوون، بەڵام هەموو ئێزدیەکان بەرگریان لە ئاینەکەیان کرد، وەهبی پاشا هەموویانی گرت و هێزێکی بە فەرماندەیی

---

١٩٧- راوندوز شارێکە لە پارێزگای هەولێر

١٩٨- لە بەشی ئاداب و کلتوری ئیزدیەکاندا باسی چۆنێتی خەتەنەکردن لەلای ئیزدیەکان دەکرێت.

١٩٩- الیزیدیون، ل١٤٠

کورەکەی خۆی بۆ شێخان و لالش نارد، مەزارگە و گومەزەکانی وێران کرد، کاری ناشایستەی زۆری کرد، ئێزدیەکان لە ناچاریدا رایان کرد، پیاوێکی ئاینی بەناوی شێخ امین قەرەداغی بۆ بەرێوەبردنی خوێندنگەو کاروباری ئیسلامی و بۆ مەزاری شێخ عودەی نارد و بودجەیەکی دیاریکراویش بۆ بەرێوەبردنی خوێندنگەو خوێندەکارەکانی دیاریکرا و ئەم خوێندنگە زۆرەملێیە لە سالّی ١٣١٠-١٣٢٢ی کۆچی بەردەوام بوو بەلاّم نوری پاشای والی عوسمانی (موصل) توانی ئاستانە قایل بکات واز لە ئێزدیەکان بهێنن، لەبەرامبەریشدا دەبوو ئێزدیەکان لەباتی ئەرکی سەربازی برێك پارە بدەن و خوێندنگەکە لابرا.

سەرتیپ عمر وەهبی جگە لە "موصل" و لالش لەشاری "شەنگال"یش هەمان کاری کرد. سەرئەنجام بە سکالاّی سەفیری وولاّتە بێگانەکان لەلای سولتانی عوسمانی "وەهبی" لەسەر کار لابرا.[٢٠٠]

## راپەرینی ئێزدیەکان دژی پاشای عێراق:

دوای ئەوەی دەولّەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمدا روخا، حکومەتێکی پاشایی لە عێراق دروستکرا، باروگوزەرانی ئێزدیەکان هیچی وا نەگۆرا، بە پێی بلاّوکراوەی فەرمی دەولّەتی عێراق لە سالّی (١٩٣٥ زاینی) ئێزدیەکانی شەنگال بە رابەرایەتی داود داود لە دژی دەولّەت راپەرینێی چەکدارانەیان ئەنجامدا. سەرەتا دەولّەت وویستی لەرێگەی میری ئێزدیانەوە ئارامیان بکاتەوە، بەلاّم سودی نەبوو، لەبەر ئەوە لە شەنگال بریاری فەرمانی سەربازی دا.

و بەچەکی نوێ هێرشی بۆ کردن و گوندەکانی گرتن و ژمارەیەکی زۆریشیان پەنایان بۆ شوێنە سەختەکانی برد و بەرگریان لە خۆیان کرد. بەلام لە بەرامبەر دەولّەتی عێراقدا خۆیان بۆ نەگیرا و سەرئەنجام خۆیان بە دەستەوەدا. داود داود بەبریندار لەگەل

---

٢٠٠- اليزيديون، ل١٤١-١٤٢

هاوسەرەکەی و دوو کوری و چوار لە چەکدارەکانی دەربازی سوریا بوون. دەوڵەت بە بیانووی " ڕاپەرینی شەنگال" دەستی بە لەسێدارەدانی چالاکەکانیان کرد[٢٠١].

لە کۆتای ئەم مێژوچەیەی باسکرا دەبێت ئەوەش بلێین باس و خواستی ئیزدیانی سۆڤیەتی جارانیش جیاوازیەکی وایان لەگەل ئیزدیەکانی دیکەدا نەبوو. بەتایبەتی لە ئاران لە ئازەربەیجانی سۆڤیەتی پێشو ئیزدیەکان وەك هاونەژادە کوردەکانیان لە بارێکی سەختدا بوون، بۆیە لە ناچاریدا رەویان کرد یان لەناو گەلانی ئازەریدا توانەوە، ئامارەکانی ساڵی ١٩٢٦ و ١٩٥٩ زاینی بەڵگەی دابەشکردنی کوردەکانی "ئاران" ئاشکرا دەکات.[٢٠٢]

---

٢٠١- اليزيديون، ل١٤٥-١٤٦

٢٠٢- آگینر، شیرین، أقوام مسلمان اتحاد جماهیر شوروی، ل٢٦١

# بەشی دووەم

# بـــــــیروباوەری ئـــــیزدیەکان:

**باوەری ئیزدیەکان دەربارەی خودا:-**

هەر بەو شێوەیەی لەبابەتی ناوی ئیزدیەکاندا باسمان کرد پێدەچێت ناوی خودا لەلای ئیزدیەکان لە ووشەی "ئزدای"ەوە هاتبێت و شێوەی "ئیزی" وەرگرتبێت، دوای ئەوەش ئەوان یەکێك لە سیفەتەکانی خودایان بەناونیشانی تایبەتمەندی ئەو هەلبـژاردوە و لەم بارەوە لەگەڵ ئاینەکانی دیکە جیاوازیان نیە، بۆ نمونە لە ئاینی "مزدییسنا" بەخوا دەوترێت (ئەهورا مەزدا = مەزدا ئاهورا) کە واتای دانای مەزنی، بوون بەخش دەبەخشێت.[۲۰۳] کە لە ئاینی ئیسلامیشدا هەمان شێوەیە.

با بزانین تایبەتمەندێتی خوداوەند لە لای ئیزدیەکان چیە؟

لەبەر ئەوەی ئەم لێکۆلینەوەیە لەسەر پاشماوە ئەدەبیەکانە، یەکێك لەو قەولانەی کە ناو و سیفەتەکانی خوداوەندی تێدا هاتووە، "قەولی تاووس مەلەك" دەهێنین:

| | |
|---|---|
| یا رەبی عەلا شانەك و عەلا مەکانەك و عەلا سولتانەك | خودایە پایەت، جێگەت، توانا بەرزن |
| یا رەبی تویی کەریمی تویی رەحیمی | خودایە تۆی بەخشندە تۆی میهرەبان |
| یا رەبی هەر تو خودای | خودایە هەر تۆ خودایت |
| هەر تویی لائیقی مەدح و سەنای | هەر تۆی شایەنی ستایش و پیا هەڵدانی |
| یا رەبی تو مەلەکی مەلکی جیهانی | خودایە تۆ خاوەنی گشت جیهانی |
| یا رەبی تو مەلەکی مەلکی کەریمی | خودایە تۆ خاوەنی و خاوەنی بەخشندەیت |
| تو مەلەکی عەرشی عەزیمی | تۆ خاوەنی عەرشی مەزنیت |

---

۲۰۳- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کرد ل۳۰

یا رەبی ژ عەنزل دا هەر تویی قەدیمی
تو تام و کام و رای
یا رەبی هەر تو خودای
هەر توی های
تو هەر تویی لائیقی مەدح و سەنای

یا رەبی تو مەلەکێ عنس و جنسی
یا رەبی تو مەلەکێ عەرش و کورسی
یا رەبی تو مەلەکێ گای و ماسی
یا رەبی تو مەلەکێ عالەم و قودسی
تو سەمەدی لفتی لەمایی
تو سەمەدی: حەی ل مەجیدی
واحدی فەرزل حەمیدی
یا رەبی تو خوداوەندێ سەپەری
یا رەبی تو خودانێ مەهـ و مەری
یا رەبی تو خودانێ جەهـ و مەری
یا رەبی تو خوداوەندێ عەتای
یا رەبی تو لائیقی مەدح و سەنای
یا رەبی ژ ئیسما تویی بلندی
تە ناڤ ل چوننە، توی چەندی
مزێ زای دو زەندی
مقا دەستێ دو پایی
تۆیی لائیقی مەدح و سەنای
یا رەبی تو کەرەم دایی حوتی
مەندایی قوتی

خودایە هەر لە ئەزەلەوە تۆ بوویت
تۆ تەواو و خاوەن ڕای
خودایە هەر تۆ خودای
هەر تۆیی هەی
تو هەر تۆی شایەنی ستایش
و پیاهەڵدانیت

خودایە تۆ خاوەنی ئنسی و جنسی
خودایە تۆی خاوەنی عەرش و کورسی
خودایە توی خاوەنی گا و ماسی
خودایە تۆ خاوەنی جیهان و قودسی
تۆ ئەلسەمەدی لفتی لەمایی
تۆ ئەلسەمەدی حەی ئەلمەجیدی
یەکتایت فەرزل حەمیدی
خودایە تۆ خوداوەندێ سەپەری
خودایە تۆ خاوەنی مانگ و مەڕی
خودایە تۆ خاوەنی جێگە و مەڕی
خودایە تۆ خاوەنی بەخشینی
خودایە تۆ شایستەی پیاهەڵدانی
خودایە لە ناوا تۆی بڵندی
ناوی تۆ لە شتی کە نایەت
........................
[٢٠٤]........................
تۆ شایەنی پیاهەڵدان و ستایشی
خودایە بەخشندەیت دا بە حوتی
بەخشندەی قوتی

---

٢٠٤- نووسەر بۆی ڕوون نەبۆتەوە (وەرگێڕ).

| | |
|---|---|
| حەلیمێ مەلك كوتی | خۆراگری مەلە كوتی |
| یا رەبی تو عالمی علمای | خودایە تو زانای زانایانی |
| یا رەبی تو هم حەكیمی و هم مەچالی | خودایە تۆ حەكیمی و خاوەن دەرمانی |
| یا رەبی تە نەخافە تەنە خوردە | خودایە تۆ نە دەخەویت و نە دەخۆی |
| خودان مالی خودان پەردە | خاوەن ماڵی خاوەن پەردە |
| یا رەبی مەكانێ تەوێ ل هەمو عەردە | خودایە جێگەی تۆ لە هەموو عەردە |
| یا رەبی تە نە لەونە تە نە رەنگە | خودایە تۆ بێ رەنگی . |
| تە نە ئاوازە، تە نە دەنگە | تۆ بێ هەرای تۆ بێ دەنگی |
| تە نە ئیندامە، تە نە چەنگە | تۆ بێ ئەندام و بێ چنگی |
| یا رەبی كەس نزانت توی كوسای | خودایە كەس نازانێ تۆ چۆنی |
| یا رەبی تو وەلیێ فەرزا نمێژی | خودایە تۆ فەرزكەری نوێژی |
| روحا دپەرێژی | گیان دەپارێزی |
| ژ ملان ملكان دبێژی | لە لاملان فریشتان دەبیژی (لەسەر شانەكان فریشتەت ناوە) |
| | |
| یا رەبی تو حاكمێ شاه و گەدایی | خودایە تۆ فەرمانرەوای شا و گەدای |
| یا رەبی تو حاكمی جملەتی عالەم | خودایە تۆ بۆ گشت خەڵكان فەرمانرەوای |
| یا رەبی تە تۆبە دانابو ل سەر ئادەم | خودایە تۆ تۆبەت لەسەر ئادەم دانا |
| یا رەبی تو حاكمی شیفایەتی | خودایە تۆ دادوەری شفاعەتی |
| یا رەبی تو رەحمی كەرەمی ئەمینی | خودایە تۆی میهرەبان، بەخشندە و پارێزەری |
| یا رەبی تو بی لسەمەدی | خودایە تۆ بێ نیازی |
| ئەم چو نینین | ئێمە هیچ نین |
| یا رەبی ئەزی كەتیمەی تاویمە | خودایە من بێچارە و بیمارم |
| تو هم دەرمانی و هم دەوای | تۆ دەرمان و دەواشی |
| تو هەم دەرمانی و هم تەبیبی | تۆ دەرمان و پزیشكیشی |
| تۆ حەكیمی ئەم غەریبین | تۆ حەكیمی ئێمە نامۆین |

| | |
|---|---|
| یا رەبی هەر تو دزانی دەرمانی مە بکودبی | خودایە هەر خۆت دەزانی چارمان چیە |
| یا رەبی تو ئونسی غوربانی | خودایە تۆ هاودەمی ئاوارانی |
| و ل سوج و گونە و مشە وشە | ئێمە تاوانبار و گوناهکار و پەریشانین |
| مەکرن تەحیات و گەوشە | ئێمە گلاوی تاوانین |
| یا رەبی ل مە نە بەخشە | خودایە لە ئێمە مەبورە |
| یا رەبی هەر تویی های | خودایە هەر تۆ هەیت |
| تو هەر تو خودای | وە هەر تۆ خودایت |
| تو هەر تویی لائیقی مەدح و سەنای | هەر تۆ شایەنی ستایش و پیاهەڵدانیت |
| یا رەبی تو خالقی ئەم موخلقین | خودایە تۆ ئافەریدە و ئێمە دروست کراو |
| تو مرازی ئەم داخوازی | تو مرازی و ئێمە داخوازی |

به پێی قەولی "تاووس مەلەك" خوداوەند خاوەنی گشت ئەو تایبەتمەندیانەیە کە لە ئاینە ئاسمانەکانی دیکەدا دەربارەی خوداوەند ووتراوە، ئەگەر ئەو سێ بەیتەی نەمانتوانی مانای بکەین نهێنی و ئاماژەیەکی تایبەتی نەبن، ئەوا ئەم قەولە تۆمەتی هاوبەشی بۆ خودا لەم ئاینەدا دووردەخاتەوەو بابەتی یەکتایی خوداوەند[٢٠٥] لە قەولی دروستکردن و لە شایەتمانی ئیزدیاندا بە روونی دیارە. بۆ نموونە لە شایەتماندا دەڵێن" ("شەهدا دین من ئێك ئەللاه"[٢٠٦] = "شایەتی ئاینی من خودا یەکتایە") شایەنی روونکردنەوەیە کە، زەردەشتیەکان لە شایەتمانی خۆیاندا دەڵێن: "من مەزدا پەرستی زەردەشتی هەڵدەبژێرم کە دێوەکان رەتدەکاتەوە و یەکتاپەرستیمان فێر دەکات."[٢٠٧]

---

٢٠٥- حبیب، جورج، الیزیدیە، بغداد، ١٩٧٨، ل٦٢

٢٠٦- ئێزدیاتی ل٣٥

٢٠٧- بهزادی رستم، زرتشت و اموزش های او ل٥٣

کەیخوسرە وئەسفەندیار لە کتێبی **"دبستان مذاهب"** دا باسی کردووە: پارسایان کە ئیزدیان و ئازەریەکان دەگرێتەوە لەسەر ئەوە کۆکن کە یەکتایی و دیاریکردنی هەموو خەسڵەتە پیرۆزەکانی خوداوەند لە زانست و ژیان، لە هەمان خودی خۆیدا دەبێت[٢٠٨].

چونکە خەسڵەتەکانی خوداوەند لە لای ئیزدیەکانیش کە هەمان خودی ئەوبێت، جێگەی تێڕامانە چونکە ئەگەر وابێت، حەوت فریشتەیان بە قسەی پەیرەوانی ئایینی مەزدیسنا، ئەمشاسپەندان چۆن هەڵبژاردەی خۆی بە دەست دەهێنێت، مەگەر ئەم ووتانەی ئەسفەندیار لەگەڵ یەکێتی خود ئاراستەبکرێت. ئەم چوارینەیەی عێراقی بخوێنینەوە:

| | |
|---|---|
| **هربوی، که از مشك و قرنفل بشنوی** | **از دولت آن زولف چو سنبل شنوی** |
| **چون ناله بلبل از پی گل شنوی** | **گل گفته بود، گرچه بلبل شنوی**[٢٠٩] |
| **هەر بۆ یەك لە مشك و مێخەك بکەیت** | **لە دەوڵەتی ئەو زوڵفە سونبل ئاسایەی دەکەیت** |
| **کە ناڵەی بولبل لە پای گوڵ ببیستی** | **گوڵ ووتبوی، گەرچی لە بولبول دەبیستی** |

محمد معین باسی کردووە گشت پاشاکانی پێش دەرکەوتنی زەردەشت یەزدان پەرست بوون، روونیشی دەکاتەوە مەبەست لە یەزدان خودای گەورەیە نەك فریشتەکانە[٢١٠] ئەو بە پێی گێرانەوەکانی "فیردەوسی" ئەم قسانە دەکاتەوە و درێژەی پێدەدات، ئەو نامانەی پاشاکانی "پێشدادی" و "کەیانی" بۆ فەرمانرەوایان نوسیویانە بە ناوی یەزدان و خوداوەندی مەزن دەستیان پێکردوە و لەم ناوانەدا "یەزدان"یان بە "خوداوەندی ئەستێرەکان" دەووت، نەوزەر (نوذر) کە یەکێك لە پاشایانی (پێشدادی)ە، لە نامەیەکدا کە بۆ "رۆستەم" ی باپیری ناردووە، ئاوا هاتووە:

---

٢٠٨- اسفندیاری کیخسرو، دبستان مزاهب، بکوشش رحیم رضا زاده ملك ل٥-٦

٢٠٩- عراقی، کلیات، بکوشش سعید نفیسی چاپ٢، ل٣٩٨

٢١٠- معین احمد، مزدیسنا و تأثیر آن در أدبیات فارسی ل٤٣

بسکسار مازندران بودسام — نخست از جهان آفرین بود نام
خداوند نا هید و بهرام و هور — کههست آفرینده پیل و مور
همه با توانائی او یکی است — بزرگست بسیار و یا أند کیست
کنون أز خداوند خورشید و ماه — درودی بجان منو چهر شاه[211]

له سەکساری مازندەران بوو سام — یەکەم لە جیهان ئافەریدە بو نام (ناو)
خوداوەند ناهید و بەهرام و هور — کە ئافەریدەیانە فیل و میر و مور
هەموو بۆ توانایی ئەو یەکیکە — زۆر گەورەیە و یا بچوکێکە
ئێستا لە خواوەندی خۆر و ماه(مانگ) — درودیێ بۆگیانی منوچەر شاه

"معین" لە کۆتایی لێکوڵینەوەی "یەزدان پەرستی" دا بەو ئەنجامە دەگات کە ئێرانیەکانی لە پێش "زەردەشت" دا باوەریان بە خودای سەربەخۆ و تاك و تەنها نەبووە و ئەوەی کە لە "شانامەی فیردەوسی" دا هاتووە لە ژێر کاریگەری "مەزدیسنا" و دەمارگیری میللی ئێرانیەکاندا هەڵبەستراوە[212]. عبدالرفیع راستیەکەی دەنوسێت: کاتێك کە ئێرانیەکان و هندەکان لە یەك جیابوونەوە، ئێرانیەکان ئاینی "مەزدا" یان پێکهێنا، ئەم ئاینە پێش سەردەمی زەردەشت ناوی ئاینی "مەزدیسنا" بووە لەگەڵ ئەهورامەزدا دا "میترا" شیان دانا. بە هەرحاڵ "معین" لەو باوەرەدایە کە ئێرانیەکان لە پێش "زەردەشت" دا باوەریان بە "خوداوەندی ئەستێرەکان" هەبووە، لە "بەشی سێیەم" دا دەربارەی ئاوا خودایەك لە خوداپەرستی و ئەدەب و رێورەسمی ئێراندا روونکردنەوە دەدەین.

"جوزیف فورلانی" یش لە یەکیك لە مەزنانی ئێزدیانەوە گێراویەتیەوە کە ئەوان باوەریان بە خودای تاك و تەنها هەیە.[213]

---

٢١١- مەزدیسناو تأثیر آن در ادبیات فارسی، ل٤٦

٢١٢- هەمان سەرچاوە ل٤٧–٤٨

213 -Gasoffa Farlani. The Religion of the Yazidia P72

### باوەری ئێزدیەکان بە حەوت فریشتە:

ئێزدیەکان باوەریان وایە ئەم حەوت فریشتەیە: ئزرائیل، جبرائیل، دەردائیل، میکائیل، شمقائیل، ئیسرافیل و عزازیل لە ئاسمانەکان چاوەروانی فەرمانەکانی یەزدانی مەزنن.

| | |
|---|---|
| ئەون هەر هەفت مەلەکێد کبیر، | ئەوانن هەر حەوت فریشتەی مەزن |
| پەری خاسا چەندی بەدیل، | پەری خاسانن بێ بەدیلن |
| دراوەستاینە ل حزرتا مەلکێ جەلیل[214] | بەرامبەر خودا هەموو وەستاون |

ئێزدیەکان بۆ ئەم حەوت فریشتەیە حەوت جێگرەوەیان لە سەر زەوی بۆ ئامادەکردون کە بریتین لە: (شمس الدین، فخرالدین، سجادین، ناسردین، ئامادین، بابادین، ملك شێخ سن) ئێزدیەکان لە پارانەوەی بەیانیاندا (دوعایا سبەیکی) کە لە بەیانیاندا دەیخوێنن بەم جۆرە دەپارێنەوە.

| <u>پشکا ئێکی</u> | <u>بەشی یەکەم</u> |
|---|---|
| ئامین ئامین | قایل بە قایل بە |
| تەبارەك ئەلدین | پیرۆزە ئاین |
| ئەللا ئەحسەن ل خالقین | یەزدان باشترین دروستکارە |
| بهیمەتا شەمسەدین | بە هیمەتی شەمسەدین |
| فەخرەدین | فەخرەدین |
| سجادین | سەراجەدین |
| ناسردین | ناصرالدین |

214- ئیزدیاتی، ل٢٠-٢٢

بابـادین          بابـادین (فـورلانی لـەباتی بابـادین شـێخ بـەکری دانـاوە و ئـەم پارانەوەیە لەگەڵ قەولی (طاوس مەلەك) تێکەڵ بوون.

سلتان شێخادی تاج ئەوەلین هەتا ئاخرین          سولتان شێخادی تاجی سەرەتا هەتا کۆتایی
برەحما شێخادی رەزای مەلك شێخ سن          بە بەزەیی شێخادی، خۆشنودی شێخ سن

جورج حبیب نوسیویەتی پایەی باوەرکردن بە حەوت خـودا، بـاوەر بـە هەسـارەکانی ئاسمان لە لای بابلیـەکان، کـە هەریـەك لەوانـە لـە رۆژێـك لـە حـەوت رۆژەکـەی هەفتـەدا فەرمانرەوایی دەکەن، چونکە باوەری ئـەوان "خـۆر" یـەك شـەممە ، مـانگ دووشـەممە، مەریخ(بەهرام) سێ شەممە، عەتارد(تیر) چوارشەممە، مشتەری(برجیس) پێنج شەممە و زوهرە (ناهید) هەینی و زوحەل (کەیوان) لە رۆژی شەممەدا فەرمانرەوایی دەکەن[٢١٥].

شایەنی باسە هەر بابلیـەکان نـەبوون کـە هەسـارەکانی ئاسمانیـان دەپەرسـت بـەڵکو گەلانی دیکەش لەوانە ئێرانیەکان لە پێش هاتنی "زەردەشت" دا هەسارەکانی ئاسمانیان پەرستووە. "معین" لە نەورۆزنامەی "خەیام" دا دەڵێت: کەموبدانی عەجەم لە رۆژگـاری "کەیومەرس" دا کۆبوونەوە، ووتیان: یەزدان خۆری لە روناکی ئافەریدە کردووە، ئەویش ئاسمان و زەوی رۆشن دەکاتەوە و خەڵکیش روویان تێکـردووە و خوداوەنـدی مـەزن بـە شـکۆ و گەورەییـەوە تێیـدەروانێت، چـونکە ئـەو لـە درووسـتکردنی "خـۆر" دا رەنـج و بایەخێکی فرەی داوە، لەبەر ئەوەشە کە بـە فریشـتەی مـەزن ئامـاژەی پێکـردووە و بـە یەکێك لە جێگرەوەکانی خۆی داناوە هـەتا بـە گـەورەی بـزانن. هـەروەها معین دەڵێـت: "تەهمورەس" یش خـۆری پەرسـتووە، دەقێقـی شـاعیر لـە هۆنراوەکانیـدا ئامـاژەی بـە خۆرپەرستی ئێرانیەکان داوە، وەکو لێرەدا دەڵێت:

---

٢١٥- اليزيدیه، ل١٠

همی بود سی سال پیشش بپای
نیایش همی کرد خورشیدرا
بدینسان پرستید باید خدای
چنانچون کەبُد راه جمشیدرا"[216]

---

سی سال چاوەروانی کێشا
هەر خەریك بوو خۆری دەلاواند
ئاوا دەبێت پەرستنی خودا
وەك چۆن بۆ جەمشید ببوو بە ڕێگا

ڕۆستەم شەهزادی نوسیویەتی: ئاریەکان لە سەرەتاوە دیمەنەکانی سروشت سەرنجی ڕاکێشاون و خودای جیاوازیان هەبوو، بە تێپەرینی کات لە یەکتاپەرستی یەوە نزیك بوونەوە. ناوبراو لە جێگەیەکی کەی هەمان پەرتوکدا دەڵێت: خەڵکی ڕۆژئاوا و باشوری ئێران کاریگەری گەلانی "سامی" نێوان دوو ڕووبار و باوەری ناوچەکەیان لەسەربوو. "رەفیع" ڕاستیەکەی دەرخستووە و دەڵێت: لە مێژووی ئاینی ئێرانیەکاندا ڕووبەرووی کۆمەڵێك دەبینەوە کە کەم و زۆر بە نهێنی "میهر" یان پەرستووە."[217]

کەیخوسرەو ئەسفەندیار نوسیویەتی:ئێزدیەکان لەو بروایەدان چۆن خۆر لە ئەزەلەوە بووە "دانەری جیهان"یش هەر لە ئەزەلەوە هەبووە و هەرچی لە جیهاندا هەیە لە ئەستێرەکانەوەیە، ئەستێرەناسان تەواوی شتەکان لە حەوت هەسارەکە دەزانن"[218]. بە پێی ئەوەی کە "معین" لە "نەورۆزنامەی خەیام" و لە "دبستان مذاهب" ەوە وەریگرتووە: ئەستێرە پەرستی لە لای "ئاریەکان" یش ئاسایی بووە، بەلام ئەو گریمانەیە بوونی هەیە کە دوای بەرکەوتنیان بە "بابلی" ەکان، بە دیاریکراویش دوای داگیرکردنی "بابل" لە لایەن "کۆرش" ەوە گۆرانکاری درووست بوو.

"جۆرج حبیب" جێگرەوانی سەرزەمینی ئەم ئەستێرانە لە لایەن ئێزدیەکانەوە ئاوا ڕووندەکاتەوە:

---

216- مزدیسنا و تأثیر آن در ادبیات فارسی، ل٥٦-٥٧

217- زرتشت و آموزشهای أو ل٨-١٠

218- تأریخ نهضتهای فکری ایران، ل٢٣

١- خۆر                                    شمس الدين

٢- مانگ                                  فخرالدين (دەردائیل)

٣- شێوەی فەلەکی                     ئامادين (میخائیل)

٤- ئەستێرەی بەیان                    تاوس مەلەك (ئیسرافیل)

٥- روەك و میوە و زەوی            سەجادين

٦- ئامارگری زیندومردوەکان      نصرالدين "شەمخائیل"

بەلام "الحسنی" فریشتەکان و جێگرەوانی زەوی ئەوان بەم جۆرە دادەنێت:

١- خوداوەند لە رۆژی یەکشەممەدا، فریشتەی یەکەم "عەزازیل" ی دروستکرد کە هەمان "تاووس مەلەك" ی سەرۆکی هەموو فریشتەکانە، ئەم فریشتەیە تایبەتە بە ئێزدیەکان و پەیوەندی بە هیچ میللەتێکی دیکەوە نیە.

٢- خوداوەند لە رۆژی دووشەممەدا "دەردائیل" ی دروست کرد کە "شێخ حەسەن"ە.

٣- خوداوەند لە رۆژی سێ شەممەدا "ئیسرافیل" ی دروست کرد کە "شێخ شمس الدين" ە.

٤- خوداوەند لە رۆژی چوار شەممەدا "میکائیل" ی دروست کرد کە "ابوبکر" ە.

٥- خوداوەند لە رۆژی پێنج شەممەدا "جوبرەئیل" ی دروست کرد کە "سەجادين"ە.

٦- خوداوەند لە رۆژی هەینی دا "شەمخائیل" ی دروست کرد کە "ناصرالدين" ە.

٧- خوداوەند لە رۆژی شەممەدا "نورائیل" ی دروست کرد کە "شێخ فخرالدين" ە.

بە بەراوردی ئەوەی کە جۆرج حبیب نوسیویەتی لەگەڵ بابەتەکانی پێشتر کە الحسینی هێناویەتی و بەراوردی ئەو دووانە لەگەڵ پارانەوەی بەیانیان و ناوی فریشتەکان کە پێشتر لە پەرتوکی ئێزدیاتی یەوە وەرگیراوە بەم ئەنجامانە دەگەین کە:

١- جورج حبيب، يەکەمجار ناوی خۆری هێناوە و "شمس الدین" ی بە جێگرەوەی داناوە، لە پارانەوەی ئێزدیەکانیشدا ناوی شمس الدین پێش ناوەکانی دیکە هاتووە و چەند جار ناوی ئەو دووبارە دەبێتەوە، بەلام الحسنی "عەزازیل" ی هێناوە و بۆ جێگرەوەکەشی "تاوس مەلەك" داناوە، کەچی لە پارانەوەی بەیانیاندا ناوی "تاوس مەلەك" نەهاتووە.

٢- جورج حبیب بۆ مانگ، "دەردائیل" ی داناوە و "فخرالدین" ی بە جێگرەوەی زانیووە، بەڵام الحسنی، "شێخ حسن"ی بۆ جێگرەوەی داناوە و لە پارانەوەی بەیانیانی ئێزدیەکانیشدا "فخرالدین" دووەمین ناوە، شێخ حسن دوا ناو دێت.

٣- جورج حبیب بۆ ناوی خودای شێوەی فەلەکی "میخائیل" ی داناوە و جێگرەوەکەشی "ئامادین" ی ناوبردووە ، بەڵام الحسنی "ئیسرافیل" ی داناوە و جێگرەوەکەشی "شمس الدین" ە و لە پارانەوەی بەیانیاندا ناوی "ئامادین" نەهاتووە.

٤- جورج حبیب بۆ ئەستێرەی بەیانی "ئیسرافیل" ی داناوە و "تاوس مەلەك" یشی بە جێگرەوەی داناوە بەڵام الحسنی "میکائیل" ی داناوە و بۆ جێگرەوەشی "ابو بکر=بابادین" ی داناوە.

٥- جورج حبیب ناوی خوداوەندی نەهێناوە و بۆ جێگرەوەی "روەك، میوە و زەوی" یش، "سەجادین" ی داناوە بەڵام الحسنی بۆ خوداوەند "جبرائیل" ی داناوە و جێگرەوەش "سەجادین" ە کە لە پارانەوەی بەیاندا سەجادین سێیەم ناوە و ناوی شێخادی پێنجەم ناو دێت.

٦- جورج حبیب "میخائیل" ی تایبەت بە مردو زیندوەکان داناوە بۆ جێگرەوەش "نصرالدین" ی داناوە، بەڵام الحسنی "ناصرالدین" ی بە جێگرەوەی فریشتەی شەشەمی داناوە.

٧- جورج حبیب ناوی خوداوەند (نورائیل) ی هێناوە و "یەزید" ی بە جێگرەوەی زانیووە، بەڵام الحسنی، "فخرالدین" بە نوێنەری داناوە، ناوی یەزید نە لە پارانەوەی

بەیانیان و نە لە هیچ یەك لەو قەول و بەیتانەی ئیزدیەکاندا کە من دیومن نەهاتووە. بەڵکو لە پارانەوەی بەیاندا شێخ حسن حەوتەمین ناوە.

لەم بەراوردە دا بۆمان دەردەکەوێت کە نە "حبیب و نە الحسنی" نە بایەخیان بە زنجیرەی هاتنی ناوی فریشتەکانی لای ئیزدیەکان و نە بە زنجیرەی هاتنی ناوی نوێنەرەکانی پارانەوەی بەیاتیانی ئەوان داوە و سەرەرای ئەوەش بەلاریدا بردویانن. لە بارەی ناوی فریشتەکانەوە لەوە دەچێت ئیزدیەکان ناوی "دەردائیل و شەمقائیل" یان بۆ گەیشتن بە ژمارە حەوت بۆ خۆیان زیاد کردبێت.

شایەنی باسە ئیزرائیل لە لای جولەکە و موسڵمان فریشتەی مەرگە، ئیسرافیل لە فریشتەکانی نزیکی دەرگانەی "ئیزەد" ە و یەکەم فریشتەیە کە بە فەرمانی خوداوەند کرنوشی بۆ "حەزرەتی ئادەم" برد، خوداوەند ئەوی بۆ لێدانی کەرەنای رۆژی هەستانەوە دیاریکردووە، جبرائیل لە لای "فەلە" کان لە سەرانی فریشتەکان و مژدە دەری زەکەریا و عەزرا یە، لە لای موسڵمانان لە فریشتە نزیکەکانی دەرگانەی خوداوەندە و بەهۆی ئەوەوە پەیام بە حەزرەتی محەمەد دەگەیشت، میکائیل سەرۆکی فریشتەکانە[219]، عەزازیل لە نزیکانی دەرگانەی خودابوو، تەنها ئەو بوو کرنوشی بۆ ئادەم نەبرد، خوداوەندیش "تاوس مەلەك" ی بە سەروەری فریشتەکان دانا[220] چونکە ئەو نیشانەی یەکێتی بوونی ئەو بوو.

باوەرێکی ئاوا دەربارەی "ئبلیس" لە لای بەشێك لە زانایانی ئێران بوونی هەیە، أحمد غزالی و حەللاج لەوانەن و لە چیرۆکێکی "**مثنوی**" یشدا کە "ئبلیس" لەگەڵ "معاویە" دەدوێت بێبەری بوونی "ئبلیس" بە دادوەری خوداوەندەوە پەیوەست دەکات، چونکە لەسەر جێگەی کوشتنی جگە لەو یاریە هیچی دی نەبوو، ووتی یاریکە، ئای زۆرم زانی؟[221]

---

۲۱۹- منجد الاعلام

۲۲۰- ئیزدیاتی، ل٤٥

۲۲۱- جستجو در تصوف ایران، ل١٠٧

لەوانەیە ئەم باوەرە یەکێك لە راستیەکانی بیردۆزی زانای رووسی "مار" بێت، کە دەربارەی بوونی کاریگەری ئاینی کۆنی زۆربەی "کوردان" بۆ سەر موسلمانانی ئاسیای بچوك دابنێت.[٢٢٢]

جورج حبیب دەربارەی "تاوس مەلەك" دەلێت: پیرۆزی چوارشەممە لە پەیوەستی بە "تاوس مەلەك" ە وەسەری هەلداوە و لە ئاینی "بابلی" دا چوارشەممە رۆژی خودای "نابو" ە و "عەتارد" یش نوێنەری ئەو خودایەیە.[٢٢٣] و دەلێت ئاسان نیە سەردەمی گۆرینی ناوی "نابو" بۆ ناوی "مەلەك" دیاری بکرێت.

بەلام ئەو سیاسەتی خەفەکردنەی کە پاشا ساسانیەکان بۆ بە هێزکردنی پایەکانی ئاینی "مزدیسنا" پەیرەویان دەکرد ئەم گریمانەیە بەهێز دەکات کە لە سەردەمی دەولەتی "ساسانی" دا پەیرەوانی "نابۆ" ناوێکی رەمزیان بۆ ئەو دانابێت، ئەم ناوەش شتێکی نوێ نەبووە چونکە یەکێك لە نازناوەکانی ئارامی (نابو) بووە، وا دەردەکەوێت ئاوا ناوێك لە ئاینەکانی ناوچەکەدا بلاوبووبێت، بۆ نمونە گەورە خودای شاری حەزەر (کە لە خواروی رۆژئاوای شاری موصل) ە بە (نشرا=نسرا) باز ناوبراوە، بێگومان ئەم ناوەش نازناوێکی ئارامی بووە.[٢٢٤]

سەبارەت بە نوێنەری سەر زەوی حەوت فریشتەکە لە بەشی یەکەمی مێژووچەی ئێزدیەکاندا باسی شێخ عودەی (رەنگە ئامادین) بێت، شێخ ابوبکر، شمس الدین، صدرالدین قۆنیەوی، شێخ حسن، سراج الدین ئەرمەموی، فخرالدین عراقی مان کرد. جگە لەو حەوت فریشتەیە، ئێزدیەکان یەزدانی جیاوازیشیان هەیە کە هەریەك لەوانە کارێك یان چەند کارو فەرمانێکیان لە ئەستۆیە، ئەمەش ناو و ئەرکی ژمارەیەك لەوانە:

١- پیرەفات، ئێزدی لافاو و زریان.

٢- خاتونا فەخران، ئێزد بانوی نوێنەری زایینی ژنان.

---

٢٢٢- نیکتین، کرد و کردستان، ل٤٨٨-٤٨٩

٢٢٣- الیزیدیە ل ٨

٢٢٤- الیزیدیە، ل١٨

٣- شێخ عروس، ئێزدی هەورو‌بروسکە.

٤- شاهسوار، ئێزدی شەوڕوشۆر

٥- مەمی شڤان، ئێزدی مەران (شوان).

٦- شێخ زۆزان، ئێزدی گاوان (گاڤان).

٧- شێخ موسی، ئێزدی باو نەخۆشیەکان وەکو روماتیسم.

٨- محمدرەشان: ئێزدی باران، ئێزدیەکان دەڵێن: (( مەحمەدرەشانو بڕشێنە بارانی)) محەمەد رەشان باران ببارێنە (بوکەبەبارانە)، (قردك)

٩- هاجیال، ئێزدی شێتان.

١٠- شرف الدین، ئێزدی نەخۆشیەکانی ئاوڵە و زەردویی.

١١- پیر جەروان، ئێزدی دووپشکان.

١٢- شێخ مەند، شێخی ماران.

١٣- پیر لبنا، ئێزدی هاوسەرگیری.

١٤- دەروێشی عەرد، ئێزدی زەوی.

١٥- بابا گۆشگۆش، نوێنەری نەخۆشیەکانی گوێ.

١٦- کانیا سپی پەرستگای میهر (ئەناهیتا)یە کە ئێزد بانوی نوێنەری کانیاوەکانە.

١٧- پیر بوب نوێنەری نەخۆشیەکانی پێست، وەکو بالوکە.[٢٢٥]

لە کۆتایدا دەبێت ئەوە روونبکرێتەوە ئەو حەوت فریشتەیە یان حەوت کەسەی لە ئاینی ئێزدیدا بوونیان هەیە، لە نێو کوردانی دیکەی نائیزدیشدا کە ئاینی جیاوازیان هەیە لە رووی بیروباوەڕەوە هەر ڕێزیان لێدەگیرێن و باوەڕیان پێیانە,با بۆ نمونەی ئاینی "ئەهلی هەق" ئەم دوو بەیتە بخوێنینەوە:

وە هفتینەوە و هفتینەوە    جمعیان تیان و هفتینەوە

شکاریم آورد شەلمینەوە    بهلول گورە ما و امینەوە

---

٢٢٥- جندی، خلیل گۆڤاری سەرهەڵدان ، ژمارە ٥٠٤ ساڵی ١٩٩٣، ل١٥٨-١٥٩

**حەوتمان لە یارانی جەمی هەڵبژارد کە رازونیازیان لەگەڵ بکەین**

**من بە ئارەزوی خۆم گەیشتم و نێچیری خۆم دەستکەوت**

**ئەم نێچیرەی کە پێشەوای جەمی ئێمەی لە ئەستۆ بوو "بەهلولی" ناوبوو.**[226]

حەوت فریشتەی نێو کوردان لێکچونێکی زۆریان لەگەڵ "ئەمشاسپەندان" ی ئایینی زەردەشتی و ئەرکەکانی ئەواندا هەیە و هەمان لەیەکچونیان هەیە لەگەڵ ئەو حەوت وەزیرەی کە لە ئایینی "مەزدەکی" دا لە پێشگای خوداوەندا وەستاون[227].

## ئیزدیەکان و باوەریان دەربارەی ئەفراندن

ئیزدیەکانیش دەربارەی ئەم جیهانە و دروستکردنی، هەمان شێوەی ئاینەکانی دیکە باوەریان بە یەزدانی بێ هاوتا و ئەزەلی هەیە، ئەوان لەو باوەرەدان پێش ئەوەی شتەکانی دیکە ببن خوداوەند خۆی بوونی هەبووە[228]، و پاشان جیهانی ئەفراندووە (دروستکردوە)، بۆ ئەوەی دیدی ئیزدیەکان دەربارەی ئەفراندنی جیهان بە باشی تێبگەین، لەو بارەیەوە دوو قەولی ئەوان دەهێنینەوە:

| | |
|---|---|
| **زەبونەکی منی دل مەکسورە** | **منی هەژاری دڵ شکستە** |
| **هەکە ژ با عەزیز مەلك فەخرەدین بێتن دەستورە.** | **ئەگەر لە مەلك فەخرەدینی** |
| | **خۆشەویستمان وەربگرین مۆڵەتە** |
| **ئەم دێ مەدحا دەین ژ بەحرێد کورە.** | **ئێمە دەربارەی دەریای بێبن دەدوێین** |
| **زەبونەکی منی کێم تاقەتە.** | **ئەوە منم ئەو هەژارە بێتاقەتە** |
| **هەکە ژ با عزیز مەلك فەخرەدین بێتن ئیجازەتە** | **ئەگەر مەلیك فەخرەدینی خۆشەویستمان بماندانێ مۆڵەتە** |
| **ئەم دێ ژ بەحرێد کور دەین ئوصفەتە.** | **ئێمە باسی دەریای بێبن دەکەین** |

---

٢٢٦- بۆرەکەیی، صدیق، نوشتەهای پراگندە، دەربارە یارسان اهل الحق، ل١٣

٢٢٧- سید علی مهدی تقوی، عقاید مزدك، ل٧٣

٢٢٨- الیزیدیە، ل٩

| | |
|---|---|
| لمن جەما دبون بابزەرە. | لە من كۆدەبنەوە باوان زەرد پۆشان |
| دێ ژوێ بەحرێ دەبن خەبەرە | بكەن باسی ئەو دەریایە |
| تێ هەینە دورێد جەوا هەرە | تێیدایە مرواری و جەواهیرە |
| لمن جەما دبون زەربابە | لێم كۆدەبن زەرد بایە |
| دێ ژوێ بەحرێ دەبن تەبایە | لەو دەریایە دەبن تەبایە |
| بەحرە و دۆژە و قیردنافە | دەریایە و دۆزەخە و قیری تیایە |
| مەدها بدەن كتێر | پیایا هەڵدەن زۆر زۆر |
| تەختێ تنێ دبون ئەمیر | خاوەن تەختە و هەر خۆی ئەمیر |
| "هو العالم و هو البصیر" | ئەو زانایە و هەر ئەوە ژیر |
| پەدشێ من ژ دورێ بو | پادشای من لە مرواری بوو |
| حسنا تەك ژێ دچێتبو | چاكیەكی لێ بەدی بوو |
| شاخا مەحبەتێ لێ بوو | نیشانەی خۆشەویستی لێ بوو |
| لێ بو شاخا موحبەتێ | لێی بوو نیشانەی خۆشەویستی |
| ل دەستێ (سولتان ئێزی) هەیە قەلەما قودرەتێ | لە دەستی "سولتان ئیزی" هەیە قەلەمی قودرەتێ |
| (ئەلحەمدولله و شكر) ئەز هاڤێتمە سەر پشكا سونەتێ | سوپاس بۆ خودا منی هاویشتە سەر ئەهلی سونەتێ |
| ئاشقا ئەو میر دیت و كر ناسە | عاشقانی ئەو میرە تەنها خودا دەناسن |
| ژێك ڤاڤارتن موحبەتە و كاسە | لە یەكیان جیاكردەوە خۆشەویستی و كاسە |
| كرد ركنێ چەندی ئەساسە. | دایمەزراند پایەی بنەرەتی |
| كرە ركن و ڕكنی | كردیە پایە و پایەی |
| دور ژ هەیبەتێ هنجنی | مرواری لە تاوی هەڵوەری |
| تاقەت نەما هلگری | توانای نەما هەڵیگرێ |
| تاقەت نەما لبەر بصەبری | توانای نەما ئارام بگرێ |
| دور برەنگا خەملی | مرواری چەند رەنگ خەملی |

| | |
|---|---|
| صور بو سپی بو صەفری | سوربوو سپی بوو زەرد بوو |
| دور برەنگا گەش بو | مرواری رەنگی گەش بوو |
| بەری نە عەرد هەبو، نە عەزمان هەبو نە عەرش بو | پێشان نە زەوی هەبوو، نە ئاسمان هەبوو نە عەرش هەبوو |
| کا بێژە من پەدشێ من بکێرا خۆش بو | کوا بێژە من پاشای من هاودەمی کێ بوو؟ |
| پەدشێ من خۆش سوحبەتە | پاشای من خۆش قسەیە |
| لێك رونشتبون موحبەتە | بە یەکداچوون موحبەتە |
| پەدشێ من ل وێ دەرەجێ کر حەد و سەتە | پاشای (من) لەوێ دەستی پێکرد |
| پەدشێ من حەد و سەد ل وێ چێکرن | پاشای لەوێ دەستی پێکرد |
| شریعەت و حەقیقەت ژێك جهێ کرن | شەریعەت و راستی لە یەك جیاکرد |
| سونەتە مخفی بو هنگی دەهر کرن | سونەت وونبو کاتێ دەرکەوت |
| پەدشێ من حەقیقەت ناڤدا دهنارە | پاشای من راستی لەودا نارد |
| گۆتێ: عەزیزێ من سونەت ل کو بو | ووتی: خۆشەویستی من، سونەت لە کوێ بوو |
| ل کو گرتبو وار، | لە کوێ هەواری هەڵدا |
| چی مەولایەکی منی حوکم رەوا | چەند سەردارێکی فەرمانڕەوایە |
| مەرسوم نازل بو ژ جەوا | لە ئاسمانەوە فەرمان نێرایە |
| ب قودرەتی سورا سونەتێ مالق وەستا بو ل هەوا | بەهێزی سوری سونەت وەستابوو |
| ب قودرەتێ مالق وەستابو سونەتە | بەهێزی وەستابوو ئەو سونەتە |
| و برەبەر پەدشێ خۆ ئیجازەتە | لە پاشای خۆی وەرگرت مۆڵەتە |
| گۆتێ: عەزیزێ من مەحزەرەت مەحبەتە | ووتی: خۆشەویستی من بوردن موحبەتە |
| چی مەولایەکی منی حوکم گرانە | سەردارەکەی من چەند فەرمانی گرانە |
| لناڤ وان دانا زۆر ئەرکانە | چەند پایەی لە نێوانیان دانە |
| موحبەت و عەرزی نورێ دانا وان نیشانە | خۆشەویستی و مایەی روناکی دانا بە نیشانە |
| عەرزێ نوری بابە | مایەی رووناکی باوانە |
| دو جەهوەر کەفتنە ناڤە | دوو گەوهەرن کەوتنە ناوە |

| | |
|---|---|
| ئێك عەینە ئێك چاڤە | یەکێ بینین یەکێك چاوە |
| ئێك عەینە ئێك بەصەرە | یەکێ چاوە یەك بینینە |
| پەدشێ من دا دورێ ب نەدەرە | پاشای من دادوەری دانسقەیە |
| پەدشا دزانت کی ل سەرەکی لبەرە | پاشا دەزانێت کێ لە سەرە، کێ لەبەرە |
| قەندیل ژ بانا نزلی موحبەت کەفتە ناڤە | چرا لە سەرەوە دابەزی و خۆشەویستی تێدا دیارە |
| پەدشێ من پێ هلینا بو چاڤە | پاشای من پێهەلهێنا بوو چاوە |
| کا بێژە من چی گۆتە دوری ژێ وەریا بو ئاڤە | کوا پێم بڵێ چی بە مرواری ووت لێی چۆرا ئاوە |
| ئاڤ ژ دوری دەوریا | ئاو لە مرواری دەچۆرا |
| بووە بەحر و پەنگیا | بوو بە دەریا و پەنگیا (پەنگی خوارد) |
| پەدشێ من مەرکەب دبەست و ئاڤ گەریا | پاشای من کەڵەکی بەست و بە ئاودا گەڕیا |
| پەدشێ من ل مەرکەبێ دبو سوارە | پاشای من لەکەڵەك دەبو سوارە |
| پەدشایە و هەر چار یارە | پاشایە و هەر چوار یارە |
| تێك سەیرین چار کنارە | دەینواڕیە چوار کەنارە |
| للالشێ سەکنین گۆت: ئەڤ حەق وارە | لە لالشێ وەستا ووتی: ئەمە هەق هەوارە |
| حەق وارە و سەکنین | هەق هەوارە و راوەستان |
| پەدشێ من هێڤێن هاڤێتە بەحرێ و بەحر مەینین | پاشای من هیوای هاویشتە دەریا و دەریای مەیان |
| دوخانەك ژێ دوخنی، هەر هەفت عەزمان پێ نژنین | دوکەلێك لەو بڵندبوو هەر حەوت ئاسمان پڕبوون |
| پەدشێ من عەزمان بیراستە | پاشای من ئاسمانی کرد ئاراستە |
| موحبەتا ژ قەڤدا راستە | خۆشەویستی لە بنەرەتدا راستە |
| پەدشێ من مەکان دانە تەخت ڤەگوهاستە | پاشای من جێگەی دا بە تەخت و گواستی وە |
| پەدشێ من ل عەزمانا کریو صەفەرە | پاشای من لە ئاسماندا کردبوی سەفەرە |
| ئەو بو چارا صەفەر کریو کەر بکەرە | ئەو بو چوار سەفەری لـەبەرە |
| کرە رکنی چەنـــــدی مەنبەرە | کردیە پـــایە چـــەند مینبەرە |

| | |
|---|---|
| ئاشـــــقا وەژێ خـــــــــەبەردا | ئاشقان هەواڵیان پێـــــــــدا |
| شاخەکی دی ژێ بـــــــــــەردا | لـــــــقێکی دیکـــەی بەریدا |
| کرە رکنێ چەندی عـــــــــەردا | کردیە پایە چەند زەوی بـــوو |
| عەرد مابوی بەهتی | زەوی مات و شەیدا بوو |
| خدودەکێ خەدتی | ............................ |
| گۆ عەزیزێ من: عەرد بێ ویێ سوریێ ناتەبتی | ووتی خۆشەویستم: زەوی بەبێ لالش ناوەستێ |
| بەعدی چل صالی بهژمارە | دوای چل ساڵ ژمارە |
| عەردی بخورا نەگرت حەشارە | زەوی نەوەستا لەو کارە |
| هەتا لالش بناڤدا دهاتە خوارە | هەتا لالش بەناویا هاتە خوارە |
| لالش کو دهاتە | کە لالش هات |
| لعەردێ شین دبو نەباتە | لە خاکدا شین دەبو گیایە |
| پێ زەینین چیقاس کنیاتە | پێی رازاوە ئاڵ و واڵایە |
| کو کنیات پێ دزەینین | کە کائیناتی پێی رازاوە |
| چار قسمەت تێك هنجنین | چوار مادەکە تێك رژاوە |
| ئاخە و ئاڤە و بایە و ئاگری | خاکە و بایە و ئاگرو ئاوە |
| قالبی ئادەم پێغەمبەری ژێ نژنین | پەیکەری ئادەم پێغەمبەری لێدروستکراوە |
| شەمبو دانـــــــە ئەساسە | شەممە بەبناغە دانراوە |
| ئینیێ کر خلاســـــــە | لە هەینی دا کۆتایی پێهنراوە |
| بەعدی هەفت صەدصال، هەفت سور هاتنە دوران کاسە | دوای حەوسەد سال حەوت سور هات سورانەوەی کاسە |
| بەعدی ب هەفت صەدصال، هەفت سور هاتنە منداڤە | دوای حەسەد ساڵ حەوت نوێنەر هات |
| قالب مابوی بێ گـــــاڤە | پەیکەر مابووی ئەو کاتە |
| گۆتە روحێ تو بۆچی ناچیتە ناڤە | بە ڕووحی ووت بۆ تۆ ناچیتە ناوی |
| روحێ گو لبا ئاشقا وە مەعلومە | روح ووتی لای ئاشقان وایە |
| هەتا بۆ من ژ بانا نێن شار و قوومە | هەتا ئامازەم بۆ نەیە لەو سەرە |

نیڤەکا روحیٚ و قالبیٚ ئادەم پیٚغەمبەر زۆر توخومە
نێوان روح و پەیکەری ئادەم پێغەمبەر زۆر سنورە

شاز و قردم هاتن وەحدوریٚ
شاز و قدوم هاتن و حەزەریٚ (......؟)

و نورا موحبەتیٚ هنگفتە سەریٚ
و رۆشنایی خۆشەویستی کەوتە سەری

روح هات و قالبیٚ ئادەم پیٚغەمبەر نێوریٚ
روح هات و پەیکەری ئادەم روناك بوو

ئادەم پیٚغەمبەر ژ ویٚ کاسیٚ ڤەدخوار و ڤەدژیا
ئادەم پێغەمبەر لەو کاسەی دەخواردو دەژیا

مەست بو هژیا
مەست دەبوو دەهەژیا (دەلەرزا)

گۆشت لیٚ هوریا، خون تیٚ گەریا
گۆشتی گرت، خوێنی تیٚ گەڕیا

ئادەم پیٚغەمبەر ژ ویٚ کاسیٚ ڤەدخوارە
ئادەم پێغەمبەر لەو کاسەی دەخواردەوە

کەرامەتا ویٚ کاسیٚ هاتە دیارە
کەراماتی ئەو کاسەیە دیارە

ئەو ئادەم پیٚغەمبەر پێنگژی پی دبو شیارە
ئادەم پێغەمبەر پێی ژیا و بە ئاگا هات

ئادەم پیٚغەمبەر ژ ویٚ کاسی ڤەخوار و پیٚ خۆش تیٚ
ئادەم پێغەمبەر لەو کاسەی خواردەوە و پێی خۆش بوو

کەرامەتا ویٚ کاسیٚ هات و گەهشتیٚ
کەرامەتی ئەو کاسە هات و گەیشتیٚ

ئەو ئادەم پیٚغەمبەر هلگرت و برە هشتیٚ
ئەو (خودا) ئادەم پێغەمبەر پژمی هوشیارە

پەدشیٚ من رەبل صەمەدە
پاشای من خودای بیٚ نیازە

ژ ئادەم ویٚ بون جوقەتە
لە ئادەم کەوتنەوە جوت جوتە

ژیك ڤاڤارتن هەفتی و دو ملەتە
لێك جیابوونەوە حەفتا و دوو میللەتە

بوی بەدیلا نوحیٚ نەبیا
بوو بە جێگرەوەی نوح پێغەمبەرە

قەومەك دیٚ دەهریت ل دلیٚ وان هەیە زۆر کفریا
گەلێك دێن دڵیان پر لە کفرە

ئەو ژك ویٚ ل خودیٚ خۆ بنە یاخیا
لە خودای خۆیان یاخی دەبن

بەعدی ویٚ هیواتیٚ
لە دوای ئەوان

قەومەك دیٚ داهریت د دلی دا نامینت خۆڤا ئیمانیٚ
گەلێك دێن لە دڵیاندا نامێنیٚ ترس و ئیمان

ئەو ژك دێ غەرق بن ب ئاڤا طۆفانێ
بەعدی وان بەدیلا
قەومەك دێ دەهریت نەی عەدیلا
نوقتەك دێ نازل بت ژ قەندیلا
وێ ل ناڤ دەهریت براهیم خەلیلا
براهیم خەلیل ژ نوتفەکە صادقە
ب سێ حەرفا دبو مولتەقە
هەتا خودێ خو ناس کر بهەقە
هەتا خودێ خۆ بحەق ناس کر
ل گەل عازر و نەمرود صەنەما بەحس کر
ئەو گیانێ خۆ ژ کفریی خلاس کر
بەعدی وان خەلیلوللآیە
عیسایە و موسایە
مەحمەدێ نو کاملە
موحبا وی وێ هنگفتە هندەك دلە
ختمی میرا سەیدێ مورسلە
یا سەید ل مورسلی
چەند بەدیل هاتن و بهوری
چەند خاس هاتن، من هژمری
ئەو سلتان شێخادی یە
تانجە ژ عەول هەتا بئاخری

نقوم دەبن بە ئاوی لافاو و زریان
لە دوای ئەوان
گەلێك دێن نا یەکسانن
نیشانەیەك لە چراوە دادەبەزێت
لە ناویا ئیبراهیم خەلیل پەیدا دەبێت
ئیبراهیم خەلیل لە نوتفەیەکی راستە
رێز و جوانی ئەو سێ پیتە
هەتا خودای خۆی بە حەق ناسیوە
هەتا خودای خۆی بە هەق ناس کرد
لە گەڵ ئازر و نەمرود باسی بتی کرد
ئەو گیانی خۆی لە کفر رزگار کرد
لە دوای ئەوان خەلیلوللآیە
عیسایە و موسایە
محەمەدی نوێ و کامڵە
خۆشەویستی دەکەوێتە هەندێك دڵە
کۆتا میر و گەورەی مورسیلە (نێرداو)
ئەی گەورەی پێغەمبەران
چەندان هاتن و رۆشتن
چەند چاکان هاتن و رۆشتن
هەر سوڵتان شێخادیە
تاجی هەوەڵ و کۆتاییە[٢٢٩]

---

٢٢٩- ئیزدیاتی، ل٥٢-٥٧

باوەری ئیزدیەکان سەبارەت بە دروستکردنی "جیهان" لە گەڵ باوەری گەلانی دیکە جیاوازیەکی وەهای نیە، قەولەکانی ئەوان کە سینە بە سینە هاتوون، هەر چەند ئەم قەولانە لە پەرێشانی و پێکاچوون خاڵی نیە، لە گەڵ ئەوەشدا دەکرێت لە دوا هەنگاودا بەم ئەنجامانە بگەین:

١- یەکەمجار نە زەوی هەبووە و نە ئاسمانەکان و نە عەرش، تەنها خوداوەند خۆی هەبووە و دل نەوایی خۆی کردووە.

فخرالدین عراقی لەم بارەیەوە چەند جوانی ووتووە:

| | | |
|---|---|---|
| آن دمی کەز هردو کون آثار نبود | – | برلوح وجود نقش اغیار نبود |
| معشوقە وعشق ومابهم بودیم | – | در گوشە خلوتی کەدیار نبود[٢٣٠] |

ئەو دەمەی کە لە هەردوو گەردون دا بونێك نەبوو– لە تابلۆی بوندا نەخشەی مێملێك نەبوو

یارو ئەوین وئێمە پێکەوە بووین – لە گۆشەی تەنهایدا دیارێك نەبوو

خوداوەند لەبەر خۆشەویستی و ئەوینی خۆی جیهان و گەردونی دروستکرد.

٢- شەریعەت و رێگای دیاریکردو پایەکانی ئەو دووانەی دانا و خۆشەویستی و روناکی بەخشی.

٥- دوای ئەوەی دەریاکانی لەبارانی مرواری پرکرد لەگەڵ چواریارەکەی خۆیدا لەسەر رووی ئاوەکە کەوتە جوڵە، بۆیە لە بنەرەتدا ئەم چوار یارە لەحەوت فریشتەکە نزیکتر دەبن، ئەم چوار یارە لە ئاینی "مەزدەگ"دا بەشێوەی چوار هێز لە پێشانگای خوداوەندا وەستاون:

---

٢٣٠- کلیات عراقی، ل٣٧٨

أ- هێزی وەرگرتن ب- هێزی هۆش ج- هێزی یاد د- هێزی شادی.[231]

٤- **باوەری ئیزدیەکان بەرامبەر پەیامبەران:** ئیزدیەکان باوەری تەواویان بە پەیامبەران هەیەو ڕێزیان لێدەگرن، بەڵام ئەولیاکانی خۆیان لەوان بەباڵاتر دەزانن، شایەنی باسە ئیزدیەکان دەربارەی دورستکردن (خلق) قەولێکی دیکەیان هەیە بەڵام بەهۆی ئەوەی لە قەولەکەی پێشتر زۆر نزیکە، نوسینەوەی بە پێویست نازانین.

## باوەری ئیزدیان دەربارەی شوێنگرەوە و دۆنادۆن:

شوێنگرتنەوە بریتیە لە گۆرینی شتێك (موجود) بۆ شتێکی دیکە، وەکو گۆرینی خاك بۆ پێشینەکەی یان بریتیە لە توانای شتێك لە شتێکی دیکەدا وەکو توانای تەنێك لە بۆشایدا، بەپێی ئەو پێناسەیە شتێك کەشوین دەگرێتەوە (شوێنگرەکە) پێویستی بە شوێنێکە لەویدا شوێنی بگرێتەوە و لەوکاتەدا کە ئاماژە بە یەکێ لەو دووانە دەکرێت ئاماژەیە بە یەکێکی دیکە.[232]

بەلام دۆنا دۆن (تناسخ): بریتیە لە پەیاپەیی تێپەرینی کات و سەدەکان وەکو دەلێن هەریەك لەوانە فەرمانی پێشتر پووچ دەکەنەوە، بەپێی ئەوە دۆنادۆن بریتیە لە دەرچوونی گیان (روح) لەپەیکەرێك و چوونە پەیکەرێکی دیکەوە، بەبێ ئەوەی کات بکەوێتە نێوانیانەوە.

ئەوانەی باوەریان بە دۆنادۆن هەیە باوەریان وایە کەگیانی مرۆڤەکان دوای مەرگ، کاتێ لە لاشەکان ئازاد دەبن کەتەواوی کە ماڵاتی دەرونیان بەکردار بەدەست هێنابێت و شتێك لە کەماڵاتی قۆناغی هێزی نەمابێت بەلام ئەگەر کەمالاتی هێز مابێتەوە، گیان (رەوان) لە لەشێکەوە بۆ لەشێکی دیکە دەگۆیزرێتەوە تا ئەو پەری کە ماڵ بەدەست

---

٢٣١- عقاید مزدك، ل٧٢

٢٣٢- لغت نامە دهخدا، ژێر ووشەی حلول

بهێنێت ئەوسا رووت دەبێتەوە، ئەم گواستنەوەیە بە دۆنادۆن (نسخ) ناودەبرێت، بەڵام ئەگەر ئەم گواستنەوەیە بۆ لاشەی جانەوەرێك بێت "مسخ"ی پێدەوترێت و ئەگەر بۆ روەكێك بێت "رسخ" و ئەگەر پچێتە تەنێكەوە (فسخ)ی پێدەوترێت.[233]

بەپێی سەرچاوە جیاوازەكان لەوانە (دبستان مذاهب) باوەربوون بە شوێنگرتنەوە و دۆنادۆن لەكۆنەوە لەلای گەلانی ئاریایی هەبووە و پاش ئیسلامیش زۆر لەو شۆرشانەی بە (شعوبیە) تۆمەتبار كراون وەكو خورەم دینان، باوەریان بە شوێنگرتنەوە و دۆنادۆن هەبووە.

لەفەرهەنگنامەی دهخدا دا هاتووە كە كۆمەڵێك لە صوفیەكان بەناوی (حلولیە) باوەریان وایە كە رِوحی خودا لە ئادەم و پێغەمبەران و ئیمامانـدا جێنشین دەبێت.[234] فۆرلانی دەڵێت: نوسراوە ئیزدیەكان زۆر بەروونی ئاشكرایدەكەن كە باوەریان بە شوێنگرتنەوە و دۆنادۆن هەیە.[235]

"خدری سلیمان"یش دەڵێت: ئیزدیەكان باوەریان وایە كە گیان نامرێت بەڵكو كاتی مردن لە لەشێكەوە بۆ لەشێكی دیكە دەگوێزرێتەوە، ئەم كردارەش كەسە مردوەكە دیاریدەكات كە گیانەكەی بۆ كام لەش بگوێزرێتەوە.

ئەگەر كرداری باش بووبێت گیانی لە لەشی یەكێك لە مەزناندا جێگیر دەبێت. ئەگەر بەدكرداریش بووبێت گیانی بەپێی پلەی بەدكرداریەكەی خۆی لەلاشەی جانەوەرێكی خراپ و ئازاردەردا دەردەكەوێت، تا سزای كارە خراپەكانی خۆی ببینێت.

لە وانەشە خوداوەندی مەزن ببەخشێت و سەربەست بێت،[236] بێگومان ئەم باوەرەی ئیزدیەكان شتێكی تازەنیە چونكە پێشنینانی ئەوان و هەروەها مەزنانی وەكو حەلاج[237]

---

٢٣٣- لغت نامە دهخدا، ژێرو وشەی تناسخ

٢٣٤- دبستان مذاهب، ل٧

235 -The Religion of the Yazidis، p.50

٢٣٦- ئیزدیاتی، ل٥٤

٢٣٧- اقبال، خاندان نو بختی، ل٢٢٤

شەمس، فخرالدين عراقى و خەلكانى ديكەباوەريان بەم ووتانەبووە. لە نوسراوەكاندا هاتووە: شەمس دەلێت ((هەموويان لە خۆتدا ببينەرەوە لە موساوە.... نەمرود))[238].

فخرالدين عراقى دەلێت:

ولدت امى اباها ان ذا من اعجبات – وأبى شيخ كبير فى حجور المرضعات[239]

دايكم، باوكى خۆى هێنايە دنياوە كەزۆر سەيرە –

باوكم پيرەمێردێك بوو لە باوەشى دايەنەكاندا

بەراستى سەرنجراكێشە، لە جێگەيەكى ديكەدا دەلێت:

بهركه من نگرم صورت تو مى بينم — ازين ميان همه درچشم من تومى آيى

زرشك تانشناسد تراكـــــسى — هردم جمال خود بلباس دگر بيارايى[240]

سەيرى كێدەكەم روخسارى تۆ دەبينم — لـــەنێو ئەو هەمووە هەر تۆ دێتە پێش چــــاوم

لە حەسوديدا تا كەس تۆ نەنـــــاسێ — هەردەم جوانى خۆت بەبەرگى خەلكى ديكە برازێنە

بەلام خودى عراقى ئەم ووتانە نە بەشوێنگرتنەوە و نە بە يەككرتن دەزانێت بەلكو دەلێت:–

گويد آن كــس درين مقام فضول — كـــــەتجلى نداند او زحلـــول

ئەو كەسە لەوپلە مەزنەدايە دەلێت — گيان لە شوێن گرتنەوە نــــــــازانێت

شايەنى باسە "ئەهلى حەق"يش باوەريان بە جێنشين و دۆنادۆن هەيە، ئەوان دەلێن خوداوەند لە لەشى (على)دا جێنشين بووەو فريشتەكان لە پەيكەرەكانى ديكە دا دەردەكەون.[241]

---

٢٣٨- صاحب زمانى، ناصر الدين، خط سێيەم، بەشى دووەم، ل٨

٢٣٩- كليات عراقى، ل٣٨٨

٢٤٠- كليات عراقى ل٣٩١

٢٤١- نوشتەهاى پراگندە دربارە يارسان ل١١٨–١٢٠

**باوەری ئێزدیەکان سەبارەت بە مردن:**

ئێزدیەکان لەو باوەڕەدان ئەوی کە دەمرێت لاشەیە و گیـان نامرێـت و بـەردەوامی بـە ژیان دەدات، لە بەر ئەوە ئێزدیەکان ووشەی مـردن (مـەرگ) بـەکارناهێنن بـەڵکو دەڵـێن کراسی گۆری (جلی گۆری)، هۆنەرێك بە ناوی "میرابی" لەو بارەیەوە دەڵێت:

آزاده تاتواند، از قید تـن بـرآیـد      از پوسـت گـر نباشـد از پیرهن برآید[٢٤٢]

**ئازادە تابتوانێت با لە بەندی لەش دەربێت    گەر لە پێستیش نەبێت باله کراس دەربێت**

زەردەشتیەکان باوەڕیان وایە گیان نەمرە، گیانی مرۆڤی خۆ پارێز دوای گەیشـتن بـە لانەی ﴿بیری چاك، ووتەی چاك، کرداری چاك﴾ بە ڕووناکی نەمری دەگات، بەڵام گیـانی دۆزەخی دوای ئەوەی کە لە "پردی جنوت" هەڵدەدێرێت بە پلەکاندا تلدەبێتەوە و هەتا بە لانەی خۆی لانەی ئازار دەگات.[٢٤٣]

ئێزدیەکان باوەڕیان وایە لـە ڕۆژی مەرگدا فریشـتەکان گیـانی مردوەکـە بـۆ "لالـش" دەبەن، پێش ئەوەی لە پردی "سیرات" بپەڕنەوە، چەند فریشتەیەك بە پێشوازیەوە دێن ئەگـەر مردوەکـە لـە دنیـادا کـرداری بـاش بووبێـت بـە نـەی و دەف ژەنـین و هەلهەلـەوە فریشتەکان پێشوازی لێدەکەن و بە دوکەڵی ڕوەکـی "قـانگ"ەوە بـەرەو بـازاری زانسـت "سوکا مەعریفەت" دەیبەن[٢٤٤].

---

٢٤٢- دبستان مذاهب، ل٧

٢٤٣- تمدن و فرهنگ ایران، ل٩٤

٢٤٤- خدری سلیمان، گوندیاتی

فۆرلانی لەم بارەیەوە نوسیوەتی: گیانەکان نەمرن و لەژیان بەردەوام دەبن چونکە گیانی مرۆڤە چاکەکان دوای ئەوەی لە لەش جیادەبنەوە بۆ بەهەشت دەچن[245] و باسی بردنی بۆ لالش ناکات.

خدری سلێمان دەنوسێت: ئەگەر مرۆڤە مردوەکە بەدکرداربێت فریشتەکانی چاودێری دۆزەخ بەگورز لێدان تێیدەکەون و بۆ کۆرِی دەهێنن، گیانی مردو چاك بێت یان خراپ بوو بێت لەکۆرێکدا کە لە "بازاری زانست" بۆ ئەو بەرپاکراوە، شێخ، پیر، برای کۆتایی و دۆستانی ئەو ئامادەن، ئەگەر رزگاربێت بایەخی پێدەدەن، ئەگەر بەدکاربووبێت هیچ بایەخی پێنادەن، ئەگەر لەکاتی لێپرسینەوەدا کردارە باشەکانی لە بەدەکانی پترتربێت بۆ بەهەشتی دەبەن، ئەگەر یەکسان بوون جێگەی "تاریکستان" دەبێت، ئەگەر خراپەکانی زۆرتربوون بۆ دۆزەخ دەبرێت.

## ساجی مەنجەنیق و شیوی پر لە مار و دوپشك چاوەرێیەتی.[246]

فۆرلانی دەڵێت: ئەگەر مردو بەدکاربووبێت بەردەوام گیانی ئەو لەگەڵ گیانە پیسەکاندا لە شەروململانیدا بووبێت، یەکسەر دوای مەرگ راپێچی دۆزەخی دەکەن، دوای ناشتنی لاشەکەی فریشتەی مەرگ لەبەرامبەر مردوەکە پەیدادەبن بە دەنگێکی گڕ و ترسناك و روویەکی تووڕەوە، پرسیاری لێدەکەن، مردو لە وەڵامدا هەرچی کردووە بۆی دەژمێرێت بەڵام فریشتەی مەرگ بە وەڵامەکەی ئەو رازی نابێت و داوای لێدەکات وەلامەکانی بنوسێت و بیداتێ، مردوو دەڵێت: من خامەو مەرەکەب و کاغەزم لە کوێ بوو؟

245 -The Religion of Yazidi، p.51

٢٤٦- گوندیاتی، ل١١١-١١٢

فریشــتەی مــەرگ پێــی دەڵێــت: نینۆکــەکانت خامــە و لیکــی دەمــت مەرەکــەب و کفنەکەشت کاغەزتە، کرداری خۆت بنوسە و واژۆی بکە و بمدەرێ.

مردوو گوێڕایەڵی دەنوێنێت، دوای ئەوەی تەواو دەبێت، مرۆڤی باش بۆ ئاسمانەکان و بەدکار بۆ دۆزەخ دەبرێن.

فۆرلانی درێژەی پێدەدات و دەڵێت: هەندێك لە بروایەدان کە فریشتەی گیان، مردوان بۆ گۆرستان دەبەن.

ئەگەر گوناهکار گوناهی خۆی بشارێتەوە، فریشتەی مەرگ کفنەکەی پیشان دەدات و دەڵێت: ئەی ئەمە نوسراوی خۆت نیە؟ ئەگەر دیسان ڕەتیبکاتەوە، ئەوا فریشتەی مەرگ بۆ گەلیەکی قوڵتر لەوەی کەبۆیدیاریکرابوو دەیبات.

شایەنی باسە ئێزدیـان باوەریـان وایـە کـە گیـانی مردوەکـان دەکرێـت وەکـو تکاکـار "شفیع" ئیش بۆ مردوەکە بکەن، بۆ ئەم کارە لە ساڵی یەکەمی مەرگی مردووەکەدا سێ جار بۆنەی تایبەتی دەگێرێت، بۆنەی یەکـەم لـە سـێیەم ڕۆژی یـان حەوتـەم ڕۆژی دوای مەرگیدا ئەنجام دەدرێت، دووەم بۆنە دوای سێ مانگ و سێیەم بۆنە پاش ساڵێك ئـەنجام دەدرێت و دوا بۆنەش گرنگترینیانە.

شایەنی باسە مردووەکـە ڕوو لـە ڕۆژهـەلات و دەسـتەکانی لەسـەر سـنگی دادەنـێن و دەیشارنەوە.[٢٤٧]

ئەمەش بەشێك لە قەولی ئێزدیانە لە بارەی مەرگەوە:

| | |
|---|---|
| کەرمکەن و دەنگ هلینن | فەرموون و دەنگ هەڵێنین |
| تەوقینیٚ و یاسینا لسەر من بخوینن | تەڵقین ویاسین لسەر من بخوێنن |
| ناڤیٚ خودیٚ و طاوس مەلەك لسەر من بینن | ناوی خوداو تاوس مەلەك لەسەر من بێنن |

The Religion of the Yazidis. P.52 -٢٤٧

| | |
|---|---|
| ئەو بوو كێلا سەرێ صەدرێ | ئەو بوو بە كێلی سەر سنگی (سنگم) |
| وێل خەلكێ نازكی لەطیفی هەردی | وای لە خەڵكی ناسكی بەنازی هەردی |
| جایزە ل غەریبا بگری قەدری | دەشێت لە نامۆ بگری قەدری |
| كرمەخانی یە بێ دەری | كردمیانە خانویەكی بێدەری |
| دووهاتنە سەر من وێ دخوونن وەكی تەتەری | دووهاتنە سەرمن دەدوێن وەكو تەتەری |
| من ئینا هەفت دۆلابێد ئاشا ل سەری | حەوت بەرداشیان ناوەتە سەری |
| دوو هاتنە سەرمن وێ دكەنە قیروقالە | دوو هاتنە سەرم، دەكەن قیڕو قالە |
| ئیكی كەڕە ئێكی لالە | یەكێ كەڕە یەكێ لاڵە |
| وی ژمن دپرسن حال و حەوالە | لێم دەپرسن حال و حەواڵە |
| ترسا منە ژێ كەرە | ترسی من لەویانە كە كەڕە |
| دمبووسێ وی هەفتی پەڕە | گورزی دەستی هەفتا پەڕە |
| رۆژێ سێ جارا تێتە ب دیاری منڕە | رۆژی سێ جار دێتە ئەم بەرە |
| ترسا منە ژێ لالە | ترسم لەوەیانە كە لاڵە |
| هەفتی باتمان[٢٤٨] دمبووس هەیە لپالە | حەفتا باتمان گورزی لە باڵە |
| ئەوێ لسەر روحا من بوویە حەوالە | ئەو لەسەر گیانی من زاڵە |
| كو لمن دهلینت دمبووسی | كە لە من هەڵدێنێتەوە گورزی |
| وێ ژێ دچن برق و برووسی | پریشك دەهاوێژێ بریسك و هوڕی |
| ژ ترسادا دل و هناڤید من پێكڤە دنووسی | لە ترسانا دڵو هەناوم دەنوسێ |
| گاڤا من دوەستە | هەنگاوەكانم ڕادەوەستێ |
| هەفتی باتمان دمبووس ئاسن هەیە لدەستە | هەفتا باتمان گورزی ئاسنی ل دەستە |

٢٤٨- بۆ كێشانەی شت بەكارهاتووە و هەر باتمانێك شەش هۆقەیە.

ژ ترسادا زمانێ من شکەستە   لە ترسانا زمانی من شکەستە

دوو هاتنە سەر من ژمن دپرسی   دوو هاتوون لە من دەپرسی

چەقماقێ وان وەکە کورسی   چەخماخیان وەکو کورسی

مسکینۆ بن ئادەمۆ توچی ئنسی توچی جنسی؟   داماو نەوەی ئادەم تۆ لەکام ئنسی لە کام جنسی؟

بن ئادەمۆ هوون لکوونە   نەوەی ئادەم ئێستا لەکوێیت

هەرۆ سبا رادبن شەرێد وە دنوونە   هەموو بەیانیەك شەر لە نوێ سەردەدرێنێت

مەچوو خێرێد وە نەدینە   ئێمە هیچ سودێکمان لە ئێوە نەدیووە

بن ئادەمۆ ئەم بخۆ خێرین   نەوەی ئادەم ئێمە بۆ خۆمان خێرین

ئەم رازدارێد جەبێرین   ئێمە رازداری خودای جەبارین

ئەم خودانێد خێرا نائازێرین   ئێمە چاکەکاران ئازارنادەین

دوو هاتنە سەر من چاڤ دمەزن وەکە تاس   دوو هاتنە سەرم چاویان گەورە وەکو تاس

تلی د وەنە وەکە مساس   پەنجەکانیان وەکو مەساس[249]

نێنووك دوەنە وەکە داس   نینوکەکانیان وەکو داس

من گۆ: سەد خۆزما وێ روحێ یە بێ گونهە یە بێ سووچ بێ بناس   من ووتم: سەد خۆزگەمان بەوگیانەی بێ گوناهوپاکە پێ بناس

دوو هاتنە سەر من چاڤ دمەزن وەکە ستێر   دوو هاتنە سەرم چاو گەورە وەك ئەستێرە

تلی د وەنە وەکە بێر   بەنجەکانیان وەکو بێلە

نێنوك دوەنە وەکە کێر   نینۆکیان وەکو کێردە

---

٢٤٩- دارێکی درێژی سەر ئاسنینە بۆ پاککردنەوەی گاسن بەکارهاتووە.

من گۆ: صەد خۆزما روحا ئەهلل خێر نەصەد خۆزما روحا عنکیر        من ووتم: سەد خۆزگەمان بە گیانی پاك، نەسەد خۆزگە بەگیانی شەر

دوو هاتنە سەر من سەحتەل سخوون        دوو هاتنە سەرمن دەنگ ناقۆلاوگڕ

دبلندن سەحتەل مەزن        کەتەو زلەو مەزن

ژ ترسادا دل و هناڤێد من تێك دلەرزن        لە ترسانا دل و هەناوم هەڵدەلەرزن

دوو هاتنە سەر من دڕەشن وەکی فەقیر[250]        دوو هاتنە سەرمن رەش وەکو فەقیر

بسك دنەرمن وەکی حەریـــر        بسـکیان نەرم هەروەکو هەریر

ڤێرا هەبوو نیشانــا میر        هەیان بوو نیشانەی میـــــــــــــر

گاڤـــــــــــــا دهاتن و دڤەدمین        کاتێ دەهاتن و دەچـــــــــــــوون

چێرەکێ دکەلمین        بە ئاستەم دەدوان

ب علمەکی دعەلمین        زانستێك فێرببوون

ئەو بوو علمێ قاتێ[251]        ئەو بوو زانستی قاتـــــــــــــێ

زەبێنی یا ئەز برمە سەر پێ پرا صەراتێ        منیان بردە سەر پردی سیراتێ

ئەو جیێ خودێ لێ دکەت شفاتێ        ئەو جێیەی خودێ وەردەگرێ شفاتێ (شفاعەت)

ئەو شفاتە یە وەیە        ئەو پارانەوەیەی ئێوەیە

پرا صەراتێ، ئالیەك بەهشتە ئێك تارییە ئێك دۆژەیە        پردی سیرات سەرێکی بەهشتە، سەرێکی تاریکیە، یەکێکی دۆزەخە

---

٢٥٠- لەبەشی سێیەمدا دەربارەی "فەقیر" ڕوونکردنەوە دەدرێت.

٢٥١- لەوانەیە ئەو زانست و زانیاریە بێت کە لە خانەقای "تۆقات"دا خوێنرابێت.

هاوەکە یار و برێد ئاخرەتێ سەر گونەکارێد برا هەیە          هاوەکو یارو برای کۆتایی لە لای گوناهکاری برانە

ئەم شفاتا ب نیشانە          ئەو پارانەوەیە بە نیشانە

پرا صەراتێ، ئالیەك بەهشتە ئێك تارییە و ئێك دۆژەیە          پردی سیرات سەرێکی بەهەشتە، سەرێکی تاریکیە، یەکێکی دۆزەخە

هاوەکە یار و برێد ئاخرەتێ سەر گونەکارێد برانە          هاوەکو یارو برای کۆتایی لەلای گوناهکاری برانە

ئەم دکێمین خودێی تەمامە[٢٥٢]          هەر ئێمە کەمین و خودێ تەواوە

---

٢٥٢- گوندیاتی، ل١١٩-١٢١

# بەشی سێیەم:

# چینە کۆمەلایەتیەکانی-ئاینی ئیزیدی

ئیزدیەکان ئەنجومەنێکی کۆمەلایەتی ئاینیان هەیە، ئەو ئەنجومەنە گشت کاروباری ئـاینی و دنیـایی ئـەوان بـەڕێوەدەبات و پارێزگاریـان لێـدەکات، سـەرۆکایەتی ئـەو ئەنجومەنەش لەلاین (میر)ەوە سەرۆکایەتی دەکرێت.

**میر:** بنەماڵـەی فـەرمانرەوا مـەزنترین و بـەهێزترین ئەنـدامی خـۆی بـۆ "میر"ایـەتی هەلدەبژێرێت، میر نوێنەری یەکێتی ئیزدیانە و توانای ئاینی و رامیاری ئەم تایەفەیە لـە دەستی ئەو دایە و ناونیشانی گرنگی (میری حەج)ی هەیە.

داخوازیەکانی ئەو بێ مـەرز و سـنورە، ئـەو بێگوناهـە و پارێزبەنـدی هەیـە و هەرچـی پەیوەست بەوبێت بەرز دەنرخێنرێت، مەگەر "کۆچەك"ەکان ئەگینا هێچ کەس بۆی نیـە جل و بەرگی میر بشوات و نابێت ئاوەکەشی لە زێراب بکرێت.[253]

گوێرایەڵی مـیر کـارێکی شـەرعیە، لەبـەر ئەوەیـە هـەر کەسـێك لـە فەرمانـەکانی ئـەو سەرپێچی بکات یـان بێـوێڵی بـەو بکـات یـان لەگـەڵ کەسـێك کـە "مـیر" لێـی توڕەبێـت هاودەمی بکات، هەر پلەو پایەیەکی هەبێت خۆی تووشـی تـاوان دەکـات، خـۆی تووشـی داگیرکردنی گشت مافە مەدەنیەکان دەکات.

بەو پێیە خزم و خوێشیان و هەتا هاوسەری ئەو کەسەی کە میر لێـی تووڕەیـە لەبـەر خاتری "میر" لەو کەنار دەگرێت و ئەو تەنها دوو رێگای لەبـەرە یـان بـەر لێبـوردنی مـیر دەکەوێت یان ئەو بوغزاندنە دەیکوژێت و هیچ کەس خەمی ئەو ناخوات.

گوێرایەڵی لە میر و رێزگرتن لەو بە خواپەرستی ئەژمێردرێت، هەر فەرمانێك بکات ئەو فەرمانە بۆ هەموان وەك یەکەو هیچ کەس بۆی نیە دژایـەتی و بەربـەرەکانی بکـات و ئـەو

---

٢٥٣- لەم بەشەدا دەربارەی "کوچەك" روونکردنەوە دەدرێت.

کەسانەی بێکەسن (میر) دەبێتە وارسیان ئەو لێپرسراوی ئەو ژنانەشە کە کەسی نزیکیان نیە، ئیتر دەبێت دادپەروەر، بەویژدان، خاوەن شەهامەت، راستگۆ و کار درووست بێت.

شایەنی باسە ئەگەر گوناهی بچوکیش ئەنجام بدات، ئیزدیەکان لێیناگرن و بە دڵپاکی ئەوی دادەنێن و گوێی نادەنێ.

دەبێت میر بۆ هاوکاری و خزمەتی هەزارەکان هەوڵبدات و بەرپرسیارێتی ناردنی "تاوسەکان" لە ئەستۆی ئەوەو نابێت ئەوان بەبێ مۆڵەتی ئەو تاوسەکان دەربکەن.[254]

میر کلاوێکی تایبەتی لەسەر دەکات لە ریزی تاج دادەنرێت و دەبێت هەمیشە ئەو کڵاوەی لەسەردا بێت چونکە ئەوە سونبلی ئاینەکەیانە.

شایەنی باسە گشت منداڵە نێرینەکانی بنەماڵەی میر پارێزبەندی گیانیان هەیە. میر هەتا دەمرێت لە پلەو پایە دا دەمێنێتەوە و هیچ کەس ناتونێت لایبات و هیچ کەس بوێری ئەوەی نیە بیکوژێت مەگەر لەلایەن کەسەکانی خۆیەوە لە ناو ببرێت، لەبەر ئەوە هەر لە کۆنەوە زۆرێك لە ئەندامانی بنەماڵەی میر بەوە گەیشتوون تا لەمردن پارێزراوبن تا لە پیلانگێری بە دووربن و دڵسۆزی بنەماڵەکەیان بن و لای بنەماڵەکەیان زۆر خۆشەویست بن دەبێت بۆ بەختەوەری ئەوان هەوڵێکی تەواو بدات.

هەر کاتێك "میر" بمرێت یان بکوژرێت، گشت ماڵ و موڵکی ئەو بۆ جێنشینەکەی دەبێت جگە لە جلەکانی کەبۆ "بابا شێخ" دەبێت، کەس بۆی نیە دەست بۆ شتەکانی میر بەرێت.[255]

شایەنی باسە ئێستا میری ئیزدیەکان لە بنەماڵەی "شێخ ابوبکر"ە، چونکە لە پاش کوشتنی "شێخ حسن ٦٤٤ کۆچی"وە ئەمارەت لەدەستی ئەم بنەماڵەیەدایە، ئەمەش لەوەوە بوو کە کەسێك بەناوی "محمد" کەوتە ململانێ لەگەڵ شێخ حسن کوری عودەی دووەم و میرایەتی لەدەست بنەمالەی "ئەمەوی" دەرچوو، نەوەکانی "شێخ حسن" تەنها کاروباری ئاینی خۆیان کە بریتیە لە خوێندن و فێرکردن و مارەبڕین و پاراستنی

---

٢٥٤- لە لاپەرەکانی دواتردا روونکردنەوە دەربارەی دەدرێت

٢٥٥- الیزیدیون، ل٤٧-٦٤

پەرتووکە دەستنوسە ئاینیەکان، پێشەوایەتی نوێژی شەوی "لیله القدر" کەلە گۆرستانی شیخادی ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوان ماوەتە.[256]

**بابا شێخ:** سەرۆکایەتی ئاینی ئیزدیەکان لە ئەستۆی بابا شێخە، ئەو زۆر جێگەی ڕێز و نەوازشی ئیزدیانە و لە هەموو ڕوویەکەوە پاکە و بێگوناهە.[257]

الحسنی نوسیویەتی: ئەو لە گشت کاروباری ئاینیدا بڵندترین سەرچاوەیە، سەرۆکی پێشەوایانی ئاینی یانە و لە ئاینی ئیزدیدا هاوتای "پاپ"ی مەسیحیەکانە. بنەچەی بابا شێخ بۆ شێخ فخرالدین دەگەرێتەوە، جگە لە کاروباری ئاینی، پاراستنی بەرماڵی شێخادی لە ئەستۆی ئەوە. ئەوە کە فەرمانی ڕۆژو، نوێژ و زەکات و خواپەرستییەکانی دیکە ئاشکرا دەکات، کاروباری کوچەکەکان ڕێکدەخات، هەندێك کاریان پێدەسپێرێت، میر لە گشت کاروباری ئاینیدا لەگەڵ بابا شێخ راوێژ دەکات و لەکاروبارەکانی دیکەدا "میر" بە پێی ڕێنماییەکانی ئەو کاردەکات.

هەندێك جار بابا شێخ بەرماڵی شێخادی ڕادەخات هەتا ئیزدیەکان ببینن و سوود لە بەرەکاتی ئەو بەرماڵە ببینن و نەزرەکانی خۆیان پێشکەش دەکەن.

شوێنی نیشتەجێبوونی هەمان ئەو گوندەیە کە خۆی خەڵکی ئەوێیە، بۆی نیە جوانیەکانی خۆی بتاشێت یان جگە لە کەوچکەکەی خۆی بە کەوچکی کەسێکی تر بخوات یان پەرداخی کەسێکی دیکە بۆ خواردنەوە بەکاربهێنێت یان لەسەر بەرماڵی کەسێکی دیکە دانیشێت.

کاتی بۆنەی زیارەت و تەواف بەپێی خاوس بەشداری بۆنەکان دەکات، جلەکانیشی ڕەنگیان سپیە و پشتوینێکی ڕەشی نزیکەی حەوت مەتری دەبەستێت، الحسنی بەنۆمەتری داناوە، ئەم پشتوێنە هەندێك ئەلقەی پیرۆزی تێدایە، هەمیشە چەند کەسێك لە شێخەکان لەژێر فەرمانی ئەوداں و لە دیهاتەکانی خۆیاندا فەرمانەکانی ئەو ئەنجام دەدەن، بادەخواردنەوە بۆ بابا شێخ حەرامە.

---

٢٥٦- شاکر فەتاح، یەزیدیەکان و ئاینی یەزیدی ل٨٠

The Religion of the Yazidis. P.26 -٢٥٧

هەرکاتێك بابا شێخ بمرێت یان میر لایبدات (کە زۆر دەگمەنە)، شێخان و سەرانی تیرەکان لە مەزارگەی شێخادی یان لە شوێنی ئەمارەت لە گوندی (باعەدرێ) بۆ هەلبژاردنی "بابا شێخ" کۆدەبنەوە هەتا جێنشینێك بۆ ئەو لە بنەچەی "شێخ فخرالدین" هەڵبژێرن، هەلبەتە ڕەزامەندی "میر"یش لەمبارەیەوە پێویستە.[٢٥٨]

**شێخ:** کەشیش ئیسحاق دەڵێت: شێخ کەسێکە کە بەیت و قەولی ئێزدیەکانی لەبەرە پۆشاکیان سپیە، تەنها کڵاوی ژێر سەر و بەندەکەیان ڕەنگی ڕەشە، ئەوان نۆکەری (شێخ عودەی)ن، زێوانەن و مەزارگەی ئەو دەپارێزن و "ئاگری پیرۆز" بە ڕۆشنی دەهێڵنەوە خۆراك و دار بۆ سەردانکەرانی مەزارگەی شێخادی ئامادە دەکەن و نیشانەو پلە و جێگەی ئەوان رایەڵەیەکی سوور و زەردە یان سوور و نارنجی یە لە رووی جلەکانیان بە دەوریانەوەیە[٢٥٩] ئەو ژنانەش کە لە شێخەکانن بەرگ و نیشانی شێخایەتیان هەیە و هاوشێوەی پیاوەکان رێزێکی زۆریان هەیە.

شاکر فەتاح و الحسنی، شێخانی ئێزدییان بە سێ خانەدان داناوە کەبریتین لە: ئادانی، شەمسانی، قاتانی، شاکر فەتاح سەرچاوەی گشت شێخەکان بۆ سەر (عودەی دووەم) کوری (صخر مروانی) دەباتەوە، الحسنی ئادانیەکان بە (عدنانی) و قاتانی بە **(قحطانی)** زانیووە.

پێویستە لێرەدا روونکردنەوەیەك بدرێت، ئادانی ناوێکە دەچێتەوە سەر (ئادی=عادی) کە هەمان (عدی) دەبێت، بەڵام قاتانی دەچنەوە سەر خانەقای (تۆقات) کە لە ئاسیای بچوك بۆ (فخرالدین عراقی)یان دروست کردبوو، بەڵام شەمسانی ئەچنەوە سەر "شەمسی تەبریزی"، ئەندامانی ئەم سێ خانەدانە بۆیان نیە ژن و ژنخوازی لە نێوان خۆیاندا بکەن.

شایەنی باسە دەبێت هەموو ئێزدیەك شێخێکی خۆی هەبێت و لە بەرێوەچوونی ژیانی شێخەکەیدا درێغی نەکات. شێخیش لە بەرامبەردا بۆ ئەم بپارێتەوە و لەکاتی مەرگیشدا

---

٢٥٨- الیزدیون، ل٦٧-٦٨ و یەزیدیەکان ل٨٠-٨١

٢٥٩- حبیب، الیزیدیە، ل١٣١

ئامادەی بێت و شێخ کفن و داپۆشینی بۆ ئەنجام بدات[260]، لەم بارەوە ئاینی ئیزدی و ئاینی مانەوی نزیکیان هەیە.

فۆرلانی دەڵێت: چینی شێخەکان لە پێنج بەرە باب کەوتونەتەوە، ئەندامانی ئەم پێنج بنەچەیە خۆیان بۆسەر پێنج کەسی پیرۆز دەبەنەوە، وەکو دەڵێن روحانیانی خۆرسك بوون و نەیانتوانیووە هاوسەرگیری بکەن، بۆ ئەوەی کوێرنەبنەوە منداڵی نێرینەیان بۆ خۆیان ئافەریدەکردووە و بەهۆی هاوسەرگیری ئەو کورانەوە بنەماڵەی شێخەکان ماونەتەوە و بەرێوەبردنی کاروباری هەر کۆمەڵە ئیزدیەك بە یەکێك لەو شێخانە سپێرراوە.

ئەرکی شێخیش ئەوەیە کە پەیرەوانی خۆی بۆ کاری چاك دنە بدات و لەکاری بەد دووریان بخاتەوە، ئەوان لە دەستدرێژی و نوستن لەگەڵ ژنان و کچانی پێشەوایانی روحانیانی خۆیان و هەتا لەگەڵ بێگانەکان "نائیزدیەکان" یش بەدووربگرن، چونکە ئەم کارانە بەگەورەترین گوناه لە بەرچاو دەگیرێت[261]، درێژەی پێدەدات و دەڵێت: ئیزدیەکان لەوباوەڕەدان کە "شێخ عودەی" چوار برای هەبووە: ابو بکر، عبدالقادر، اسماعیل، عبدالعزیز، بەڵام عبدالعزیز هاوسەری نەبووە بەبێ نەوە ماوەتەوە، شێخ عودەی برای کورێکی بۆ ئافریدە کردووە، لەو کوڕە سەرانی یەکەم چینی خودایی هاتنە دی. چینی دووەمی شێخەکان لە چوار برای دیکە بوون کە بریتین لە: شمس الدین، فخرالین، ناصرالدین، سجادین، چینی سێیەمی شێخەکان لە "شێخ سن" هاتونەتەدی، شێخ سن هاوسەری نەبووە کوڕێکی بەناوی "شرف الدین" ئافریدەکردووە، ئیزدیەکان لە خۆشەویستی شێخ عودەی ڕێزیان لە "شرف الدین"ی جێنشینی گرتووە و نازناوی "محترم شێخ"یان پێبەخشیووە.

شایەنی باسە ئیزدیەکان بروایان بە برای ئەو دنیا یان برای مەعنەوی هەیە، برای ئاینی کە لێرەدا باسکراوە ڕەنگە هەر لەو قسەیەوە هاتبێت.

---

260 -The Religion of the Yazidis. P.26
261 -The Religion of the Yazidis. P.25

## پیر:

ووشەی پیر لەزمانی (کوردی و فارسی)دا بەمانای سەرۆکی بەتەمەن دێت. یان بەرامبەر ووشەی "شیخ"ی زمانی عەرەبیە، پیر لە رووی پلە بەندیەوە لەدوای شێخ دێت، بەڵام لەبەرئەوەی کەشیش ئیسحاق تەنها یەك پیری ناسیووە و ئەویش رۆڵێکی گەورەی لەناو ئیزدیەکاندا هەبووە، لەرووی چینایەتیەوە پیر لە پێش "شێخ"، هاتووە.[٢٦٢]

پەیوەندی پیر و شێخ لە ئاینی ئیزدیدا وەکو پەیوەندی "کەشیش و ئەسقەف"وایە، پیرانیش دەچنەوە سەر بنەماڵە بەناوبانگەکان، کە نەژادیان لە کەسایەتیە خوداییەکانە، شاکر فەتاح، بنەماڵەکانی قضیب البان، پیر محمد رەشان، پیرانی جیال، پیرمام شوان، پیر جروان و پیر حاجی محەمەدی بەناوبانگترین بنەماڵەی پیرەکانیان خستۆتەوە[٢٦٣]. پیران بۆیان هەیە لە نێوان بنەماڵەکانی یەکتردا هاوسەرگیری پێك بهێنن. کاری پیران ئەوەیە بە شار و دێهاتەکاندا بڵاودەبنەوە و بانگەوازی ئاینەکەیان دەکەن، فۆرلانی دەڵێت: ئەرکەکانی پیر هەمان ئەرکەکانی شێخەکانە[٢٦٤] و دەبێت لە جەژنی "جمایی" و چلەی هاوین و چلەی زستاندا لە مەزارگەی شێخادی ئامادەبن و خواردن بە موریدەکانی خۆیان بدەن و لە کاروباری ئاینیدا رێنماییان بکەن، شایەنی باسە هەر پیرە و کۆمەڵێك موریدی خۆی هەیە. دەبێت ئەم موریدانەش لە سەدا پێنجی دەرامەتی خۆیان بەپیرەکەیان بدەن.[٢٦٥] هەرکاتێك نەخۆش بکەون یان ناخۆشی و بەڵایەك روویان تێبکات روو لە ماڵی پیرەکەیان دەکەن، چونکە لەو بروایەدان پیرەکان توانای چارەسەری نەخۆشیەکان و چاری گرفتەکانیان هەیە.

---

٢٦٢- قصه دیانه الداسنیه، ملحق کتاب الیزیدیه، ل١٣١

٢٦٣- یەزیدیەکان، ل٨٤-٨٥

264 -The Religion of the Yazidis. P.26

٢٦٥- الیزیدیون، ل٦٩

## فەقیر:

دەستەواژەی فەقیر بەو مانایە نیە کەلە زمانی عەرەبیدا بەکەمدەست دێت، بەڵکو لەلای ئێزدیەکان بەمانای خواپەرست و واز لە دنیا هێناو دێت، جاری وا هەیە "قەرەباش"یشیان پێدەڵێن، کە بە تورکی بە "سەر رەش"دێت فەقیرانی ئێزدی پۆشاکی تایبەت بە خۆیان هەیە کە بریتیە لە: کلاوی رەش (وەکو کڵاوەکەی مەولانایە کە لە مۆزەی قۆنیەدا پارێزراوە)[٢٦٦] و شەرواڵی سپی و خەرقەیەکی خوری رەش و پەتێکی باریکی رەش کە "تەوق"ی پێدەڵێن و لە ملی دەکەن، پێخەفیشیان خوریە، بەڵام نابێت رەنگی شین بێت، چونکە ئێزدیەکان رقیان لەو رەنگەیە.

فەقیرەکان لەلای گشت ئێزدیەکان جێگەی رێزن، چونکە ئەوان خاوەنی ئیلهامی خوداین و ئەو خەرقەیەی کە دەیپۆشن پەیوەندی بە "شێخ هادی"ەوە هەیە.

شایەنی باسە بۆ هەموو ئێزدیەك هەیە بچێتە ناو چینی فەقیرەوە و رێگەپێدراوە، بەمەرجێك میری ئێزدیان لاری لێی نەبێت. ئەو کەسەش کە دەیەوێت ببێت بە فەقیر، دەبێت ماوەی چل رۆژ خەلوەت بکێشێت و لەو چل رۆژەدا جگە لە باوکی خۆی و ئەو فەقیرەی کە خۆراکی بۆ دەهێنێت نابێت هیچ کەس ببینێت، دەبێت رۆژانە لە بەیانیەوە هەتا خۆرئاوا هیچ نەخوات و دەبێت تەنها دوو شەرواڵ لە قوماشی سپی و تەوقێکی رەشی هەبێت، ئەم بەندە(تەوق) ئەوەی فێردەکات کە دەبێت لە گشت خراپەو گوناهەکان دوورەپەرێزبێت. کاتێك کە چلە نیشنیەکەی تەواو دەبێت دەبێت گشت خەڵکی دەوروبەری خۆی بەم بۆنەیە بانگهێشت بکات. لەو میوانداریەدا لەلایەن فەقیرێکی روحانیەوە کەلەلایەن بنەچەی "شێخ حسن"ەوە هەلبژێراوە خەرقەیەکی پێدەبەخشرێت، لەو بۆنەیەدا نوێنەری شیخ حسن، ئەم بە ئامادەبوان دەناسێنێت و چەند ووتەیەك بەناونیشانی ئامۆژگاری و ئاگاداربوونی فەقیری نوێ، دەڵێت ئەم ئامۆژگاریانە گشت ئەو شتانە دەگرێتەوە: کە خەڵك دانیشتبو نابێت ئەم پاڵبکەوێت،

---

٢٦٦- ژياننامەی مەولانا جلال الدين، وێنەكانی باشكۆی.

شایەتی درۆ نەدات، سوێندی درۆ نەخوات، ژنبازی نەکات، سەیری ژنی خەڵك نەکات، لەسەر خەرقەکەی دانەنیشێت، بە دەستی خۆی سەری شانە نەکات، مەگەر یەکێك لە هاوڕێیانی بۆی شانە بکەن. کاتێك فەقیرێك دەمرێت جگە لە فەقیرەکان نابێت دەستی کەسی دیکەی بەربکەوێت و بۆنەی کفن و شاردنەوەشی لەلایەن فەقیرەکانەوە ئەنجام دەدرێت.[267]

بەجێیە لێرەدا باسی ئەوە بکەین کە پشت کردنە خێروخۆشی دنیا بۆ نزیك بوونەوە لە خوداوەندی مەزن، هەر لەکۆنەوە لە نێو گەلانی جیاوازدا هەر هەبووە و شتێك نیە کە لەدوای هاتنی ئاینی ئیسلامەوە لەناو گەلاندا پەیدابووبێت، کەیخوسرەو ئەسفەندیار دەڵێت: ((چەند کەسێك لە دانایان کە بە کردار و گوفتاری باش بە بەناوبانگ بوون و پەرتووکی مەزنی ئابادیان"[268] سەر مەشقیان بوون، کۆبوونەوە سەر لە "جی ئەمزام"ی کوڕی "ئاباد ئازاد"بدەن کەلە دوای باوکی پیاوچاك و خۆپارێز و پێشرەو بوو، لە دامێنی کێوێکی دوور لە خەڵك ژیانی بەسەر دەبرد.))[269].

## قەواڵ(بـــــــــێژەر):

هەر چەند قەوال لە زمانی عەرەبیدا بە مانای فرەوێژدێت، بەڵام لەلای ئێزدیەکان بە ئەندامی کۆمەڵێك دەڵێن کەلە بۆنە ئاینیە جیاجیاکاندا "سرودی ئاینی" دەخوێنن و نەی و دەف دەژەنن، ئەوانە بە چالاکترین ئەندامانی ئیزدیەکان هەژمار دەکرێن چونکە نوێنەرایەتی میری ئیزدیانن بۆ ناوچە دوور و نزیکەکان دەچن و سروده ئاینیەکان بۆ ئیزدیەکان دەخوێنن. قەواڵەکان هەر لە منداڵیەوە، مناڵەکانی خۆیان فێری دەف لێدان و نەیژەنین و ئاواز خوێندن و سەماکردن دەکەن[270] و زانیاری نهێنیەکانی ئاینی ئیزدیان

---

٢٦٧- اليزديون، ل٧٠-٧١ و یەزیدیەکان ل٨٦-٨٨

٢٦٨- دبستان مذهب، ل٦

٢٦٩- دبستان مذهب، ل١٠

٢٧٠- اليزديون، ل٧١

فێردەکەن. هەرچەند قەواڵەکان بە بەشێك لە ڕوحانیەکان ئەژمار ناکرێن و ڕێزێکی زۆریان لێناگیرێت، بەڵام بە نۆکەری مەزارگەی شێخادی ئەژمار دەکرێن[٢٧١] و لە کۆتای بۆنە ئاینیەکاندا مەزارگەو گۆرەپانی شێخادی خاوێن دەکەنەوە و شانازیش بەم کارانەی خۆیانەوە دەکەن. پێشتر قەواڵەکان بۆیان نەبوو لەگەڵ چینەکانی دیکەدا ژن و ژنخوازی بکەن، خەریك بوو بەرەو نەمان دەچوون، ناچار "بابا شێخ" مۆڵەتی دانێ لەگەڵ خەڵکە گشتیەکەدا هاوسەرگیری بکەن.

شایەنی باسە قەواڵەکان لە بنەچەدا عەرەب نەژادن و کاتی خۆی کە شێخ عودەی لە "شام"ەوە هاتووە، باوانی ئەم قەواڵانەش لەگەڵ شێخ لە "هەکاری"ەوە هاتوون، بۆیە کوردەکان، عەرەبیان پێدەڵێن.[٢٧٢]

لایارد نوسیویەتی: بەرگی قەواڵەکان سپی یە و کڵاوی ڕەش لەسەر دەکەن، بەڵام بۆیان هەیە پۆشاکی ڕەنگی دیکەش بپۆشن[٢٧٣]، کاتێك لە بۆنەی جماییەیساڵی ١٩٩٣دا بەشداریم کرد، قەواڵەکان بەرگی عەرەبیان پۆشیبوو ئەوەی لەلام سەیر بوو ئەوەبوو ناچاربوون سرودەکانیان بە زمانی کوردی دەخوێند، چونکە نزیکەی زۆربەی سرودەکانی ئەوان جگە لە چەند قەسیدەیەك نەبێت هەمووی بەزمانی کوردیە.

شایەنی باسە لە ئاینی "مەزدەك"یدا یەکێك لە دوانزە بونەوەری ڕوحانی و یەکێك لە چوار هێزی ڕاوەستاو لەبەرامبەر خوداوەندا بەڕیز بێژەران و دەنگ خۆشان دەبن[٢٧٤].

کوردانی "ئەهلی حەق"یش وەکو ئیزدیەکان موزیك یان لا پیرۆزە و لە بۆنە ئاینیەکانیاندا سرودەکانی کتێبی "سەرئەنجام"[٢٧٥]، بەنەواو "ئاواز"ی تەنبورەوە دەخوێنن[٢٧٦].

---

٢٧١- The Religion of Yazidis، p.28

٢٧٢- یەزیدیەکان، ل٨٩

٢٧٣- حبیب، الیزیدیه ل١٣٢

٢٧٤- عقاید مزدك، ل٧٣

٢٧٥- کتاب مقدس یارسان اهل حق، ل١٥

بەڵام ئەم کارە بە توێژێکی دیاریکراوی ئەوانەوە تایبەت نەکراوە، لەوانەشە کاتێك کە لە مەڵبەندە گرنگە ئاینیەکانی خۆیان دوور کەوتبنـەوە ئـەم گشـتگیریە سـەریهەڵدابێت و بلاوبوو بووبێتەوە.

## کۆچـــەك:

وەکو دەستەواژە بەمانای مورید، شاگرد، سۆفی و سـەرەتای رێچـکەدێت[277]. بـەلام لەلای ئێزدیەکان بە کۆمەڵێك لە خەڵکی گشـتی دەوترێـت کـە پۆشـاکی تایبـەتی خۆیـان هەیەو بەوە لە ئێزدیەکانی دیکە جیادەکرێنەوە کە جلـەکانیان رەنگـی سـپیە و شـاڵێکی رەش یان سور دەپۆشن، ئەڵقەی مسی پێوەیـە و سەروپێچـی سـپی[278] لەسـەر دەکـەن، ژمارەیان سێ سەد کەسێك دەبێت، هەر ئێزدیەك لـە خـۆی را ببینێـت ڕیـازەتی تایبـەتی "کۆچەك"ەکان ئەنجام بدات، دەتوانێت ئـەو رێگەیـە بگرێـت و لـە مەزارگـەی شـێخادی، جێگەیەك هەیە بەناوی "منبەری چل شێخ" بـۆ ئـەوێ دەچێت و دواتـر سـەردانی "چـل چراغ" دەکات و سوێندی سەرسپاردن بۆ شێخ عودەی دەخوات و واز لە دنیا دەهێنێت و چل جار (هەرجارەی چل رۆژ) رۆژو دەگرێـت، ئینجـا دووبـارە سـەر لـە مەزارگـەی شـێخ عودەی دەدات و سەردانی چل چـراغ دەکاتـەوەو بـۆ مینبـەری چـل مـیر دەروات و دوای ئەوە بە خزمەتی بابا شێخ دەگـات، هـەتا رێگـەی ئەنجامـدانی ئەرکـەکانی "کۆچـەك"ی پێبسپێرێت[279]. وەکو ووتمان ئەمانە نۆکەری مەزارگەی شێخادی و مەزارگـەکانی دیکـەی ئێزدیـەکانن، ئـەوان زۆر بـە شـانازیەوە خزمـەتی زیارەتکـەران دەکـەن و هیچیشـیان لێوەرناگرن. داروکۆتەرەی چێشتخانەکانی پەرستگە و خاوێن کردنەوەی مەزارگـەکان لـە

---

٢٧٦- نوشتەهای پراگندە دربارە یارسان اهل حق ل١٥

٢٧٧- فرهنگ معین، زیر واژە کوچك

٢٧٨- الیزیدیون، ل٧٢

٢٧٩- هەمان سەرچاوە ل٧٣

دوای بۆنەکان لە ئەستۆی ئەوانە.[٢٨٠] کاتێك نەخۆشیەك، قات و قڕیەك سەرهەڵدەدات، بابا شێخ کۆچەکەکان کۆدەکاتەوە و داوایان لێدەکات، بۆ چارەسەری ئەم بەڵایە نوێژ بکەن و لە دەرگانەی خوداوەند بپاڕێنەوە، جاری وا هەیە شەو و ڕۆژێك لە باری پارانەوەو خوداپەرستیدا دەبن تا ئەو کاتەی هۆکاری پەیدابوونی ئەو بەڵایە دەزانن، ئەوسا هەواڵ بە بابا شێخ دەدەن تا ئەو هەوڵبدات ئەو بەڵایە لاببات[٢٨١].

یەکێکی دیکە لە کارەکانی ئەم کۆچەکانە بریتیە لە ئاگاداربوون لە سەرئەنجامی مردووەکان و هەواڵدان بە کەسوکاری مردوەکان، گومانیشی تێدا نیە لە سەر فەرمانی بابە شێخ بەم کارە هەڵدەسن[٢٨٢].

**مورید**: بە واتای کەسێکە کە هەمیشە خێر و چاکەی خەڵکی دەوێت یان کەسێکە کە پەیرەوی پیر دەکات و لەوەوە شارەزایی تەریقەت دەبێت[٢٨٣]. ئیزدیەکان، مورید بەو خەڵکە دەڵێن کە لە نزمترین چینی کۆمەلایەتیە و گشت خەڵکە هەرەمەکیەکە دەگرێتەوە، مورید زۆر بە گەرمی گوێرایەڵی پێشەوا ئاینی یەکانی خۆیان دەکەن و بە بێ پەرچدانەوە فەرمانەکانی ئەوان ئەنجام دەدەن. بە پێی ڕێنماییەکانی ئاینی ئیزدی نابێت ئەم چینە دەست لە کاروباری ئاینی وەربدەن و تەنانەت مافی پرسیاری نهێنی یەکانی ئاینەکەشیان نیە.

مورید ژن بێت یان پیاو، دەبێت شێخێك و پیرێکی تایبەت بە خۆی هەبێت و نەزرو سەدەقەکانی خۆی بەو بدات و ڕێنمایی ئاینی لەوانەوە وەردەگرێت، ئەگەر یەکێك لەو دوانە بمرن یا "میر" دەریبکات، دەبێت مورید بچێتە لای "میر" و داوای لێبکات، شێخێك

٢٨٠- The Religion of the Yazidis p28

٢٨١- یەزیدیەکان، ل٩١

٢٨٢- هەمان سەرچاوە

٢٨٣- فرهنگ معین، زیرواژە مرید

یان پیرێکی دیکەی بۆ دیاریبکات، میریش دوای ئەوەی شتێکی لێوەردەگرێت کەسێکی دیکەی بۆ دیاریدەکات. هەموو تاکێکی ئیزدی جگە لە شێخ و پیر دەبێت هەر کەسەو براو خوشکێکی کۆتایی لە روحانیەکان هەبێت، ئەو برا و خوشکە کاروبارە مەعنەویەکانی یان بۆ ئەنجام دەدەن و رۆژی هەستانەوە لە دەربارى خوداوەند بۆ یان دەپارێنەوە، بۆیە لە سەری پێویستە هەموو بەیانیەك سلاو لەو خوشك و برا کۆتاییەی بکات و رازیان بکات، کە پۆشاکی نوێ بۆ خۆی دەکات دەبێت خوشکە مەعنەویەکەی یەخەکەی بۆ بکاتەوە، کاتی مردنیش دەبێت ئەو دوو کەسە لە لای تەرمەکەی ئامادەبن و لە کاروباری کفن و شاردنەوەکەیدا لەگەڵ شێخ و پیرەکەیدا هاوکاربن[٢٨٤].

شایەنی باسە مەزارگەی شێخ عودەی پێنج کەسیی لێیە بە "چاوش" بانگیان دەکەن ئەوانە هاوسەرگیری ناکەن و هەمیشە لە مەزارگەی شێخ عودەی دەمێننەوە و هەمان پۆشاکی کۆچەکەکان دەپۆشن، لە بۆنە ئاینیەکاندا لەگەڵ کۆچەکەکاندا لە کۆری تایبەتی "بابا شێخ" دا دادەنیشن، بە هۆی ئەوەی هەمیشە لە شوێنی کارەکەیانن، وەکو بژێوی ژیانیان "صدقە" لە خەڵکی وەردەگرن[٢٨٥].

لە مەزارگەی شێخادی کەسێکی دیکە هەیە "خەزنەداری شێخادی" پێدەڵێن، رۆشنکردنی چراکانی مەزارگە و شەونشینان و پارێزگاری رۆنی چراکان لە ئەستۆی ئەوە[٢٨٦]. دەبێت ئەوەش بڵێین لە نێو ئیزدیەکاندا ژنانی روحانیش بوونیان هەیە و وازیان لە شوکردن هێناوە و لە پەرستگاکاندا سەرگەرمی خزمەتی جۆراوجۆرن[٢٨٧].

شایەنی باسە هەر لە کۆنەوە پلەبەندی کۆمەڵ لە نێوان گەلانی ئاریایی و گەلانی دیکەدا هەبووە، کەیخوسرەو ئەسفەندیار دەڵێت: نەخشێنەری بوونەوەر، خەڵکانی بە چوار چین درووستکردووە:

---

٢٨٤- الیزیدیون ل٧٣ یەزیدیەکان ل٩

285 -The Religion of the Yazidis، p28

286 -The Religion of the Yazidis، p28

٢٨٧- هەمان سەرچاوە

١- هێربودان و موبەدان و زانایانی ئاینی و خوداپەرستان، کە فەرمانبەرانی کاروباری ئاینی دەگرێتەوە.

٢- پاشاکان و پاڵەوانان کە بۆ کاروباری جیهان، دەوڵەت، دادپەروەری و دژایەتی ستەم هەوڵدەدەن.

٣- جووتیاران و کاسبکاران، هونەرمەندان و پیشەسازان.

٤- بەردەستان و نۆکەران و خزمەتکاران[٢٨٨].

بەڵام لە ئاینی زەردەشتیدا خەڵکی بەسەر چوار چیندا دابەش دەکرێن:

١- موبدان (پیاوانی ئاینی).

٢-سەرلەشکران و شازادەکان.

٣- بازرگانان

٦- پیشەسازان[٢٨٩]

## خودا پەرستی و بۆنە ئاینیەکان لە ئاینی ئــــــیزدیدا

**نوێژ:** نوێژ هێمای خاکێتی و گوێرایەڵیە، ئەو جوڵە و کردارانەی لە کاتی نوێژکردندا کەسی نوێژکەر ئەنجامی دەدات باوەردارێتی ئەو دەسەلمێنن.

هەرلە دێرزەمانەوە مرۆڤ لەبەرامبەر ترسی هێزە سروشتیەکاندا ڕێزی نواندوە. نوێژی ئێزدیەکان وەکو ئەو نوێژە نیە کە لە ئاینەکانی دیکەدا ئەنجام دەدرێت، بەڵکو نوێژی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەوان کاتی خۆرهەلاتن و کاتی نیوەڕۆ و کاتی خۆر ئاوابوون، کە بەرجەستەبوونی چەمکەکانە، زەوی ماچ دەکەن، ئینجا ڕوو لە خۆر دەکەن و دەپارێنەوە.[٢٩٠] هەڵبەتە پارانەوەی هەلهاتنی خۆر و ئاوابوونی خۆر تابەتن و جیاوازن.

---

٢٨٨- دبستان مذاهب ل٩-١٠

٢٨٩- آموزگار، ژاله مجله دانشگده ادبیات دانشگاه تربیت معلم ژماره(٢)، ل٣٨

٢٩٠- الیزیدیون، ل ٧٦

لەبەرئەوەی لە بابەتی "حەوت فریشتە"کەدا، بەشی یەکەمی پارانەوەی هەلهاتنی خۆر باسکراوە و ئێستا هەر بەشی دووەمی پارانەوەی هەڵهاتنیخۆر و گشت پارانەوەکانی خۆرئاوابوون دەکەین.

**نوێژی ئێزدی:** پێش دەسپێکی نوێژکردن، ئەو کەسە دەست و روخساری خۆی دەشوات و پشتوێنەکەی دەبەستێت و روو لە خۆر دەکات، دەستەکانی لەسەر یەك دادەنێت و دادەنەوێتەوە و دەست بە پارانەوە دەکات[291].

| پشکا دووێ<br>هەڵهاتنی خۆر | بەشی دووەمی پارانەوەی |
|---|---|
| نور ژ نورێ شفقی | رۆشنایی لە رۆشنایی هەڵدێ |
| سبحانە ژتە خالقی | پاك و بێگەردی ئەی خوداوەندێ |
| مەلەکە ل بەر تفقی | فریشتە لە بەرامبەرت ریز دەبێ |
| ژ مالێ هەتا مالێ | لەماڵێك هەتا ماڵێ |
| شێشمس... خودانێ سیقالی | شێخ شەمس خاوەن سیقاڵێ |
| ئەم لە شێشمس نابرین خیالی | ئێمە لە شێخ شەمس نابڕین خەیاڵێ |
| دەرەجێ هەتا دەرەجێ | لە پلەیە هەتا پلەیە |
| شێشمسە خودانێ فەرەجێ | شێخ شەمس خاوەن دەرگەیە |
| ئەم دێ دەست و دامانێد شێشمس طواف کەین | ئێمە دەست و دامێنی شێخ شەمس ماچ دەکەین |
| شوتا کەعبە تو للاهێ و حەجێ | لە جێی کەعبەی خوداو حەجێ |
| ژ ستونێ هەتا ستونێ | لە ستونێ هەتا ستونێ |
| شێشمس خودانێ مەعریفەت و ئەرکان و ناسینێ | شێخ شەمس خاوەن زانین و پایەو ناسینێ |
| ژ چافی هەتا دەفی | لە چاوێ هەتا دەمێ |

٢٩١- ئیزدیاتی، ل٢٧

| | |
|---|---|
| مۆرا شێشمس لێ دکەڤێ | مۆری شێخ شەمسی لێدەکەوێ |
| مەیدانا مەزنا گەرما ناهێلین بنڤی | مەیدانی مەزن گەرمە و ناهێلین بنەوێ |
| سەری هەتا پێیا | سەری هەتا پێیا |
| یا شێشمس تە نەقشاندین دانانیە سەرێد رێیا | یا شێخ شەمس تۆ نەخشاندتین و هێناتینە سەر ڕێیا |
| ئەم ژ شێشمس نابرین هێڤیا | ئێمە لە شێخ شەمس نابرین هیوا |
| یا شێشمس تول مەڤەکەی دەرگەهی رەحمەتێ | یا شێخ شەمس تۆ لە ئێمە بکەرەوە دەرگای رەحمەتێ |
| تە ئەم ئینا بوینە سەر ڤێ خلفەتێ | تۆ ئێمەت بۆسەر ئەم کارە هێنا |
| سونیك کو سونینە | سوننە کە سونینە |
| زەبونن دماندینە | داماو ماندینە |
| مە بشێشمس هیڤینە | هیوامان بە شێخ شەمسە[292] |
| سونەتك و سونەتە | سوننە و سونەتە |
| زەبونە کێم تاقەتە | داماو و کەم تاقەتە |
| مە بشێشمس ئەینەتە | ئێمە باوەرمان بە شێخ شەمسە |
| چی دوعایا ئەختیارێ مەرگەهێ | چی پارانەوەیەك کە پیرانی مێرگەی (بابا شێخ) دەیکەن |
| جێشێ مەلك فەخرەدین قەوالا شێخادی | سوپای مەلیك فەخرەدین قەواڵی شێخادی |
| دوعا قەبول پیرێ لبنا | پارانەوەی گیرایە پیری لبنا[293] |
| وان چی دوعا کری | ئەوان هەرچی پارانەوەیان کرد |
| مە ئەو دوعا کری | ئێمەش ئەو پاڕانەوەیەمان کرد[294] |

٢٩٢- رەنگە مانای "ئێمە"ش بدات

٢٩٣- ئێزدیاتی، ل٢٨-٢٩

٢٩٤- هەموو ئێزدیەك دەبێت ناوی پیرەکەی خۆی بهێنێت.

## پارانەوەی خۆر ئاوابوون:

کاتی دەمەو خۆرئاوا (پێش ئەوەی خۆرئاوابێت) ئێزدیەکان دەست و رۆخساری خۆیان دەشۆن و رووبەرووی خۆر کە پاکژترینی بەخشراوەکانی یەزدانە دەوەستن و بەم جۆرە دەپارێنەوە:

یا سوارێ رۆژهلاتێ، رۆژئاڤایێ — ئەی سواری رۆژهەڵاتی، رۆژئاوایێ

هون بدەنە خاترا دۆتی و دایێ — بیکەن بە خاتری کچە و دایێ

هون مە خلاس کەن ژ قەدایێ ژ بەلایێ غەلایێ — ئێوە ئێمە رزگاریکەن لە قەزایێ لە بەڵا لە گرانێ

هون بدەنە خاترا کانیا سپی عەین ل بەیزایێ — ئێوە بۆ خاتری کانیە سپی سەرچاوە لە یەیزایێ

یا شێشمس توحالێ مالا خۆ بپرسی و مەژنی ڤی جارێ — یا شێخ شەمس تۆحاڵی ماڵی خۆ بپرسە و بۆمانبکە جارێ

هون بدەنە خاترا عورش و کورسی — ئێوە بۆ خاتری عەرش و کورسی

گای ماسی — گاو ماسی

حەیات، ل کورسی، — ژیان لە کورسی

یا شێشمس تول حالێ مالا خۆ و مەژی پرسی — یا شێخ شەمس تۆلە حاڵی خۆ تو ئێمەش بپرسی

هون بدەنە خاترا لەوح و قەلەمە — ئێوە بۆ خاتری لەوح و قەڵەمە

هاواو ئادەمە — حەواو ئادەمە

عیسا بن مریەمە — عیسای مریەمە

یا شێشمس تول حالێ مالا خۆ و مەژی پرسی — یا شێخ شەمس تۆلە حاڵی خۆ تو ئێمەش بپرسی

ل هەمو دەمە — بپرسە لە گشت دەمێ

هون بدەنە خاترا چەرخان و فەلەکە — بیکەن بە خاتری چەرخان و فەلەکە

هۆریان و مەلەکە — حۆریان و مەلەکە(فریشتە)

سورا طاوسی مەلەك و چاردە طەبەقە — وێنەی تاوس مەلەك و چواردە تەبەقە

یا شێشمس تو پرسیارەکە خێرێ لمالا خۆو مەژی بکە — یا شێخ شەمس تۆ پرسیارێکی لەماڵی خۆتو ئێمەش بکە

هون بدەنە خاترا بەهشتی و دارێ — ئێوە بۆ خاتری بەهەشت و دارێ

کافێ و مغارێ — ئەشکەوت و مغارێ (ئەشکەوت)

سورا ئیزی و بێت ل ڤارێ — وێنەی ئێزەد و بیت لە ڤارێ

یا شێشمس تو پرسیارەکە خێرێ لمالا خۆو مەژی — یا شێخ شەمس تۆ پرسیارێکی لەماڵی خۆتو ئێمەش

بکە ڤێ جارێ — بکە ئەم جارێ

هون بخاترا دورێ کەن — ئێوە لەبەر خاتری مرواری بیکەن

کاسێ کەن — لەبەر کاسێ بیکەن

ئەختیارێ سوز مخفی پێ برا صەلاتێ کەن — خاوەنی وێنەی شاراوەی پردی سیراتێ کەن

یا شیشمس هون پرسەکە مالا خۆو مەژی بکەن — یا شێخ شەمس تۆ پرسێکی ماڵی خۆتو ئێمەش بکە

هون بدەنە خاترا دوڕا سپیە — ئێوە و خاتری گەوهەری سپیە

مەلەکێ پیری یە — فریشتەی بێریە

سۆرا ئیزی یە — نوێنەری ئیزییە

یا شێشمس ل دیوانا ساتان شێخادی تو بۆ مالا — یا شێخ شەمس لە دیوانی سوڵتان شێخادی تۆ بۆ ماڵێ

خۆو مەژی بکەی میڤی یە — خۆتو ئێمەش بکەی مێڤیە (میوایەك دروست بکە)

هون بدەنە خاترا دورا صورە — ئێوە بۆ خاتری گەوهەرە سورە

ئیزدینە میر — ئێزدینە مێرە[295]

قوبلە تل بدۆرە — قیبلەی گشت بە تۆرە

---

٢٩٥- ئیزدیەکان لەو باوەردان باوکی شێخ شەمسی تەورێزی بێت.

| | |
|---|---|
| یا شێشمس بانگ و هاورێد مەبێت مەلەکێ زۆرە | یا شێخ شەمس بە بانگ و هاواری ئێمەوە بێت فریشتەی زۆر سەرە |
| هون بدەنە خاترا دورا زەرە | ئێوە بۆخاتری گەوهەرە زەرە(زەرد) |
| ئاخ و ئاڤ و ئاگرە | خاك و ئاو و ئاگرە |
| عەرد و عەزمان و بەرە | عەرزو ئاسمان و بەرە (بەردە) |
| ئێزدینە میر و هەر چار سۆرە | ئێزدینە مێرو هەرچوار نوێنەرە |
| یا شێشمس تو نبانگینە مالا خۆو مەژی وەرە | یا شێخ شەمس تۆ بەفریای ماڵی خۆتو ئێمەش وەرە |
| هۆن بدەنە خاترا سۆکا مەعریفەتێ | ئێوە بیکەن بە خاتری بازاری مەعریفەتێ |
| مێری لبەر بە دلی دکەت خلمەتێ | میر لەبەرئەوە بەدڵ دەیکات خزمەتێ |
| دەرویشێ شەڤ و رۆژ دکەت عبادەتێ | دەروێش شەو و رۆژ دەکات عیبادەتێ |
| هەر پێنج فەرزێد هەقیقەتێ | هەر پێنج فەرزی حەقیقەتێ |
| شێخ و پیر، هۆستا و مەرەبی، یارو برایێت ئاخرەتی | شێخ و پیرە و وەستا و فێرکار، یارو برای کۆتای |
| یا شێشمس تو مەفەریەکە مالا خۆو مەژی بکەی ڤێ جارێ | یا شێخ شەمس تۆ چارەیەکی ماڵی خۆت ئێمەش بکە ئەم جارە |
| هۆن بدەنە خاترا دوعایێد فێران | بیکەن بە خاتری پارانەوەی هەژاران |
| رەبەنێد بنێ دێران | رەبەنی بنی دێران |
| یا شێشمس تو لمالا خۆو مەژی بکەی سەخبیران | یاشێخ شەمس تو بۆ ماڵی خۆتو ئێمەش بکە تەگبیران |
| هۆن بدەنە خاترا کورسیا رەحمانا | بیکەن بەخاتری کورسی رەحمانا |
| مەلەکی جانا | فریشتەی گیان |
| بەحرا قودسی جانا | دەریای پیرۆزی گیان |
| یا شێشمس مەژتە دڤێت دین و ئیمانا | یا شێخ شەمس ئێمە لەتۆمان دەوێت دین و ئیمان |

هون بدەنە خاترا عزرائیل، جبرائیل، میکائیل | بۆ خاتری عزرائیل، جبرائیل، میکائیل
شفقائیل، دەردائیل، عزافیل، عزازیل | شەفقائیل، دەردائیل، عزافیل، عەزازیل
هەرهەفت مەلەکێد کبیر، د دەستی دا مفتە و کلیل | هەر حەوت فریشتەی مەزن،
لەدەستیاندایە رستەی کلیل
ئەوژی وێ لبەر حزرەتا مەلەکی جەلیل | ئەویش لەبەر حەزرەتی فریشتەی جەلیل[296]

لەم دوو قەولەدا گرنگی خۆر کە (شێخ شەمسەدین تەورێزی) نوێنەرایەتی دەکات بەباشی روون دەبێتەوە، لە رووبەرووبونەوەیەکدا یەکێك لە روحانیە ئیزدیەکان لە وەلامی کەسێکی موسڵماندا ووتی: پێغەمبەران ئەم دنیایە بەجێدەهێلن بەڵام خۆر لەناو ناچێت و هەتا هەستانەوە هەر دەمێنێت، بۆیە لەلای ئێمەی ئێزدی خۆر پیرۆزە و رێزی لە رێزی پێغەمبەران زیادترە[297]. پوختەی ئەم ووتانەی روحانیەکی نەخوێندەواری ئیزدی لەو رووبەرووبونەوەیەی کە کەیخەسرەوی ئەسفەندیار لە پەرتووکی "دبستان مذاهب" یاداشتی کردووە و دەڵێت:

لە رۆژگاری دادوەر(حاکم) هۆشیاردا کە لە نەژادی کەیان و سەر بە ئاینی یەزدانیان بوو، یەکێك پێی ووتبو: ((پێغەمبەران و چاکان لەخۆر بەرزترن))، دادوەر لە وەڵامدا ووتویەتی: ((تەرم و لاشەی ئەو پێغەمبەر و چاکانە لەکوێن)) کابرا ناوی ئەو شوێن و جیگایانەی بۆ ژماردووە کە لێی نێژراون، دادوەر پێی دەڵێت: (( لاشەی کام لەو پێغەمبەرو چاکانە لە یەکەم رۆژی ژیانیاندا توانای رۆشتنی بووە؟ کە کۆچی دواییان کردووە و بەخاکیان سپاردون و لەناو گۆرەوە هیچ کامیان رۆشنایییەکیان نەبەخشیوە و ئێستا تێکەل بەخاك بوون نیشانەشیان نەماوە)) کابرا ووتی: ((گیانی پێغەمبەران و چاکان رۆشنترن)).

---

٢٩٦- ئیزدیات، ل٢٩-٣١

٢٩٧- شریتی ڤیدیۆیی دەربارەی ئاینی ئیزدیەکان، کەبابی ئازاد حمود لە شێخان ئامادەی کردووە لەلای نوسەرە.

دادوەر ووتی: ((بروانە تەنی خۆر چۆن رۆشنایی و تینێکی هەیە، ئەوانەی تۆ نەتین و نەرۆشنایی ئیتر بزانە کە گیانی خۆر پرشنگدارە، ئەوەشت لەبیر نەچێت خۆر دڵی ئاسمانە ئەگەر خۆر نەبووایە دنیاو ژیان نەدەبوو، وەرزەکانی ساڵ و بوونی زیندەوەر، پێغەمبەران و چاکان هەر لەبنەرەتەوە نەدەبوون کە ئێستاش نین، ئێستاش هەر بەهۆی خۆرەوەیە کە جیهان بەردەوامە و وەرزەکان خۆشن و خەڵك شادومانن، لاریشمان لەوە نیە پێغەمبەران و پیاوچاکان لە جۆری خەڵکانی باشن[298]. لەم ووتانەی دادوەردا بەباشی پایەی بەرزی خۆر لەلای ئێزدیەکان دەردەکەوێت. شایەنی باسە ئێزدیەکانیش گەواهی (شایەتمان)یان هەیە و لەبابەتی باوەری ئێزدیەکاندا ئاماژەی پێدراوە.

شایەتمان لەلای ئێزدیەکان بەم جۆرەیە:

| | |
|---|---|
| ((شەهدا دینێ من ئێك اللە | شایەتی ئاینی من یەك خودایە |
| مەلك شێخسن حەق حەبیبە ئەللاه | مەلەك شێخ سن راست خۆشەویستی خودایە |
| مەقلوب و مەرگەهـ صەلا | سلاو لە مەقلوب و مێرگێ[299] |
| صەلافێد مێرا للالشێ مەقلوبێ | سلاوی میران لە لالشێ مەقلوبێ |
| برێ مەهێ چۆتێد قوبا لوی عەردێ | ئێمە روو دەکەینە ئەو جووت گومەزەی ئەوێ |
| عەردێ ئێزید خانەسەر دکێشنە بەر شیخادی | سەر زەمینی ئێزدیان سەر دکێشنە بەر شێخادی |
| عبادەتێ سوجودەهێ | بۆ خوداپەرستی و سوجدەهێ |

٢٩٨- دبستان مذاهب، ل١٤

٢٩٩- مەقلوب، ناوی چیایەکە لە شێخان، و مەرگە شوێن و مەڵبەندی ئێزدیانە لە ناوچەی شێخان.

| | |
|---|---|
| سلتان شێخادی پەدشێ منە | سوڵتان شێخادی پاشای منە |
| شێخ و بەکر مەولایێ منە | شێخ و بەکر گەورەی منە |
| سلتان ئیزی پەدشێ منە | سولتان ئیزی پادشای منە |
| حەجی مەهمەد پیرێ منە | حاجی مەحمەد پیرێ منە[٣٠٠] |
| شێخ مەهمەد مەرەبیێ منە | شێخ مەحمەد رێبەری منە |
| طاوسی مەلەك شەهد و ئیمانێد منە | طاوسی مەلەك شایەتمان و بروای منە |
| کانیا سپی مۆرا منە | کانیە سپی[٣٠١] مۆری منە |
| کاف و مغار و زمزم حەجا منە | ئەشکەوت و موغار و زمزم[٣٠٢] حەجی منە |
| قوبلەت بدۆر قوبلەتا منە | قیبلەی مانگەکان قیبلەی منە |
| مەلك شێحسن باخۆیی منە | مەلك شیخ سن سەروەری منە |
| شیخ موسی صۆر خودانێ منە | شێخ موسی سور خاوەنی منە |
| شێخ شمس مەسەبێ منە | شێخ شەمس مەزهەبی منە |
| بینایا چاڤێد منە | بینایی دوو چاوی منە |
| الحمدالله ژ ئادیا | سوپاس خودا بۆ ئادیا |
| ڤاڤارتین ژ کافر و رافدیا | ئێمەی جیاکرد لە کافر و رافزیا |
| ئەم هاڤێتینە سەر پشکا سونیا | ئێمەی هێنایە سەر پشکی سونیا |

---

٣٠٠- هەر کەسێکی ئیزدی ناوی شێخ، پیرو رابەری تایبەتی خۆی دەهێنێت.

٣٠١- سەرچاوەیەکە نزیك مەزارگەی شێخ عدی بە (عین البیضاء)یش ناودەبریت لەو ئاوەدا خۆیان دەشۆن و تەعمید دەکەن.

٣٠٢- سەرچاوەیەکە لە ناو مەزارگەی (شێخ عدی) دایە.

| منەت کارین ژ میرا | منەت بارین لە میرا |
| --- | --- |
| ڤاڤارتین ژ کافرا ژ غەنزیرا | جیایکردینەوە لە کافر و بەرازا |
| ئەم هاڤێتینە سەر پشکا شێخ وپیرا | ئێمەی هێنایە سەر پشکی شێخ و پیرا |
| منەت کارین ژ منەتێ | منەت بارین لە منەتێ |
| ڤاڤارتین ژکافرا ژ شرعەتێ | هەڵیبواردین لە کافران لە شەرعەتێ |
| هاڤێتینە سەر پشکا شێخێ سونەتێ | خستینە سەر پشکی شێخی سونەتێ[303] |
| هەکە خودێ کر ئیزدینە | ئەگەر خودێ بکات ئێزدینە |
| سەر ناڤێ سلتان ئیزینە | لەسەر ناوی سولتان ئیزینە |
| الحمدالله ئەم بئۆل و تەریقید خۆ درازینە | سوپاس بۆ خودا ئێمە لە باوەر تەریقەتی خۆمان ڕازینە))[304] |

## ڕۆژوگرتـــــن:

ئێزدیـەکان دووجـۆر ڕۆژوگرتنیـان هەیـە، یـەکێکیان ڕۆژوگرتنـی گشـتیە و ئـەویتریان ڕۆژوی تایبەت بە روحانیەکانە.

ڕۆژوی گشتی ماوەکەی سێ ڕۆژەو لە سەرەتای چلەی زسـتاندا دەگیرێـت، لـەم سـێ ڕۆژەدا ڕۆژوەوان کـە بـە ڕۆژو دەبێـت، خـۆی لـە خـواردن و خواردنـەوە و دوکـەڵکردن بەدوور دەگرێت. دەبێت ئەم سێ ڕۆژە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیدا بمێنێتـەوە بـۆ ئەوەی نزیك بێت لە ماڵی شێخ یان پیرەکەیەوە[305]، چونکە پارشێوی لـە کـوێ کردبێـت، ئێوارەش دەچێتە هەمان ماڵ و خواردن و شەرابی پیرۆزی تایبەتی لەگەل ئەو شێخە یان

---

٣٠٣- خدری سلیمان دەڵێت شێخی سونەت و شێخ سن(شیخ حسن)ن.

٣٠٤- ئیزدیاتی، ل٣٥-٣٦

305 -The Religion of the Yazidi، p.65

پیرەیدا دەخوات و رەنگە بۆ ریزی "شێخ هادی" نەختێ لە خاکی سەر گۆری "شێخ هادی"ش، تێکەڵی شەرابەکە بکەن و رۆژوەکەی پێبشکێنن[٣٠٦].

بەڵام رۆژوی تایبەت بە روحانییەکان هەشتا رۆژە، چل رۆژیان لە چلەی زستاندا و چل رۆژی دووەمیش لە چلەی هاویندا دەگرن، ئەوەی بەنیازی رۆژوگرتنە بۆ دەستپێکی رۆژوگرتن بۆ مەزاری شێخ هادی دەچێت و لەوێ سێ رۆژ بە رۆژ دەبێت و بۆ تەواو کردنی چل رۆژەکەی بۆ ماڵەوە دەگەرێتەوە.

ئەگەر یەکێك نیازی بووبێت بە رۆژوبێت، کەبەیانی لەخەو هەستا موریدێك یان یەکێك لە هاودینانی خۆراکی پێشکەش بکەن، بۆی حەڵاڵە و ئاساییە بیخوات[٣٠٧]، لە بابەتی "کۆچەك"یشدا باسکرا، ئەگەر کەسێك بیەوێت ببێت بە کۆچەك، دەبێت ماوەی چل جار، چل رۆژی بە رۆژو بێت.

**زەکات:**

هەرچەند لە ئیسلامدا "زەکات" بریتیە لەو هاوکاریەی بە کەسی نەدار دەبەخشرێت[٣٠٨] بەڵام لەلای ئیزدیەکان زەکات بەو دەستگیرۆییە دەوترێت کە بە هەژاران دەبەخشرێت (هاوکاری یان خێر دەگرێتەوە).

دەڵێن لە سەردەمی "شێخ عودەی "دا سەران و پیرانی ئیزدیەکان لەسەر موڵك و مەسەلەی دارایی خۆیان دەکەونە ململانێ و کێشمە کێشەوە، شێخ عودەی بۆ ئەوەی لەباتی دوبەرەکی و ناکۆکی تۆوی چاکە و خواپەرستی لە نێوانیاندا بروێنێت، داوای لێکردن، واز لە موڵکەکانیان بهێنن و بەموریدەکانی ببەخشن. ئەرکێکیشی خستە ئەستۆی موریدەکان کەدەبوو ساڵانە بە خاوەن زەویەکانی بدەن و نەوەکانیان لەباو

٣٠٦- نۆشتەهای پراگندە در مورد یارسان اهل حق، ل٦٤-٦٥

٣٠٧- نۆشتەهای پراگندە در مورد یارسان اهل حق، ل٦٤-٦٥

٣٠٨- الیزیدیون، ل٧٥-٧٦

باپیرانیانەوە بۆ پیرەکەی ئەم موڵکانانەیان بۆ بمێنێتەوە و بەم شێوەیە دابەشی کرد: دە لەسەدی بەرهەمی موریدەکان دەدرا بە شێخەکەی، پێنج لە سەدی بۆ پێرەکەی، دوو نیوی بەرهەمی مورید بۆ مورەبی و یەك و بیست و پێنج بۆ فەقیر و نیو لە سەدی بڕی فەقیر بۆ قەوال. واتە مورید لە ساڵێکدا ١٩,٣٧٥ لەسەدی دەرامەتی ساڵانەی بە توێژە روحانیەکان دەدات. یەکێك لە شێخە ئیزدیەکان وەرگرتنی ئەم ساڵانەیەی رەتکردەوە و دەڵێت "زەکات" لەلای ئیزدیەکان هەر فێرکردنە و هیچ پشکێك بۆ خەڵکانی ئاینی لە دەرامەتی موریدان دیارینەکراوە.[٣٠٩]

## تەواف( سەردان ):

تەواف لەلای ئێزدیەکان بریتیە لە سەردان و کۆبونەوەی خەڵکی و ئەنجامدانی بۆنەو سەماکردن و شادیکرن لە مەزارگە و شوێنە پیرۆزەکانی خۆیاندا.

کاتێك ئەم تەوافانە دەستپێدەکەن کە خەڵکی جەژنی نەورۆز (سەری ساڵ)یان تەواو کردبێت[٣١٠]. چیای لالش کە مەزارگەی شێخ عودەی لەوێدایە لەلای ئیزدیەکان لە پایەی "مەکە" دایە.[٣١١] با ئەوەشمان لە یاد نەچیت بۆنەی تەواف لە هەندێك لە گوندەکانی دەوروبەری "لالش"یش دەکرێت، بەڵام لەنێو ئیزدیانی شەنگاڵ، تورکیا، سوریا و ئەرمەنستان بە ئاشکرا شوێنێك بەدی ناکرێت بەو شێوەیەی ناوچەی شێخان بێت و تەوافی تێدا ئەنجام بدرێت.

خدری سلێمان گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی شوێنی سەرهەڵدانی ئەم بۆنەیە ناوچەی شێخان بێت[٣١٢]، ناوچەی شێخان (مەڵبەندی ئیزدیان)ەو بۆ ناوچەی بچوکتر دابەشدەکرێت کە بریتین لە:

٣٠٩- الیزیدیون، ل٨٠–٨١

٣١٠- گۆڤاری مەتین، دهۆك ل٢٣–٢٤

٣١١- الحسنی، ل٧٨

٣١٢- گوندیاتی، ل١٥

١. گونــدی باعــەدرێ و دەوروبــەری، ئەینســـفنێ، باســکی شــێخ و رۆژهــەڵاتی ئەینسفنێ(عین سفنی).

٢. أ- بنکەنـد: کـە گونـدەکانی خـەتاری، دوغاتـا، سەریچکا، خۆشـابا، نـەفیری، نەسیری و بەیان دەگرێتەوە.

ب- بەرین: لە گوندەکانی بوزا، هورزا، کرساڤا، تقشیا، گابارا پێکدێن.

٣. أ- لـەحفا قایـدیا: گونـدەکانی سـینا، شـێخ خـدری، شـاریا داگـا، کلبـەدری و خەرشەنیا دەگرێتەوە.

ب- گوندەکانی قەبیلەی دنا کەلـە کـەناری روبـاری دیجلـەدان: ئـەم گوندانـە سـەربە شارۆچـکەی (سـیمێل)ی پارێزگـای "دهـۆک"ن و بـریتین لـە: مامشـوان، خانـك، قـەباغ، زدینیا، کبرتو، گریپان، کران و باپیری.

یەکەم تەواف کە دەسـتپێدەکرێت لـە گونـدی باشـکی ئـەنجام دەدرێـت، کاتەکەشـی راسـتەوخۆ دوای (جـەژنی نـەورۆز) ئـەنجام دەدرێـت، ئـەم تەوافـە "شـێخ محەمـەد"ی پێدەڵێن. یەکەم هەینی دوای ئـەم بۆنەیـەش لـە "بـەحزانی" تەنیشـت باشـیکی تـەوافی دووەم ئـەنجام دەدەن، ئەمـەیان تـەوافی "شـێخ سـعید" پێـدەڵێن، لـە چوارشـەممەدا (لەحفاقاید)، تەوافی "کرجال" لە گوندی "سینا" دەکرێت، هەینی دواتر لەهەمان کاتـدا لە چوار شوێن، چوار تەواف دەکرێت: لەناوچەی باسـکی (تـەوافی پیرجـوا)، لـە بنکەنـد تەوافی(دوغاتا)، دوبارە لە بەحزان تەوافی (شێخۆ بەکر)، لە لەحفا قاید تەوافی تایبـەتی گوندی خرشنیا دەکرێت. هەینی دواتر تـەوافی ئەینسـەفنی، تـەوافی خـەتاری و تـەوافی خانکی ئەنجام دەدرێت، هەینی دواتر تەوافی مامشوان و تەوافی بـوزا ئـەنجام دەدرێـت، رۆژێـك دوای ئـەوان، رۆژی شـەمە تـەوافی خێـراوا لـەناو هـۆزی دنـا ئـەنجام دەدرێـت و هەروەها تەوافی خورزا، رۆژی دووشەممەی دوای ئەوان تەوافی مامی ئیسـیا لـە ناوچـەی مەرگەو چوارشەممەتەوافی باعـەدرێ کـە بـە تـەوافی (حـاجی عـەلی) بەناوبانگـە ئـەنجام دەدرێت، ئەم تەوافە زۆر بەشکۆیە.

ئەو شوێنانەی کە ناومان بردن تەواوی ئەو شوێنانەنین کە تەوافیان تێدا ئەنجام دەدرێت، چونکە ئێستا زۆرێك لەو شوێنانەی کە جاران لە دەستی ئێزدیەکاندا بوون داگیرکراون و لەدەست ئەماندا نەماون.[٣١٣]

ئەم بۆنە و تەوافانەی لەو شوێنە جیاجیانەدا ئەنجام دەدرێن، زۆر لەیەك دەچن. خەڵکی ئەو ناوچانەی کە بریارە تەواف ئەنجام بدەن، پێش چەند رۆژێك بۆ بانگهێشتی خزم و دۆستانیان بۆ گوندەکان دەچن و بانگهێشتیان دەکەن، ئینجا بۆخۆ ئامادەکردن پۆشاکی نوێ دەکرن و قوربانی(سەربرین) ئامادەدەکەن و ماڵەکانیان خاوێن دەکەنەوە و بەرەنگی سور یان سپی دیواری ماڵەکانیان دەرازێننەوە.

نیوەرۆی رۆژی تەواف هەرماڵە و قوربانی خۆی سەردەبرێت و دوای نیوەرۆی هەمان رۆژ سەرکار دەچێتە نزیکترین مەزارگەی ناوچەکەو سێ جار "جاڕ" دەدات و بانگی لاوان دەکات بێن مەزارگە کە خاوێن بکەنەوە، دوای ئەوە شاز بەند (سازژەن) ساز دەژەنێت و تەواف دەستپێدەکات، خەڵکی گوند و میوانان وورده وورده بەرەو مەزارگە دەچن. زێوانی مەزارگەش لەلای مەزارگەکە دادەنیشێت، دەست بە پارانەوە و قەول و بەیت خوێندن دەکات.

میوانەکان بەبەرگی سپی پاکەوە دێن و بەرێزەوە سەردانی مەزارگەکە دەکەن، قاوەچی لە مەزارگەکە سەرگەرمی قاوە تێکردن دەبێت، لەو دەورووبەرە چەند دەستگێرێك دەبینرێن چەرەس و یاری منداڵان دەفرۆشن، خەڵکی گوندەکان بە پۆشاکی نوێی رەنگاو رەنگەوە کەهەمان بەرگی کوردی خۆیانە، گۆرەپانی مەزارگە پردەکەن و ریش سپیان، شێخەکان، پیران، بابا شێخ و میری ئێزدیان لەلایەکەوە دادەنیشن و لاوانیش لە نزیکیانەوە کۆدەبنەوە، چاوەروانن، کارێکیان پێبسپێرن یان چاوەروانی دولبەرەکانیانن.

---

٣١٣- گوندیاتی، ل١٥-١٦

عەسری ئەو ڕۆژە خۆراکی هەموو تەوافکاران و خەڵکی گوند و هەرچی میوانە بۆ مەزارگە دەهێنرێت و هەرماڵەو قاپێکی پڕ لە ساوەر یان یاپراخیش بۆ ئەو کۆرە دەهێنن، بێگومان خاوەن قوربانی دەبێت سەروکاری خواردنەکە بکات، دوای ئەوەی خۆراکی هەموو ماڵەکان دێت، زێوانەی مەزارگە دەڵێت: میوانان، بانگکراوان، لاوان، گوندیان بفەرموون لە خوانەکە بخۆن، دوای ئەوەی کە هەموویان تێربوون، زیادەکەی بۆ گوند دەگێڕێتەوە. کوران و کچانی لاو لە لایەکەوە دەوەستن چاوەڕوانی زێوان و ریش سپیەکانن دەستبگرن و هەلپەڕن،

هەتا ئەوانیش وورده وورده تێکەلی ریزی هەلپەرکێکە ببن، دەنگە دەنگی هەرا و زەناو هەلهەلە لێدان و ناوی خوداوەند و پیاو چاکانی ئاینی خۆیان دەهێنن، پیران و ڕدێن سپیان هێور هێور لە ریزی سەماکە دەردەچن و لەلای مەزارگەکەوە رادەوەستن. دوای خۆرئاوا بوون خەڵکەکە کەم کەم بەرەو گوند دەڕۆنەوە، ئەگەر زێوانە ڕێبوارێك یان کەسێکی نامۆ ببینێت ڕێزی لێدەگرێت و بۆ ماڵی خۆیانی دەباتەوە، ئێوارە دوای پشودانێك هەمدیسان سازژەن لە گۆرەپانی گوند سازی ئیزەد دەژەنێت، دوای ووتنی چەند قەول و گۆرانیەك بە زورناژەنێن خەلکەکە کێش دەکەنەوە و دووبارە گۆڤەندو هەڵپەرکێ دەستپێدەکاتەوە، ئەم بەزمە هەتا نیووە شەو درێژە دەکێشێت، ئیتر ئەو شەوە زۆر کەم دەخەون، چونکە دۆستان و خزمان کۆدەبنەوە و شەو بەسەردەبەن. بەیانی زوو سازژەن سازی ئیزەد(یەزدان) و دواتر سازی تەواف دەژەنێت و خەڵکەکەش ملی ڕێدەگرن و بەرەو مەزارگە دەچن و دوای ڕێز گرتن لە مەزارگە سەماو هەڵپەرکێ دەستپێدەکەن.

لە کۆندا لە هەمان کاتدا بۆڕ بۆڕینی ئەسپ سواریش ئەنجام دەدرا بەڵام ئێستا ئەوە نەماوە. کاتی نیوەڕۆ زێوانی مەزارگە سەرپەرشتی خوانەکە دەکات، پێش خواردن، خاوەن قوربانیەکان سەری کولاوی قوربانیەکان بەدەستەوە دەگرن و دەڵێن:جوامێران و

خەڵکی چاکەکار ئەمە خوانی فلانە وەلیە، ئامادەبووان دەکەونە زیادکردن، کێ زۆرترینپارە بدات سەرە کولاوەکە بەو دەدرێت و زێوان(زێرگەوان) ڕوبتێدەکات و پێیدەڵێت: خواوەندی ئەم گوندە خێری تۆو گشت ئامادەبووان وەربگرێت، هەتا گشت سەلکە مەرەکان تەواو دەبێت زیادکردن درێژەی دەبێت، ئینجا زێوانە داوادەکات: فەرموون دەست بە خواردن بکەن، دوای خواردن هەرکەسەو برێك پارە بە زێوانە دەدەن و بەرەو ماڵ دەچنەوەن عەسری ئەو ڕۆژە دیلانا گابانیا (هەڵپەرکێی خاوەن مالان) دەستپێدەکات، لەبەرئەوەی کابانەکان لە ڕۆژی پێشترەوە خەریکی خواردن و ئامادەکردن و پێشوازیکردنی میوانانن، نۆرە دێتە سەر ئەوان و بۆ بەشداریکردنی ئەم جەژن و شادیە کەوگیربەدەستەکان لە نزیکی ماڵی زێوانی مەزارگە کۆدەبنەوە و هەڵپەرکێ و شادی ساز دەکەن و شاباش بۆ سازژەن هەڵدەدەن و خەڵکانی دیکەش تێکەڵیان دەبن و گۆڤەندەکە خۆشتر دەبێت.

شەوی دووەمیش بەزم و خۆشی درێژەی دەبێت، لە تەوافی گوندی "سینا"دا بۆنەی "پەری سوارکردن"یش ئەنجام دەدرێت، کە دواتر لە بابەتی جەژنەکاندا باسی ئەو بەشەش دەکەین.

بێگومان ئەم بۆنەیە لە پێش سەرهەڵدانی "ئاینی ئیسلام"یشەوە هەر هەبوە بەڵام بەناوی دیکەو لەزیارەتگەکانی دیکە ئەنجام دراون.[٣١٤]

هەندێك لە نوسراوو بەڵگەکان وامان لێدەکەن، گریمانەی ئەوە بکەین کە شوێنی (ئازەر گشنسەپ) و دەوروبەری یەکێك لە مەڵبەندە گرنگەکانی ئیزدیەکان بووبێت و بۆنەی ئاینی ئەوان لە هەمان جێگەو دەوروبەری ئەنجام درابێت، بەڵام بە هۆکارێك نەیانتوانیبێت بە ئاشکرا ئەم بۆنەیە ئەنجام بدەن و ڕەنگە لەوسەروبەندە دابووبێت کە ئاینی "زەردەشتی" ئاینی فەرمی ئێران بووە، ئینجا کۆمەڵانی وەکو مانەویەکان و ئینجا

---

٣١٤- گوندیاتین ل١٤-٢٦

مەزدەکیەکان هەمان دژایەتیان کردبن، دوای هاتنی ئیسلام و بەتایبەتی پاش شکستی بابەکی خۆرەم دین مەیدانەکەیان لێ تەنگتربوەوە، بۆ ئەوەی هەوڵبدەن ئاینەکەیان بۆنەوەکانی دواتر بپارێزن، تەنها چارەیان ئەوەبوو لەدەوری مەزنانی وەکو (حەللاج، عودەی، شمس) و زانایانی دیکە کۆببننەوە و سەرگەرمی "تصوف"بن و مەڵبەندێکی گونجاو پەیدابکەن و بەشێوەیەکی گونجاو ئاینەکەیانی تێدا بپارێزن، بۆ ئەم مەبەستەش "لالش"یان بە باشترین پەناگە و گونجاوترین جێگە زانی.

**سەماع:**

ئەم ووشەیە بەزمانی عەرەبی بە بیستن دێت بەڵام لە "تصوف"دا بە دەنگێك دەوترێت کەحاڵی بیستەر بگۆڕێت.[315]

لە کوردیدا بەمانای سەما و هەڵپەرین و گوێ هەڵخستن بۆ گۆرانی و سرودە تایبەتیەکان دێت.[316]

زانای موسلمان احمد بن تیمیە (٧٢٨ کۆچی) نوسیوەتی: خوداوەندی مەزن فەرمانی فەرمووە کە گوێ لە قورئان بگیرێت و ئەوە سەماعی پەیامبەران و زانایان و عارفان بووە، یەزدان فەرموویەتی: ((اولئك الذين انعم الله عليهم من النبيين من ذرية أدم وممن حملنا مع نوح و من ذرية ابراهيم واسماعيل وممن هدينا واجتبينا اذا تتلى عليهم آياتالرحمن خدوا سجداً و بكيا))[317].

هەروەها فەرموویەتی: "ان الذين آتوا العلم من قبله اذا تتلى عليهم يخرون الرحمن للاذقان سجداً و يقولون سبحان ربنا ان كان وعد ربنا لمفعولا....))[318] ئاشکرایە کە

---

٣١٥- حاكمی، اسماعیل، سماع در تصوف، ل٢

٣١٦- بررسی مختصری از تأريخ اديان كردان ل٧١

٣١٧- سوره مريم، آيه ٥٨

٣١٨- سورەتی اسراء، ئایەتی ١٠٧-١٠٨

یەزدانی مەزن ئەم سەماعەی پیرۆزکردووە، ئەوانەش ڕوویان لێوەرگێڕاوە، سەرزەنشتیان دەکات: ((و قال الذین کفروا لا تسمعوا لهذا القرآن و الغوا فیه لعلکم تغلبون))[319] پڕ بەرەکەتترین سەماع کاتی بەیانە.[320] لە لای متصوفەکان (سماع) زاراوەیەکە بەو سەماکردنە دەوترێت کە لەگەڵ ئاوازو موزیکێکدا ئەنجام دەدرێت. کەچی تۆفیق وەهبی[321]، نوسیویەتی: باطنیەکان سەماعیان بەرەوپێش بردووە، ئەم وا بەستەییەی "مەیمونی کوری دیصان" کە "البغدادي" ئەوی بە یەکێك لە سەرانی باطنیەکان داناوە بەهێز دەکات. بۆنەیەك لە لای ئیزدیەکان بە "سەما" دەناسرێت یان دەتوانین سەمای تایبەتی پێی بڵێین، چونکە تەنها چواردە کەس بەشداری تێدا دەکەن و هەر کەسەشیان سەر بە بنەماڵەیەکی روحانی بەناوبانگی ئیزدین و شێوەی ئەوان لە سەما دا بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

١- چێشتلێنەر (تەنیشت مەزارگەی شێخ عودەی)

٢- أ- پێش ئیمام (نوێنەری شرف الدین کوری شێخ حسن). ب- پێش ئیمام (نوێنەری شێخ حسن).

٣- أ- بابا شێخ (نوێنەری شێخ فخرالدین). ب- میرحاج ( میری ئیزدیان).

٤- أ- بابی گاوان (رەنگە بەرپرسی قوربانی گاکان بێت). ب- شێخ وەزیر (نوێنەری شێخ شەمس).

٥- أ- مجێور (زێوان) ئین سفنی رابەری ڕوحانی ناوچەی باسك. ب- شێخ ئیسماعیل (لە شێخانی قاتانی).

٦- أ- رابەری ڕوحانی بەحزانی. ب- شێخ عبدالقادر (لە شێخانی قاتانی).

٧- أ- رابەری روحانی باشیکی. ب- پیرایسبیا.

٨- بابە چاویش[(٥)]

---

٣١٩- سورەتی فصلت، ئایەتی ٢٦

٣٢٠- ابن تیمیە، احمد، مجموع فتاوی ابن تیمیە، بەرگی١١، ل٥٩٢

٣٢١- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کردان، ل٧٠

ئەم بۆنەیە پیرۆزی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو پێشتر باسمان کرد ئێزدیانی دیکە بۆیان نیە بەشداری تێدا بکەن، بەڵام دەتوانن لە کۆری سەما دا بەشداربن، بەلام پەیرەوانی ئاینانی دیکە بۆیان نیە بەشداربن. ئەو کەسانەی سەرەوە بە پێی ریزبەندیەکە بە دوای چێشتلێنەردا کە کلاوێك (تاج) و بەرگێکی بالاپۆشی (حەل) رەشی لەبەردایە و ئەوانەی بە دوواشیەوەن بەرگیان سپیە و لای چەپیان بەرەو ناوەوە (ئەلقەی زیکرە) و لەسەرخۆ بە دوری ۳ مەتر بە دەوری مۆمدانێکدا دەسورێنەوە، وئەم مۆمدانە قاپێکی تایبەتی رۆن و هەشت فتیلەی هەیە، کاتی ئەنجامدانی سەماکردن رۆشن دەکرێن و کەسێك (رەنگە خەزنەداری شێخادی بێت) وەکو پێشتر باسکرا، فەرمانبەری ئەم رۆشناییە، ئەم بۆنەیە لەبەر دەرگای مەزارگەی شێخادیدا کەبە(مەجلیس) ناوی دەبەن، لەشەوانی جمایی[322]، لەسەر لوتکەی چیای "عەرەفات" کەبەسەر مەزارگەی "شێخادی"دا دەروانێت، لە جەژنی قوربانیدا ئەنجام دەدرێت.

سورانەوە بەدەوری مۆمدانەکەدا زۆر لەسەرخۆو بەبێدەنگی (بەشداران ناوی یەزدان نابەن) ئەنجام دەدرێت، بەڵام قەواڵان بە نەیژەنین و دەف لێدان و وێردی تایبەتی کەشێکی روحانی پتر بە کۆرەکە دەبەخشن، ئامادەبوانیش جارنا جارێك هاوار دەکەن (هۆلا سولتان ئێزەد) و ژنان هەلهەلە دەکێشن.

شایەنی باسە هەموو پێکەوە ناجولێنەوە بەڵکو یەکەمجار چێشتلێنەر زۆر لەسەرخۆ دەستی راستی خۆی کە بە سنگیەوە نوساوە بەرەو شانی چەپ بڵند دەکاتەوە، هاوکات قاچی ڕاستی بەرەو پێش دەبات، ئینجا بیّ ئەوەی دەستی چەپی بجولێنێت، قاچی چەپی بۆ لای قاچی راستی بە جوڵەیەکی تایبەتیەوە رادەکێشێت، دوای ئەوەی ئەم جولانەی ئەنجام دا، دوو کەسی دوای ئەو هەمان ئەم جولانە ئەنجام دەدەنەوە و

---

٣٢٢- ر.ك چشنهای ایزدیان

بەمشێوەیە تا کۆتایی دەڕوات، هەتا نۆرەی بابە چاویش دێت، بەمجۆرە هەتا سێ سور بە دەوری مۆمدانەکەدا دەدەن، نزیکەی چوار سەعات درێژە دەکێشێت[٣٢٣].

بێدەنگبونی بەشداربوان لە سەماعدا، ئەو قسەیەی کەیخوسرەوئەسفەندیارمان بیردەخاتەوە کە لە بارەی ئیزدیانەوە نوسیویەتی: (( باوەرداران و پارێزگاران بە نهێنی یادی دەکەنەوە[٣٢٤])). بەلاّم ئامادەبوان بە تایبەتیش قەوالّەکان بە ئاوازی نەی و دەف یادی یەزدان دەکەن، دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین کە (نەی) لە هەموو ئامێرە مۆزیکییەکان پیرۆزترە، چونکە بە باوەڕی ئەوان جوبرائیل بە فەرمانی خوداوەند لە رێگەی "نەی" ەوە تۆوی ژیانی لە گوێی ئادەم کردووە.[٣٢٥]

لە سەمای (مەولەوی) دا، کە "مەولانا جلال الدین بەلّخی" دامەزرێنەریەتی زۆر ئاسایی "نەی" بەکاردێت. مەولانا دوای ئەوەی بە دیداری شەمسی تەبریزی دەگات و لەگەلّی دەژی، ئەو جۆرە سەماعەی پەرەپێدا[٣٢٦].

با ئەم بەیتانەی سولّتان وەلەد بخوێنینەوە:

| | |
|---|---|
| چونکه دعوت کرد او را شمس دین | در سماعی کەبدان پیشش گزین |
| چون در آمد در سماع از أمرأ و | حال خود را دید صد چنان زهو |
| شد سماعش مذهب و رایی درست | از سماع اندر دلش صد باغ رست[٣٢٧] |

---

| | |
|---|---|
| چونکە ئەو شەمسەدینی بانگهێشت کرد | لەسەماعێکدا کە ئەوی تێدا هەلّبژارد |
| چون لە سەماعەکەدا لە فەرمانی ئەو دەرچوو | حالّی سەد جار لەو زیاتر دی |
| سەماعەکەی بوو بە مەزهەب و رای دروست | لە سەماعدا سەد باغی لە دلّدا ڕێکخست |

---

٣٢٣- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کردان، ل٦٩

٣٢٤- دبستان مذاهب

٣٢٥- طارق جامباز، گۆڤاری لالش، ژمارە(١) سالّی ١٩٩٣ ل٩٧

٣٢٦- زندگانی مولانا جلال الدین، ل٤٨

٣٢٧- زندگانی مولانا جلال الدین، ل٦٥

"نەی" هێندە کاریگەری لە سەر مەولانا داناوە، مەثنەویەکی نوسیووە بە "نەی" دەست پێدەکات[328]. رەنگە "مەولانا" کە لەوێدا باسی "نەی" دەکات، رەنگدانەوەی نهێنیەکانی (پەیامبەر و عەلی) بن، سەبارەت بەو فەرمانەی خوداوەند کە "جوبرەئیل"ی راسپاردووە لە رێگەی "نەی" ەوە ئەنجامی داوەو تۆوی ژیانی لە گوێی "ئادەم" کردووە.

تۆفیق وەهبی ئەم کۆبونەوەی کە بۆ کۆری سەماع دەبەسترێت بە نوێکردنەوەی پەیمان و پەیوەندی لەگەڵ خوداوەندی مەزن دەزانێت و دەڵێت چراکانی مۆمدانی ناوەندی کۆری سەماع، هێمای فریشتەکانن، سورانەوەی ئەوانەی کە بە دەوری مۆمدانەکەدا دەسورێنەوە، بە پێی باوەری پێشینان پەیوەندی بە سورانەوەی هەسارەکانەوە هەیە بە دەوری زەویدا دەسورێنەوە[329].

بابا چاویش بە پێی ئەوەی دوا کەسی سەماکەیە، خۆی بە کلکی مار دەچوێنێت، دەڵێت: ئەم جوڵەیەی ئێمە لە سوری ئەستێرەکانی ئاسمانەوە وەرگیراوە. بە بروای سپاسیان (ئیزدیان) پاشەڵی پەیکەری رۆژ وەکو کلکی مار وایە,[330] ئێستاش مارێك بەسەر دەرگانەی "شێخادی" ەوە نەخشێنراوە.تۆفیق وەهبی لە (سەماعی مەولەوی) دا، کە مەولانا لە دوای دیداری لەگەڵ شەمسی تەورێزی ئەنجامیدا هەستی بە نیشانەکانی (میترائیسم) کردوە، کە بە بروای نوسەر ئیزدیەکان پاشماوەی پەیرەوانی (میترائیسم)ن.

شەمسی تەورێزی لەلای کوردانی (ئەهلی هەق)یش پایەیەکی بڵندی هەیە و بەبرای ئەوان یەکێك لەو چل کەسەیە کە لەسەردەمی پێغەمبەری مەزندا یەکەم کۆبونەوەیان لەگەڵ ئەوانەی کە چاکی مەردانەیان لە مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە کەبە (گومەزی

---

٣٢٨- جستجودر تصوف ایران ل٣٠٤

٣٢٩- هەمان سەرچاوە

٣٣٠- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کردان، ل٦٩-٧٠

سەوز ناسراوە) کـــــۆڕی یاد و سەمایان سازکردووە و رازەکانی ئاینی چل کەسی لەلایەن (حەزرەتی علی)ەوە بە شێخ حسن بصری گەیەنراوە[331].

گومانی تێدا نیە ئەو پلەوپایەی شەمس لەلای ئیزدیەکان هەیەتی لەلای ئەهلی هەق نیەتی، رەنگە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بێت کە(ئەهلی حەق) لە قەڵەمرەوی دەوڵەتێکی شیعە مەزهەبدا بوون و "عەلی" لەلای ئەوان پلەیەکی بەرزتری پێبەخشراوە، بۆیە ئەوان "حەزرەتی عەلی"یان بە نوێنەری خۆر داناوە و وەکو چەترێك پارێزگارییان لەباوەرەکەی خۆیان پێکردووە.

لەکۆتای ئەم بابەتەدا ئەوە بەبیر دەهێنرێتەوە کە (أحمد بن تیمیە) نوسیویەتی، پێشەوایانی ئەم میلەتە و شێخانی مەزنی وەکو شێخ عبدالقادر و شێخ عودەی لە سەماعی سۆفیان خۆیان پاراستووە.[332]

بەپێی ووتە ابن تیمیە ئەم جۆرە سەماعە پێش هاتنی عودەی بۆ ناو ئیزدیەکان هەرهەبووە و دوای ئەویش شەمس زیاتر پەرەی پێداوە.

---

٣٣١- بابا زادە، پرويز، حماسە پرشكوە اهل حق، ل٥٨و ٦١

٣٣٢- مجموع فتاوی أحمد بن تیمیە، بەرگی١١، ل٤-٦

# بەشی چوارەم:
# هەندێك لە داب و نەریتی ئـــــیزدیەكان

**هاوسەرگیری:**

هاوسەرگیری لەلای ئیزدیەكان دوو جۆرە:

١- هاوسەرگیری ئاسایی

٢- هاوسەرگیری ڕەدوكەوتن، هەڵگرتن كە كەمتر ڕوودەدات، [٣٣٣] كاتێكیش ڕوودەدات كە بەربەستێك لە بەردەم هاوسەرگیریدا پەیدابێت و نەهێڵن بەیەك بگەن.

ئەگەر كەسێك كچێك یان ژنێك هەڵبگرێت و پەنا بۆ ئیزدیەكان ببات، پـەنای دەدەن و پارێزگاری لە ژنەكە دەكەن، لەسەر پیاوەكەش پێویسە بۆ ڕێككەوتنـەوە پارەبـدات یـان خوشكێكی یان ژنەكەی خۆی بدات بە ماڵی ژنە هەڵگیراوەكە و ڕێكبكەون. [٣٣٤]

گرنگترین هۆكارەكانی ڕەدوكەوتنی كچ یان ژنان بریتین لە:

١. زۆر جار ئامۆزای كچـەكە ناهێڵێـت هاوسـەرگیریەكە ئـەنجام بـدرێت و نـەریتێكی دێرینەیە چونكە ئامۆزا خۆی بەلە پێشتر دەزانێت.

٢. مارەیی زۆر هەڵنەسورێت.

٣. ژن بەژن، بۆ نمونە پیاوێك خوشكی خۆی یان كچی بە كەسێك دەدات لەبەرامبەر دا كچ یان خوشكی بەم دەدرێتەوە، گومانیشی تێدانیە و كچی لایەكییان ناقایل دەبێت و بۆ ڕزگاربوونیش بە مەجبوری لەگەڵ كەسێك ڕەدودەكەوێت.

٤. بـۆ سـرینەوەی خـوێن و ئاشـتبوونەوە، بـۆ كوژاندنـەوەی خـوێن و نەهێشـتنی دوژمنایەتی دوو بنەماڵە یان دوو تیرە، دەست دەكەن بە بەخشینی كچی ئـەم بنەماڵەیـە

---

٣٣٣- شێخ زیدۆ باعدری، گۆڤاری لالش ژمارە (١)، ل٦٠ ی ساڵی ١٩٩٣

٣٣٤- الیزیدون، ل٨٤

بــه بنەماڵــەی بەرامبــەر، بێگومــان ئەمــەش نارەزایــەتی تێدەکــەوێت و ڕەدوکــەوتنی لێدەکەوێتەوە.

٥. سەرسەختی باوك یان برا کەهەر دەبێت مناڵەکەی لەگەڵ کەسوکاری خۆی هاوسەرگیری بکات.[٣٣٥]

## هاوسەرگیری ئاسایی:

هاوسەرگیری ئاسایی لەدوای سێ قۆناغ تەواو دەبێت:

قۆناغی یەکەم: لێك تێگەیشتن لە نێوان ئەو دوو لایەدا کە بە نیازن هاوسەرگیری بکەن، بە زۆریش ئەم بەیەك گەیشتنانە لە بۆنە و جەژن تەوافەکاندا ڕێك دەکەوێت، چونکە لەو کاتانەدا کوران و کیژان مۆڵەتی نزیك بوونەوەیان هەیە و ئازادن.[٣٣٦]

**قۆناغی دووەم:** بە ئاشکراکردنی دڵدارایە کە بۆ دایك و باوك دەسپێدەکات، باوك و دایك مافی ڕێگیری هاوسەرگیریان نیە، چونکە بەربەست دروستکردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەنا بۆ گوندەکانی نزیکی خۆیان بەرن و هاوسەرگیری خۆیان بکەن و هیچ پرس ڕایان پێنەکەن و وەکو ژن و مێرد حیسابیان بۆ دەکرێت.[٣٣٧]

ئەم بابەتە سەبارەت بەژن دیدگای مەزدەکیمان بەیاد دەهێنێتەوە کە ووتویەتی: کەس مافی ئەوەی نیە ژنان وەکو ئاژەڵ لە قەفەسی حەرەمسەرادا بەندبکات و خەڵکی لە خاوەنداریتی تەنها ژنێك بێبەش بکەن.[٣٣٨]

پاش ئەوەی بنەماڵەی کورەکە و کچەکە بە هەڵاتنی مناڵەکانیان دەزانن، دەکەونە گفتوگۆ و ڕێکەوتن، کە چەند پارە و سەر مەڕ بدەن؟

---

٣٣٥- شیخ زیدو، گۆڤاری مەتین، ژمارە٢٢، ل٢٥، ساڵی ١٩٩٣

٣٣٦- الیزیدیون، ل٨٢

٣٣٧- الیزیدیون، ل٨٤

٣٣٨- عقاید مزدك، ل٦٣

لەم دوو دەیەی کۆتاییەوە ئیزدیەکان گوێ بەو شیربابییە نادەن کە لەلایەن "میر"ەوە دیاری دەکرێت.[339]

باوکی کور بۆ لای شێخەکەی خۆی دەچێت و تێدەگەیەنێت، ئینجا شێخ و ڕدێن سپیانی گوند بۆ ماڵی باوکی کچەکە دەچن و بەپێی نەریت و خوازبێنی کچەکە دەکەن، پاش ڕێککەوتن لەسەر مارەیی، هەر ئەوکاتە سێیەکی مارییەکە دەدەن، وەرگرتنی ئەم بەشە لە مارەیی لەلایەن بەرپرسی کچەوە نیشانەی قایل بوونە. ئینجا ژنانی بنەماڵەی زاوا هەندێك شیرینی دەهێنن و بەشێکی لەسەر ڕێگەی ماڵی بوکێ دادەنێن و بەشێکیش بۆ ماڵی بوکێ دەبەن.

**قۆناغی سێیەم**: ئەم قۆناغە لەوکاتەوە دەستپێدەکات کە کولێرەیەك(نان) لەماڵی یەکێك لە شێخەکانەوە بهێنن، کولێرەکە لەت دەکەن و نیووەی بۆ زاوا و نیوەکەی دیکەی بە بوکێ دەدەن و دەیخۆن، ئەم هەنگاو هەڵنانە لە جێگەی گرێبەستی هاوسەرگیریە، ئەگەر ئەم کولێرەیە دەست نەکەوت، بە خواردنی نەختێ لە خاکی سەر گۆری شێخ عودەی، کە بەراتی پێدەڵێن مەیسەر دەبێت. ئەم بەراتە لەلای (مەزنانی ئاین)ی هەیە.

بە بەشکردنی بەرات و خواردنی بۆنەی گرێبەستی هاوسەرگیری کۆتای پێدێت، کەکاتی گواستنەوە هات، ماڵی زاوا خۆیان ئامادە دەکەن و دیاری بۆ خزم و دۆستانیان دەنێرن، لەم بۆنەیەدا لاوان لە ماڵی زاوا کۆدەبنەوە و ماوەی سێ ڕۆژ بەدەهۆل و زورنا ژەنین هەڵدەپەرن و ئاهەنگ و گۆڤەند دەگێرن.

هەر لەم بۆنەیەدا زاوا برای کۆتایی و بوکێ خوشکی کۆتایی لە چینێکی جیاواز لە چینەکەی خۆیان هەڵدەبژێرن و هەرساڵە و برێك پارە بەناوی دۆستی و خۆشەویستیەوە

---

٣٣٩- شێخ زیدو باعدری، گۆڤاری لالش، ژمارە(١)، ل٦١، سالی ١٩٩٣

بەوان دەبەخشن[٣٤٠]. لە شەوی گواستنەوەدا کە سێیەم شەوە ئەگەر بوکێ خەڵکی گوندێکی دیکە بێت، بەسواری وولاغ یان "ئوتومبێل"ێکی رازاوە دەهێنن و لەملاشەوە بە دەهۆڵ و زورنا و هەلهەلە لێدانەوە بەپیریەوە دەچن.

ئەگەر لەسەر رێگای بوکێ، مزگەوت، کلێسا یا هەر پەرستگایەك هەبوو، دەبێت رێز لەو شوێنە پیرۆزانە بگرن[٣٤١]. ئەمەش بەڵگەیەکە نیشانی دەدات کەئیزدیەکان رێز لە پیرۆزی ئاینەکانی دیکەش دەگرن و بڕواشیان بە پێغەمبەرانی ئەوانیش هەیە.[٣٤٢] ئەگەر بوکێ هاوگوندی زاوا بوو دەیرازێننەوە و تارای سور دەپۆشێ و بە دەهۆڵ و زۆرنا و هەلهەلە لێدان دەستی دەگرن و بە پیادە بۆ ماڵی زاوای دەهێنن. کاتی سەر بەماڵی زاوادا دەکات، زاوا سێ بەردی وورد بەهێمای پیاو سالاری بەرەو بوکێ دەهاوێژێت، ئینجا کولێرەیەك بەسەر بوکێدا وورد دەکات، رەنگە ئەمە نیشانەی راکێشانی بوکێ بێت کە هاوکاری هەژاران بکات.[٣٤٣]

یان نیشانەی بەرەکەت بێت، کاتێ بووکێ دەچێتە ژووری تایبەتی خۆیەوە، دایکی زاوا داوای لێدەکات دابنیشێت، بەڵام بوکێ دانانیشێت هەتا خەسووی بە خەڵاتێك قایلی دەکات، ئەوسا دادەنیشێت، زاوا لەگەڵ دۆستانی دێنەوە ژوورەوە رووبەرووی کەسێك دەبێتەوە، سەرینی بووکێی پێیە، داوای دیاریەك دەکات ئەوسا سەرینەکەی دەداتێ. ئینجا زاوا دەچێتە ژوورەوە، ماوەی حەوت رۆژ بوکێ لە ماڵی زاوا دەمێنێتەوە، ئینجا بوکێ لەگەڵ دەستەیەك لە کچان کۆدەبنەوە و بەدەم گۆرانی ووتنەوە بەپێ بەرەو گوێ ئاوێك یان سەر حەوزێکی گوندەکە دەچن، بوکێ نەختێ ئاو بە راست و چەپی خۆیدا و

---

٣٤٠- شێخ زیدو باعدری، گۆڤاری لالش، ژمارە(١)، ل٦١، ساڵی ١٩٩٣

٣٤١- الیزدیون ل٨٤-٨٥

٣٤٢- دبستان مذاهب، ل١٤

٣٤٣- الیزیدیون، ل٨٥

نەختێ بە کچانی هاورێیدا دەپرژێنێت، ئینجا دەفرێك پر دەکات لەئاوو بۆ ماڵە نوێکەی خۆی دەگەڕێتەوە، چونکە ئێزدیەکان دەڵێن: زیندو مردوو بە ئاو پاکدەبێتەوە.[344]

شایانی باسە پیاوانی ئیزدی دەتوانن لەگەڵ چوارژن هاوسەرگیری بکەن، بەڵام بۆی نیە بەبێ رەزامەندی ژنی یەکەمی هاوسەرگیری دووەم بکات، ئەگەر لە ژنی یەکەم منداڵی هەبێت وژنەکەی لە ژیاندابێت، مۆڵەتی پێنادرێت هاوسەرگیری دیکە بکات.

شایانی باسە لەسەردەمی ساسانیەکانیشدا وەهابووە پیاوان بەبێ رەزامەندی ژنەکانیان بۆیان نەبووە هاوسەرگیری بکەن.[345]

ئیزدیەکان تەنها بۆیان هەیە لەنێوان چینەکەی خۆیاندا ژن و ژنخوازی بکەن، بۆشیان نیە براژن یان ئامۆژنی خۆیان بهێنن، ئەگەر بێوەژنیش بن، هەروەها ناتوانێت ژنخوشکی خۆی بهێنێت، هەتا ئەگەر ژنە بێ پیاو و پیاوەش بێ ژن بێت، ژن لە پیاو حەرام دەبێت ئەگەر بە پیاوەکەی بڵێت تۆ پیر یان شێخی منیت[346].

ئەگەر چی رۆژی چوارشەممە لە رۆژە پیرۆزەکانی ئیزدیانە، بەڵام ئەوان لەو باوەڕەدان کەلە نێوان ڕۆژانی چوارشەمەدا رۆژێکی شوم بوونی هەیە، بۆیە لە رۆژانی چوارشەمەدا نەك هاوسەرگیری ناکەن، خۆیان لە جووتبونیش دەپارێزن، لە مانگی "نیسان"یشدا هاوسەرگیری ناکەن[347].

کچ کە شویکرد لە میراتی باوکی بێبەری دەبێت، ئەگەر مێردەکەی بمرێت بۆ ماڵی باوکی دەگەڕێتەوە، دیسانەوە بەشووی دەدەنەوە.

ئەگەر لە بەرژەوندیان بێت ماڵی باوکی بێوەژنەکە بۆیان هەیە بە زۆر بە شوی بدەنەوە. ئەگەر بێوەژنەکە قایل نەبوو، دەبێت هەمان برە پارەیەی کە خوازبێنیکەر

---

٣٤٤- شیخ زیدو باعدری، گۆڤاری لالش، ژمارە(١)، ل٦١، ساڵی١٩٩٣

٣٤٥- الیزیدیون، ل٨٦

٣٤٦- هەمان سەرچاوە + The Religion of the Yazidis، p.75

٣٤٧- الیزیدیون، ل٨٧-٨٩

دەیدات خۆی بە ماڵی باوکی خۆی بدات، چونکە وازی لیناهێنن، ئەگەر بێوەژنەکە منداڵداربوو لە بەر منداڵەکالی شووی نەکردەوە، ئەوا ماڵی باوکی بۆیان هەیە مارەییەکەی لە منداڵەکانی وەربگرن.

لە کاتێکدا ژن و مێرد پێکەوە نە گونجێن، ئەوا پێویستە ماڵی باوانی ژنە مارەیی بۆ مێردەکەی بگەڕێننەوە، ئەوسا مێردەکەی ڕێگەی دەدات ژنە بۆ ماڵی باوانی بگەڕێتەوە. بەڵام ئەگەر نەیانتوانی مارییەکەی بۆ بگەڕێنەوە، کابرا چاوەڕوان دەکات هەتا ژنە شوو دەکاتەوە، ئەوسا مێردە تازەکەی بۆیدەداتەوە.

شایەنی باسە میری ئیزدیان بۆی نیە ژنەکانی خۆی تەلاق بدات، لە دوای مردنی میریش کەس بۆی نیە ژنی "میر" بهێنێتەوە، هەتا دەشمرن دەبێت لە ماڵی "میر" دا بمێننەوە.

ژن و مێردی ئێزدی ئەگەر بەهۆی گرفتێکەوە چل ڕۆژ لە یەکتری دابران و پێکنەهاتنەوە ئەوا ژنە بۆی هەیە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات، بەڵام بۆی نیە هیچ لە ماڵی مێردەکەی بەرێت. ئەگەر ژن و مێردی ئیزدی بە بێ شەر و شکاتکردن لە یەك جیاببنەوە، ژنە بۆی هەیە یەکسەر هاوسەرگیری بکاتەوە، چونکە لەلای ئەوان ماوەی (عدە) یان نیە، ئەگەر پیاوەکەی ساڵێك لێیدورکەوتەوە ژنە مافی خۆیەتی هاوسەرگیری بکاتەوە.

لە ئاینی ئیزدیدا پیاو بۆی هەیە هەتا سێ جار ژنی تەلاقدراوی خۆی بهێنێتەوە و هیچ بەربەستێك نابێت، بەڵام دوای سێ جارەکە بە بێ ڕەزامەندی روحانیەکان ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە.

ئەگەر پیاوی چینە گشتیەکە یەك جار بە ژنەکەی بڵێت تۆ تەلاقدراویت، ژنە بە تەلاقدراو ئەژمار دەکرێت، کەچی لە چینی (شێخ و پیران) دا دەبێت پیاو سێ جار ژنەکەی تەلاق بدات، ئەوسا ژنە بە تەلاقدراو ئەژمار دەکرێت.[٣٤٨]

---

٣٤٨- گوندیاتی، ل٢٧

## گێڕانی تاوسەکان بە شارو گوندەکانی ئێزدیاندا :

خدری سلێمان، نوسیویەتی: ئێزدیەکان دەڵێن تاوس مەلەك یەکێکە لە فریشتەکانی خوداوەند: ئیزرائیل، جبرائیل، .........، عەزازیل یش لە حەوت فریشتەکانن و تاوس مەلەك بوو کە راسپاردەی خوداوەندی لە یاد نەچووە و کڕنوشی بۆ (ئادەم) نەبرد، لە بەر ئەوە یەزدانی مەزن ئەوی بە سەرۆکی فریشتەکانی دیکە دانا[٣٤٩].

نوسەری پەرتوکی (فرق خاکسار) ی ئەهلی حەق نوسیویەتی، احمد غەزالی دەڵێت: ابو القاسم گورگانی هەرگیز نەیوتووە (ئبلیس) بەڵکو دەیگوت: خواجەی خواجەکان، سەروەری کۆچکردوان[٣٥٠].

نیکتین نوسیویەتی: هەندێك لە روحانیانی عیسایی کڵێسەی رۆمی رۆژهەڵات لەوبروایەدان، ئەو فریشتەیەی لە پلەی مەلەکوتی بکەوێت، دەبێت بە هەمان پلەوە بۆ ئادەمیان زەجر بکێشێت، وەك چۆن (پرومنە) فرێنەری ئاگر زەجری کێشا، بەو تاوانەی ویستبووی مرۆڤەکان لە نیعمەتی ئاگر بەهرەمەند بکات[٣٥١].

الحسنی نوسیویەتی: بە بروای ئێزدیان، شەیتان ئافەریدەی شەرە، لە بەر ئەوە لە ناوهێنانی خۆیان دەپارێزن و داستانی ئادەم، مار و تاوس کە لە (تەورات) دا هاتووە بە هەمان شێوەی دەزانن[٣٥٢].

"جورج حبیب" یش نوسیویەتی: کۆنترین داخوازی دەربارەی "تاوس مەلەك" کە بە دەست ئێمە گەیشتووە لە نوسراوەکانی مەندانیەکاندا هاتووە، ئەویش دەڵێت: فریشتەی رووناکی (مەلەکی دنهوار) داوای لە (بیت الحیاة) کرد کە پەرتوکێك ئامادەبکەن، ئەوان بۆ

٣٤٩- چهاردهی، نورالدین، اسرار فرق خاکسار– اهل حق ل٢٩

٣٥٠- نیکتین، کرد و کردستان ل٤٧٥

٣٥١- الیزیدیون، ل٤

٣٥٢- الیزیدیە، ل٢٦

ئەنجامدانی ئەم کارە (تاوس مەلەك) یان راسپارد تا "تەورات" بنوسێتەوە، لەوانەیە ئەم گێرانەوەیە پەیوەندی بە سەرهەڵدانی مێژووی مەسیحیەوە ببێت[٣٥٣].

توفیق وەهبی لە بارەی "مەلەك تاوس" ەوە نوسیویەتی: هەر لە کۆنەوە نازناوی تاوس بۆ نیشانەی رێز و ستایش بە کارهاتووە و خەڵکانی چاکەکاری وەکو (بایەزیدی بەستامی) بە تاوس الاولیا بانگکراوە، درێژەی پێدەدات کە (جبرەئیل) نازناوی تاوسی فریشتەکانیان پێبەخشیووە و لە ئەدەبیاتی کلاسیکی پارسیدا، خۆر بە هێمای تاوسی پەڕ ئاگر و تاوسی بڵند پایە باسکراوە.[٣٥٤]

کەیخوسرەو ئەسفەندیار نوسیوویەتی لە نێو هەسارەکانی جیهاندا، حەوتیان لە هەموویان ئاشکراترە، پاشای هەموشیان خۆرە، بۆ ئەو هەسارانە حەوت پەیکەر دروست کرا بەڵام پەیکەری خۆر لە هەموویان گەورەترە بوو.[٣٥٥]

صدیق بۆرەکەیی لە "مسعودی" ەوە دەڵێت: پاشماوەیەکی سەیر لە شاری "شیز" هەیە تەنە ئەسمانیەکان و گشت سەرنجراکێشەکان نیشان دەدات[٣٥٦]، هەروەها بۆرەکەیی لە "ابن المهلهل"ەوە وەریگرتووە کە"شیز" یەکێك لە شارەکانی "شارەزور"ە[٣٥٧] بەپێی ئەو بەڵگانە شاری "شیز" خاوەنی یەکێك لە گەورەترین پەرستگا ئاینیەکانی "ئاریەکان" بووە و ئەو پەیکەرە سەرنجراکێشانەی هێزە سروشتیەکانی لە خۆیدا جێکردۆتەوە، دوای ئەوەی کە ئاینی زەردەشتی سەرپێکەوت پەیرەوانی ئەم ئاینەیان بە دێوپەرستی تاوانبار کرد و شارەکەش توشی هێرش و پەلاماری زۆر بوەوە.

---

٣٥٣- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کردان، ل٩٢-٩٣

٣٥٤- دبستان مذهب، ل٥١

٣٥٥- نوشتەهای پراگندە دربارە یارسان اهل حق، ل١١٢

٣٥٦- نوشتەهای پراگندە دربارە یارسان اهل حق، ل١١١

٣٥٧- مزدیسنا، ل١٩٩-٢٠٠

معین کەلە "بندهشن"ەوە وەریگرتووە دەڵێت: ئازەر گوشتەسپ بتخانەبوو، کەیخوسرەو وێرانی کردووە، ئەو ئاگرەی بەباڵی ئەسپ کوژاندەوە و ڕۆشنایی بەخشی، بەوەی لە شانامەوە وەریگرتووە درێژەی پێدەدات و دەڵێت: کەیخەسرەو نزیکی دژ(قەڵا) بووەوە بەرنامەی دروودی خوداوەندی نووسی و ئەوی بەسەری نێزەکەیەوە بەست و بە "گیو"ی ووت، ناوی خوداوەند بهێنە و ئەم نێزەیە بە دیواری قەڵاکەدا بکە، کاتێ دروودی خوداوەند بەنێزەکەوە لە دیوار کەوت، لە هەموو لایەکەوە هەراو زەنگا هەڵساو جیهان بوو بەشەوە زەنگ، قارەمانان بەرچاویان تاریك بوو، کەیخەسرەو بەرەو پێش هێرشی برد و هاواری لە هاورێکانی کرد: قەڵا تیربارانبکەن، لە ئەنجامدا کۆمەڵێك لە دێوەکانی قەڵا کوژران و قەڵا داگیرکرا"[٣٥٨].

ڕەنگە دانیشتوانی قەڵا سەریان بۆ کەیخوسرەو دانەواندبێت یان ڕایانکردووە و پەنایان بۆ هاو ئاینەکانیان لە ناوچە شاخاویە دوورە دەستەکان بردبێت و ئیتر توانای دامەزراندنی شوێنێکی وا گەورەیان نەبووبێت پەیکەری هەسارە جیاوازەکانی تێیدا دروستکەنەوە، ڕەنگە پەیکەری بچوکیان دروستکردبێت کەبۆ هەڵگرتن ئاسان بن و نیشانە و هێمای ناسینی پیرۆزیەکانی ئاینەکەیان بن، لەبەر ئەوەی "خۆر" لە هەموو هەسارەکان گەورەترە بە تێپەرینی ڕۆژگار لەو حەوت پەیکەرە تەنها هێمای خۆر مابێتەوە.

دوای هاتنی ئاینی ئیسلام، ئیتر ئەوان نەیاندەتوانی ئەو پەیکەرە بە هێما و نوێنەرایەتی خۆر بناسێنن.

بە دەرکەوتنی "تصوف" و پێش هێنانی بابەتی "ئبلیس" بەو شێوەیەی کە باسکرا مەزنانی ئەوان ڕێگەچارەیان لەوەدا دیەوە کە ئەم پەیکەرە نوێنەری ئزرائیل، "ئیبلیس"ە، بە بەڵگەی ئەوەی کە "مەلەکە تاوس"، خۆرە و "ئبلیس" نیە. بەڵگەکان زۆرن و لەوانە ئەم بەڵگەیەی خوارەوەیە:

---

٣٥٨- بررسی مختصری از تأریخ ادیان کردان، ل٩٣

١.   پایەی خۆر لەلای ئیزدیان زۆر بەرزەو تەنانەت لەکاتی نوێژدا روو لەخۆر دەکـــــــەن.

٢.   بە بروای ئیزدیەکان، خۆر لەباری گەراندایە و سواری خۆرهەڵهاتن و خۆر ئاوابوون بوە، یان تیشکی رۆشناییەکەی بەهەر تەنێك بگات، مۆری خۆی لێدەدات، شەمسی تەبریزی نوێنەری ئەوە لەسەر زەوی. هەمیشە بۆگشت لایەك دەچێت و لەراستیدا باڵـــدارە.

٣.   لە ئەدەبیاتی پارسیدا، خۆر بە باڵندەکان چوێنراوە، لە شانامەدا لە رەمزی "رۆستەم و زۆراب" دا هاتووە:

**چو خورشید درخشان بگسترد پر   سسیه زاغ پران فرو برد سر**

**کاتێ خۆر درەوشاو خۆی دەرخست       قەلە رەش فڕی سەریخۆی هەڵگرت**

٤. بە بروای ئیزدیان، شێخ شمس کە نوێنەری خۆرە، زیندوکەرەوەی ئاینزاو ئاینی ئەوانە و بە ووتەی  ئەوان، ئەو خۆی ئاین و ئاینزایە، ئیتر ماف خۆیەتی (مەلەکە تاوس) بێت. بەلأم ئەوەی کەسەری لە لێکۆڵەران شێواندووە، ترسی ئیزدیەکانە لەوەی کە بەتپەرستی و رۆژپەرستی تاوانباریان بکەن، چونکە لە دیدی ئاینەکانی ناوچەکەوە جیهاد لەگەڵ بتپەرستان فەرمانە،

بەڵام ئەوان ئەگەر بەشەیتان پەرستی تاوانبار بکرێن، تاوس مەلەك کەنوێنەری شەیتان بێت، چارەسەریش بۆ ئەوە لە "تصوف"دا دۆزراوەتەوە بەناوی موسڵمانانی لە رێگە دەرچوو سەیریان دەکرێت، هەر بۆیە لەپارانەوەکانیاندا خۆیان بە پەیرەوانی ئاینزای "سونە دەزانن.

دەبێت ئەوەش بڵێین لە سەردەمی شێخ شمسی تەبریزی و شێخ حسنی دووەم (شێخ سن)ەوە لەسەر سەرۆکایەتی ئاینی ململانێ درێژەی هەیە[٣٥٩]. شێخ عودەی کە شێخ

---

٣٥٩- ئیزدیاتی، ل١٢٣

حسن جێنشینی ئەو بوو لەگەڵ احمد غەزالی پەیوەندی هەبوو، هەروەها کە لە باسی شێخ "عودەی"دا ئەم باسە یادکراوە کە شەیتان لەلای شێخ احمد غەزالی پایەیەکی بڵندی هەبووە.

ئێزدیەکان حەوت پەیکەری تاوسیان هەیە، (وێنەی یەکێك لەو حەوت پەیکەرە لە کۆتایی ئەم پەرتوکەدا هاتووە)، هەر پەیکەرەو بنکەیەکی مۆمدانی هەیە کە پەیکەری باڵداری "تاوس"ی لەسەر دادەنرێت و پەیکەرەکە باڵندەیەك پێکدێنێت و جامێکی تایبەتیشی لەگەڵدایە بە ناوی "جامی ئێزەد" و هەموو ساڵێك ئەم پەیکەرانە بە شار و ناوچە جیاوازەکانی ئێزدیەکاندا دەگێرن و هەرشەوەو لە گوندێك دەمێننەوە، هەر یەکێك لەو پەیکەرانە تایبەتە بە یەکێك لە ناوچە ئێزدی نشینەکان یان کە زووتر ئێزدی تێدا نیشتەجێ بووە، چونکە ئەوان لەو بروایەدان ئەوسا ناوچەی ئێزدینشین زۆر زۆرتر بووە.

–ئەمانەش حەوت تاوسەکەن:

١. تاوسی ئێزەد (عەنزەل)، تایبەتە بە گوندەکانی مێرگەکانی شێخان (مەلبەندی ئەمارەت) لە سەردەمی پێشیندا گوندەکانی ئەم ناوچەیە زۆر زۆر بوون و یەك سوری تاوس بەو گوندانەدا ساڵێکی خایاندووە، بەڵام ئێستا ساڵی سێجار ئەم تاوسە دەگێرن.

٢. تاوسی شەنگاڵ(سنجار)، ساڵی یەکجار بەگوندەکانی شەنگالدا دەگێرێت.

٣. تاوسی حەڵەب، ساڵی جارێك بۆ ناوچە ئێزدیەکانی سوریای دەبەن.

٤. تاوسی خاڵتیا، بۆ ناوچە ئێزدیەکانی تورکیای دەبەن.

٥. تاوسی مەسقوف، بۆ ناوچە ئێزدنیشینەکانی ئەرمەنستانی دەبەن.

٦. تاوسی تەبرێز، تایبەتی ئێزدیانی رۆژهەڵاتە.

٧. تاوسی زۆزان، تایبەتی ئێزدیانی ناوچەی هەکاریە.

شێخ سلێمان لەزمانی شێخ حەجی کوری شێخ سمایل، کە "بابا شێخ"ی ئێزدیان بووە دەگێرێتەوە: رابەرانی ئاینی ئێزدیەکان لە "لالش" کە بیانویستایە دەستەی سروود خوێن و راگەیاندنی خۆیان بۆناو ئێزدیان رەوانە بکەن، هەتا رێگەی ئاینیان بۆ رۆشتبکەنەوە و بەخشینی "صدقات"ی ئەوان کۆبکەنەوە و لە گرفتەکانی ئەوان ئاگادار

بینـەوە، دەبـوو نیشـانەیەك لەگـەڵ خۆیانـدا ببـەن و هێمایـەكی دیاریـان پێبێـت كـە بیسەلمێنن ئەم دەستەیە لەلایەن رابەرانی ئیزدیانەوە نێـرراون، خـەڵكی ئـەو ناوچـانەش رێزێكی زۆریان لە هێما و لە لیژنەی سەرپەرشـتیار دەگرت. دەتـوانین بڵـێین وەك چـۆن هاوڵاتیان ئاڵای وڵاتەكانیان لەلا پیرۆزە، ئیزدیـەكانیش "تاوس"یـان لـەلا پـیرۆزە، بابـا شێخ درێژەی بە ووتەكانی دەدات و داخ دەخوات كە هەندێك لە نوسەرانی بێگانە تۆمەتی پەرستنی ئەم تاوسانە بۆ ئیزدیەكان هەلدەبەستن، هەروەها دەڵێـت ئـەم حـەوت هێمایـە لەشـێوەی تاوسـی جـوانترین باڵنـدەدا دروسـتكراون كەلـە هەنـدێك لەشـارە كۆنـەكانی (عیراق)یشدا وەكو شـاری حـەزەر (هـاترا) وێنەیـەك دەبینرێـت كـە شـارەوانێك قوربـانی پێشكەشی تاوسێك دەكات.[٣٦٠]

بەپێی ئەوە مێژووی ئەم تاوسانە بۆ سـەردەمانی زۆر دوور دەچـنەوە. لەبـەر ئـەوەی ئیزدیەكان بۆ پاراستن و پارێزگاری كردنی تاوسەكان، ناهێڵن جگە لەخۆیان كەسی دیكـە ئەو تاوسانە ببینن، دووچاری گرفتی زۆر بوونەتەوە. هەرگیز ئەو هێرشەی سـاڵی (١٨٩٢ زاینی)یان بیرناچـێتەوە كـەزۆر نامەردانـە بـۆ سـەر جەرگـەو مـەزارە پیرۆزەكانیـان كـرا، لەلایەن فەرماندەیەكی باڵای دەوڵەتی عوسمانی یەوە، هەرحەوت تاوسەكەیان زەوت كرا، كوشت و بڕ و تاڵانێكی زۆری لێكردن.[٣٦١]

چوار لەو تاوسە بە تاڵانبراوانە بەهۆی (سلێمان نظیـف پاشـا)ی والی عوسمانیـەوە بـە میری شێخان درایەوە، ساڵی سێ جار تاوسـی عـەنزەل بۆنـاو ئیزدیـانی عێـراق جگـە لـە ئیزدیانی شەنگال دەبرێت و هەندێك لە قەواڵان ساڵی جارێـك (هـەموو سـاڵێكیش نابێـت) تاوسی حەڵەب بۆناو ئیزدیانی حەڵەب دەبەن و هەندێكی دیكەیان تاوسی خاڵتیـا بـۆ نـاو ئیزدیانی توركیا دەبەن.

---

٣٦٠- ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە كە كوردان بە تایبەتی ئیزدیەكان بەهۆی ئەوەی زۆربەیان لـە قەڵـەمرەوی عوسمانیدا بوون و لەفەرهەنگی ئاریەكان دوور و بێئاگابوون، لە ئێرانی دیرۆكیشـدا پەیكـەرێكی زۆر هـەبووە كـە هێمای حەوت فریشتە (هەسارە) بوون،هەندێك لەوانە لە شێوەی باڵداردا بوون. ر.ك دبستان مـذاهب، ل ١٥.

٣٦١- ر.ك تأریخ ایزدیان.

تاوسی "شەنگاڵ"یش ساڵی جارێك دەگێڕرێت، بەڵام تاوسی مەسقوف بەهۆی ئەوەی کە دەوڵەتی رووسیای تزاری و دوای ئەویش یەکێتی سوڤیەتی پێشو لە (ساڵی ١٩١٤)ەوە نەیدەهێشت، ئیتر تاوس بۆ ناو ئیزدیانی ئەرمەنستان نەیراوە و پێدەچێت لە روخانی سۆڤیەتەوە دەستپێبکاتەوە.

ساڵانی پێشو تاوسەکان لە لالش دەپارێزران، بەڵام دوای ئەوەی میرانی ئیزدی لە "باعەدرێ" نیشتەجێ بوون، لەوێ "گەنجینەی رەحمان"یان بۆ دروستکردن و تێیدا دەیانپارێزن.

تاوسی عەنزەل لە مانگی نیساندا، دوای جەژنی سەری ساڵ، و چلەی زستان، دوای جەژنی جەمایی بۆ ناو ئیزدیان دەبرێت. تاوسی شەنگال لەیەکەم مانگی پایزدا بۆ شەنگال دەبرێت.

پێش وەخت میری ئیزدیان، سەرۆکی قەواڵان کەلە "بەحزان" نیشتەجێیە بانگ دەکات، خۆی بۆ دەرهێنانی تاوسەکان ئامادە بکات، شەوێ ترشە سماق لە ئاو دەکەن، بەیانی تاوس و جامی ئیزەد بە ترشاوەکە دەشۆن، ئینجا تاوسەکە دەکەنە گلێنەی تایبەتیەوە کە "هەگبە"ی پێدەڵێن و لە "باعەدرێ"وە بۆ "بەحزان" بۆ گەلی تاوسەکان دەبەن و لەوێ لەسەر پایەی تایبەتی دایدەنێن. قەواڵان، دەست بە قەول(سرود) خوێندن و دەف ژەنین و نەی لێدان دەکەن و لەگەلی تاوسانەوە بۆ بەحزانی دەبیەنەوە، خەڵکی بەحزانی بەگەورەو بچوکەوە بەپێی پەتی بە پێشوازی تاوسەوە دێن و رێزی لێدەگرن و لەگەڵیدا بۆ بەحزانی دەچنەوە، تارۆژی دواتر لە بەحزانی دەمێننەوە ئینجا بۆ "باشیکی" دەچن و دوای شەوێك بۆ (باسکی شێخ کەندال) دەچن و بەهەمان شێوە بۆ گوندەکانی دیکەی ناوچەی شێخان، دنا، لەحفا قادیا و بربنی دەرۆن و سەرئەنجام بۆ باعەدرێ دەگەڕێنەوە.

<u>**ئەمانەی لای خوارەوە هاوڕێیەتی تاوس دەکەن:**</u>

١. لیژنەیەك لە قەواڵەکان کەلە چەند کەسی دەف لێدەر، نەی ژەن و یەکێکی شارەزای بواری ئاینی و ووتاردان پێك دێن.

٢. نەقیب: ئەمە لە بنەچەی پیرانی هاجیالە. سوارکردن، پیادەکردن، هەڵگرتنی تاوس لە ئەستۆی "نەقیب" دەبێت، لە کۆڕی دانیشتنیشدا لەلای راستی تاوسەوە دادەنیشێت، سوارکردنی تاوس بریتیە لە دانانی تاوس لەسەر پایەو بنکەی تایبەتی خۆی و دانانی سێ سەرین لە پشتی یەوە و دوو سەرین لەلای چەپ و دووانیش لەلای راستی "تاوس"ەوە ئەرکی نەقیبە.

٣. سەروەری کانیا سپی (پەردەداری کانیە سپی)، ئەم کانیە لە نزیکی مەزارگەی "شێخ عودەی" دایە.

٤. سەروەری مالا شێخادی (پەردەداری ماڵی شێخ عودەی).

٥. نوێنەری ماڵی میران.

٦. قاوەچی قەواڵەکان.

پێش بەرێکەوتنی ئەم لیژنەیە، پەیك بۆ ئەو گوندە دەنێرن کە فڵانە رۆژ تاوس بۆ گوندی ئێوە دەهێنرێت، دانیشتوانی گوند قوربانی ئامادەدەکەن و لە پێشوازیدا دەبن، لەو رۆژەدا کوێخای گوند هەواڵی نزیکبونەوەی تاوس رادەگەیەنێت، ئەوانیش خۆیان شتوە و پۆشاکی خاوێن و سپیان پۆشیووە و بە پێ خاوسی بە پیر تاوسەوە دەچن.

قەواڵەکان یەکەم جار بۆ مەزارگە یان بۆ گومەزی تایبەتی ناو گوند دەچن و بۆنەی سەردانکردن کە بە رێزگرتن و ماچکردنی دەرو دیواری مەزارگەیە دەست پێدەکات.

هەگبەی تاوس دادەگرن و دەکەونە پشوودان و چاوەروانی گەیشتنی خەڵکی گوند و زێوانەی مەزارگەکە دەکەن، خەڵکەکە بە هەڵەداوان دەگەن و دەبن بەدوو دەستە و لەمبەر و ئەوبەر لەناو گوندەوە هەتا مەزارگە ریز دەبەستن، قەواڵەکان دەست بە قەول خوێندن و دەف لێدان و نەی ژەنین دەکەن، ژنان هەلهەلە لێدەدەن، قەواڵەکان، نەقیب و پەردەداری کانی سپی بەریز بەنێو ئەو دوو ریزەی خەڵکەکەدا دەرۆن،

هاوسەری زیوانی مەزارگە دەفرێك "بخور"ی پێیە و لە پێشیانەوە دەروات، لەو ڕۆژەدا گشت خەلکی دێ بەپێ خاوسی هاتووچۆ دەکەن. ئەوی حەز بکات "تاوس" میوانی بێت، هەگبەی تاوس لەسەر ملی دەنێت، داخوازانی دیکە دەکەونە پێشبرکێ، هەرکەس زۆرتر بدات ئەوشەوە تاوس لە ماڵی ئەوان دەبێت.

کە لیژنەکە بەماڵی خانەخوێ دەگات، قەواڵەکان پارانەوەو سروود دەخوێنن و بەو شێوەیەی کە باسمان کرد تاوس سەردەخەن و چرای تایبەتی "کانی سپی" لەو ماڵەی جاری پێشوتر خانە خوێی تاوس بووە، دادەگیرسێنن.

خەڵکی گوند واز لە کاروبار دەهێنن و ئامادەدەبن، ئەوان نیوەڕۆژەو شێو لە ماڵی خۆیان ناخۆن، هەرکەسە و دەفرێك خۆراك بۆ قۆناغ[٣٦٢] (مالی خانەخوێ) دەبەن و لەوێ دەیخۆن.

شایەنی باسە ئەم لیژنەیە تەنها بۆ سرود و چیرۆك خوێندنەوە و کۆبوونەوە و پارە کۆکردنەوە ناچن بەڵکو ئەوان بۆ بەسەرکردنەوە دەچن، ئەگەر لە نێوانیاندا گرفت و دوژمنایەتی هەبێت چارەسەری دەکەن و بەراتیان پێدەبەخشن.

"بەرات"بریتیە لە گڵی سەرمەزارگەی شێخادی کە بە ئاوی کانیا سپی خۆشکراوە، قەواڵەکان بەرات بە هێمای ئاشتبوونەوە بە هەردوو لا ناکۆکەکە دەدەن. هەردوو لا بەراتەکانیان دەگۆڕنەوە هەتا ئەو بەراتانەیان لەلای یەکتری بێت هیچ گرفتێك لە نێوان ئەواندا روونادات. ئەگەر لە نێوانیاندا گرفت یان دوژمنایەتی سەریهەڵدایەوە بەشێوەی ئاشکرا بەراتەکان دەگێرنەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژەی لیژنەکە دەگات، قەواڵێك پارانەوەی خۆرئاوا (کەلە بابەتی نوێژدا هاتووە) دەخوێنێت، دوای شێوکردن قەواڵێك پارانەوەی خوان (دروزا سفری) دەخوێنێت، دوای ئەوە تەواوی خەڵکی ئاوایی لە گەورە و پچوك لە کۆری میواناندا ئامادەبن.

---

٣٦٢- قۆناغ لە زمانی ئازەریدا بە مانای میوان هاتووە.

زیوانەی مەزارگە، کوێخای دێ، ڕیشسپیانی ئاوایی لەلای میوانەکان دادەنیشن لاوان لە پشتی ئەوانەوە لە شێوەی بازنەیەکدا دەوریان دەدەن و ژنان و کچانیش لە پشت ئەوانەوە دادەنیشن، ئەگەر لە حەوشەی ماڵەکەدا جێگەنەبوەوە، بۆ سەربان دەچن.

هەر کەسێك کە دێت دەبێت سەرەتا ڕێز لە تاوس بگرێت، دوای ئەوە مۆری ئێزدیان کە ئاوی کانیا سپیە بە خۆیدا بپرژێنێت و ڕێز لە جامی ئیزەدی بگرێت، ئەوسا تەوقە لەگەڵ (نەقیب) بکات، کە لەلای ڕاستی "تاوس"ەوە دانیشتووە دواتر تەوقە لەگەڵ میوانەکانی دیکە دەکات، ئینجا پاشە و پاش بۆ جێگەیەك کە دەیەوێت بڕوات دەگەڕێتەوە و لەوێدا دەوەستێت، هەتا قەواڵ بە پارانەوەیەك ڕێگەی دانیشتنی پێدەدات، دووای ئەوەی هەمووان بەو شیوازەی کەوتمان جێگیربوون، ئینجا زیوانەی مەزارگەی گوند هەڵدەسێت و دەست لەسەر دەست دادەنێت و دەڵێت: ئەی باوکی قەواڵ، میرو بابە شێخ ئێوەی ناردووە هەتا هەواڵی ئێمە بزانن و ڕێگەی ئاینمان بۆ ڕۆشن بکەنەوە، من لەلایەن دانیشتوانی گوند و جوامێرانی ئامادەبووەوە بەخێرهاتنتان دەکەم، ئێمە بۆیە لێرەدا کۆبووینەتەوە هەتا ووتەی باش و بەیت و چیرۆکی باشی یەزدان و مەلەکە تاوس ببیستین.

قەواڵ لە وەڵامی زێواندا دەڵێت: ئێوە هەمووتان جوامێرن و خاوەن زانستن، بەسەرچاو، فەرموون دانیشن، زێوانە دەچێت بۆ ناوەندی کۆرەکە و بەرامبەر قەواڵ و مەلەك تاوس دادەنیشێت، سەرۆکی قەواڵان ڕوودەکاتە زێوان و دەڵێت: خواوەند چاکەی ئێوەو ئامادەبووان پتر بکات و زانیاریتان زۆرتر بکات، و ووتەکانی دەربارەی ڕوونکردنەوەی ئایین و پێکەوەژیانی خەڵکی لەگەڵ یەکتری و ئامۆژگاری دەستپێدەکات، لە سەبق و پارانەوە و قەولەکان سوود وەردەگرێت و دەیخوێنێت، ئەمەش هەندێك لە ووتەکانی قەواڵە: ئەی جوامێران ئەوەی لەلای ئێمەیە قەول و باوەرەکانی ئێزدیانە، باوەری ئێمە لەزانستەوە سەرچاوەی گرتووە، زانستی یەزدان، دەریای بێ پەیە، ئێمە گوڵەچنی داکەوتەی مەزاری جوامێرانین، خوداوەند بەزەیی بە باوك و دایکی ئەو کەسانەشدا بێتەوە کە ئەم قەول و قەسیدانەیان بۆ ئێمە جێهێشتووە. ئەوانە ڕێگەی

یەزدانیان بۆ ئێمە رۆشنکردەوە، ئینجا چەند ووتەیەك دەربارەی باوەر و ستایشی حەوت فریشتە و مەزنانی ئاینی دەخوێنێت و لە ئامادەبوان دەخوازێت لە درۆکردن، تۆمەت بەخشینەوە، دووڕووی، زۆربلێی و ستەمکاری خۆیان بپارێزن و بیریان دەخاتەوە کە مەرگ لە کەمیندایە و ئیتر لێپرسینەوەیە، ئەو رۆژە کەس بەدادی کەس ناگات، ئەو رۆژە خودای مەزن خۆی دادوەر دەبێت. لەکاتی ووتاری قەواڵدا، کەس بۆی نیە قسە بکات، ئاوبخواتەوە، جگەرە بکێشێت. یان خۆی خەریك بکات.

لە کۆتایشدا قەواڵ دەڵێت: ئێمە نەنگدار و نا تەواوین و خوداوەند بێکەم و کورتیە و خوداوەند چاکەی خۆی باوك و دایکی ئامادەبوان و ئیزدیانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و شام و هەرمرۆڤێك ببەخشێت، لە دوای قسەکانی قەواڵ، پارشێو (خۆراکی دوای شێو) دەهێنن، دوای ئەوە پارانەوەی خوان دەخوێنن و هاوزەمان دەف و نەی دەهێنن و کۆڕ گەرم دەکەن.

هەموو بێدەنگ دەبن، ئینجا قەواڵ لە زیوانەی مەزارگەی گونددەپرسێت: کام قەولی دیکە دەخوازیت تا بۆتان بڵێم؟

جاری واش هەیە، قەواڵ لەباتی زێوان لە خانە خوێ دەپرسێت:

ئیتر ئەم کۆرە هەتا نیووەی شەو درێژەی دەبێت، دواتر پەردەداری شێخادی دەڵێت:

**هەرچی بدەتە من ئاڤەکی**      **هەرکەسی بداتە من ئاوەکی**

**خودی بدەتی بەژن زراڤەکی گردەن گازەکی**      **خودا بیداتێ بەژن زراڤەکی**

**گەردن گازەکی**

**خودان ئیمانەکی**      **خاوەن ئیمانەکی**

لاوان پەلامار دەدەن ئاو بەرن، پاش ئەوەی پەردەدار گۆزەئاو وەردەگرێت، جامی ئیزەد کە یەکێك لە شتە پیرۆزەکانی هاورێی "تاوس"ە پڕ لە ئاو دەکات و لە "نەقیب"ەوە دەستپێدەکات و روخساری بە ئاوەکە تەڕ دەکات، ئیتر جگە لە چەند پیرە مێردێك، خەڵکەکە وورده وورده بڵاوەی لێدەکەن.

ڕۆژی دواتر پێش خۆرهەڵاتن، بەیتی جوندی و بەیتی شێخ شەمس دە خوێنن. خەڵکەکە لە خەو هەڵدەسن، ئینجا مەزنان چاکە و صەدەقەی خەڵکی بە سەرۆکی قەواڵان دەدەن و بۆ هەریەك لە ئەندامانی لیژنەکە برێك پارە دیاریدەکەن و داوایان لێدەکەن رازی بن، ئەوانیش لە بەرامبەردا بۆ خەڵکی گوند دەپارێنەوە. پێش نیوەرۆ قەول و هۆنراوە بۆ خەڵکی گوند دەخوێننەوە و داخوازی ئەوان بۆ میر و بابە شێخ دەبەنەوە، ئینجا لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە بەرەو ئاواییەکە بەرێیان دەکەن.[٣٦٣]

لەبەرئەوەی پێشتر بەیتی شێخ شەمس هات، لێرەدا چەند سەبقێك لە بەیتی جندی دەهێنینەوە:

**بەیتا جندی**

جندیێ رابە رۆژە
بەس ڤێ خەوێ هندۆژە
خەوا بەری سبی زور عەذاب و دوژە
جندیێ رابە رابە
بەسی ب ڤێ خەوێ توشابە
خەوا بەری سبی زۆر عەذابە
رابە ژ خەوید شرینە
بەس گۆرێ تنگ ببینە
فەقیر دێ کرین، دبێ کینە[٣٦٤]

**بەیتی جندی**

ئەی مرۆڤێ چالاك و زیرەك هەڵسە رۆژە
بەسە خەوێ هەندوژە
خەوی کاتی سبەی زۆر بە ئازار و دۆژە
مرۆڤی چالاك و زیرەك رابە رابە
بەس بەم خەوە تۆ شادبە
خەوی کاتی سبەی زۆر عەزابە
رابە لە خەوی شیرینە
بەس گۆری تەنگ ببینە
فەقیر دەبێ کرپن، بێ کینە

---

٣٦٣- گوندیاتی، ل٢٤-٢٧ و الیزیدیون، ل٤٠-٤٤

٣٦٤- ئیزدیاتی، ل٦٤-٦٥

## بەڕێکردنی مردو و پێچانەوە و ناشتنی :

لە بابەتی باوەری ئێزدیەکاندا ئاماژە بە مەرگ کرا، کە دەبێت لە کاتی مەرگی هەر کەسێکدا شێخ، پیر، برا و خوشکی کۆتایی ئەو مردووە، ئامادەبن، شێخ نەختێك خاکی بەرات لە نەختێ ئاودا شلدەکاتەوە و چەند دڵۆپێك لەو گیراوەیە لە دەمی ئەو کەسە دەکات کە لە گیانە ڵادایە، ئەگەر شێخ لەوێ نەبوو، ئەوا یەکێك لە بنەماڵەی مردووەکە ئەم کارەی شێخ دەکەن، دوای مەرگ، شێخ یان جێنشین مردووەکە دەشوات و نەختێك لە خاکی بەرات لە دەست و چاوی دەدات و نەختێ بەلەشیدا دەپرژێنێت و بەسەرو بەستێکی سپی سەری دەپێچن. ئینجا کونەکانی لەشی بە لۆکە دەگرن و باشترین بەرگی سپی خۆی لەبەر دەکەن، دوای ئەوە کفنەکەی بۆ دەدرون و لەبەری دەکەن، بەشی لای سەرووی سەری مردووەکە دەبەستن، ئەوە کەس و کاری مردوەکەش هەندێك بە گریان و هەندێك بە خەمباری لە دەوری ریزبوون.

دوای تەواوبوونی کفنەکەی، تەرمەکە لەسەر دوودار کە بە ناوی کانیا سپی مۆر(تەر) کراوە دادەنێن و بەرەو گۆرستان بەرێیدەکەن[٣٦٥]. زێوانەی مەزارگەی گوند دەرگای زهمانی (گۆرستان) دەکاتەوە و چەند جارێك قولنگ لە زەوی دەدات، ئینجا خەڵکەکە زۆر بە گەرمی هاوکاری هەڵکەندنی گۆر دەکەن چونکە پاداشتێکی فراوان لەوەدا دەبینن، پێش ئەوەی دایهێڵن ئەو کەسەی کفنی کردووە گرێی سەری مردووەکە دەکاتەوە، ئینجا دەستدەکەن بە بەردڕێژکردنی ناو گۆرەکەی و زێوانەی مەزارەکەش هەتا ڕێورەسمی بە خاکسپاردنەکە کۆتایی دێت هەر قەولی سەرە مەرگ دەخوێنێت[٣٦٦].

شایەنی باسە هەخامەنشینەکان، هەتا ئەو کاتەی "زەردەشت" گۆرانکاری لە ئاینی "مەزدا"یدا نەکردبوو، مردووەکانی خۆیان بەخاك دەسپارد و لەکاتی هەندێك لە پاشاکانی "ئەشکانی"دا، مردوەکانیان بە پێداویستیەکانیانەوە دەناشت.[٣٦٧]

---

٣٦٥- اليزيديون، ل٩٩-١٠٠

٣٦٦- ر.ك، باسی باوەری ئێزدیەکان دەربارەی مەرگ

٣٦٧- گوندیاتی، ل١١٢

الحسنی نوسیوەتی: ئەگەر مردووەکە نەوبوك بوایە، ئەوە بەباشترین جل و بەرگ و هەندێك لە زێر و خشڵەکانیەوە دەیانناشت.

ئەو "کۆچەك"انەی لە بۆنەی شاردنەوەی مردووەکەدا بەشداری دەکەن، بەهۆی ئەوەی بۆ مردووەکە دەپارێنەوە و لەبەرئەوەی سەرئەنجامی مردوەکە دەردەخەن برێك پارەیان پێدەدرێت[٣٦٨]. کە مردووەکە نێژرا زیوانەی گۆرستان تەلقین دەخوێنێت.

ئینجا هەموو پێکەوە لە زەمانی (گورستان) دەردەچن، بەرەو مالی مردوەکە بەرێدەکەون بەلام بۆ ئەوەی بەو غەم و بەژارەیەوە بۆ مالی مردوەکە نەچن، لە رێگا پشوویەك دەدەن. دوای پیاوان، ژنان و کچانی سەر بە مردووەکەش سەرێك لە گۆرەکە دەدەن و ژنێکی دیرۆکڤان (پرسە خوێن) بە دەنگێکی پر سۆز شیوەنی بۆ دەکات و ژنانیش بەدوایدا گریە و شێوەن دەکەن، ئینجا بەرەو مالّ دەگەرێنەوە، دوای حەوت رۆژ، زیوانە بۆ مالی مردوەکە دەچێت و هەندێك بەیت و هۆنراوە دەخوێنێت، کە پوختەکەی بریتیە لەوەی:کە مەرگ سەرئەنجامی هەموو مرۆڤێکە و دەبێت مرۆڤ بەکاری خوداوەند رازی بێت[٣٦٩].

گۆرستانی ئیزدیان لە زیارەتگاکانیانەوە نزیکن، شێوەی گۆرەکانیشیان لەگەلّ موسلّمان جیاوازیەکی هێندەی نیە، ئیزدیەکان حەز دەکەن گۆرەکانیان بە گەچ سپی بکەنەوە[٣٧٠].

## بۆنەی خەتەنەکردن:

یەکێك لە بۆنە تایبەتەکانی ئیزدیەکان خەتەنەکردنی مندالی نێرینەیە، خدری سلێمان نوسیویەتی: هەندێك نەریت لە بۆنەی خەتەنەکردندا لە بەرچاو دەگیرێت[٣٧١]، ئەو نەریتانەش بنەرەتەکانی بۆنەی خەتەنەکردنە و ئەم قۆناغانە دەگرێتەوە:

---

٣٦٨- شاه حسین، تمدن و فرهنگ ایران،ل٦٠-٨٣

٣٦٩- ر.ك چینی کۆمەلایەتی، ئاینی ئیزدیان

٣٧٠- گوندیاتی، ل٧٤

٣٧١- الیزیدیون ل١٠٠

١. قۆناغی هەڵبژاردنی کریڤ( ئەو کەسەی لە کاتی خەتەنەکردنەکەدا کورەکە لە کۆش دەگرێت).

٢. قۆناغی خۆ ئامادەکردن بۆ ئەنجامدانی ئەم بۆنەیە.

٣. قۆناغی دیاریکردنی رۆژانی بەرپاکردنی بۆنەی خەتەنەکردنەکە.

٤. قۆناغی بانگهێشتی خەڵکی گوند.

٥. قۆناغی دوای بۆنەکە تێکەڵی و هاتوچۆی بنەماڵەی کریڤ و منداڵەکەی.

**قۆناغی هەلبژاردنی کریڤ:** لە بەشی سێیەمدا لە پلەی روحانیەکان و چینە کۆمەلایەتیەکانی ئیزدیەکاندا باسکرا کە ئیزدیەکان لە سێ چینی بنەرەتی (شیخ، پیر، مورید) پێکدێن و بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە خدری سلێمان ئەنجامی داوە، ئیزدیەکان لە دوو چین پێکدێن، چینی پیر و چینی مورید، چونکە چینی شێخ دوای هاتنی شێخ عودەی هاتوو، لە هەلبژاردنی "کریڤ"دا گوێ بە چینایەتی نادرێت، بەڵکو ئەوە گرنگە بنەماڵەی کورە لە هەوڵی کورەکەیاندابن و کەسێکی گونجاو لەبەرچاوبگرن، ئینجا ئەو کەسە لەو کارە ئاگادار بکەنەوە، مەرجیش نیە ئەو کەسە هەر ئێزدی بێت، چونکە "موسلمان"یش بێت ئاساییە و ئەم نەریتە لەنێوان ئیزدیان و موسلماناندا بوە و تەنانەت موسڵمانانیش منداڵی خۆیان لە باوەشی ئیزدیەکاندا خەتەنە دەکەن، کە کریڤ هەلبژیررا ئیتر خۆئامادەکردن بۆ بۆنەکە دەست پێدەکات.

**قۆناغی دووەم:** لە قۆناغی دووەمدا پارەی تێچونی بۆنەکەدابین دەکرێت و رۆژی ئەنجامدانی بۆنەکە دیاری دەکرێت.

بەو بۆنەوەیەوە بنەماڵەی خاوەن بۆنە، پۆشاك و پێلاو بەناوی دیاریەوە دەکرن و پێشکەشی خزم و خوێشانی گوندەکەیان دەکەن، بەمە دەردەکەوێت کە بۆنەکە بەرێوەیە[٣٧٢]. لە گۆڤاری (مەتین)دا هاتووە: چەند رۆژێك پێش ئەنجامدانی

---

٣٧٢- گوندیاتی ل٧٤-٧٦

خەتەنەکردنەکە، ماڵی کورەکە سەردانی ماڵی هەڵبژاردە(کریف) دەکەن و بەو بۆنەیە دیاری جیاواز بۆ ئەندامانی ئەو خێزانە دەبەن و بۆ ئەو بۆنەیەش بانگهێشتیان دەکەن.

کریف یان بنەماڵەکەیان هەمانشێوە دیاری بە منداڵەکە و خێزانەکەیان دەبەخشن[٣٧٣]، بەگۆڕینەوەی دیاریەکان و مسۆگەرکردنی "کریف" قۆناغی سێیەم دەستپێدەکات.

**قۆناغی سێیەم:** ڕۆژێك بەر لەدەسپێکی بۆنەکە بەشداران لە ماڵی ئەوان کۆدەبنەوە، هەڵپەرکێی لاوان دەسپێدەکات، هەندێك جار پیرە دڵتەرەکانیش بەیادی لاویانەوە لەم بەزمەدا بەشداری دەکەن. دوای ئەوە دەرۆنەوە هەتا بە رووتی بخەون و بەیانی زوو بێداربینەوە و پۆشاکی خاوێن و قەشەنگی خۆیان بپۆشن و بەشداربن. ئەگەر کریف خەڵکی گوندێکی دیکە بێت، ڕۆژی پێش بۆنەکە لەگەڵ چەند کەس لەدۆستانی دێن، کەنزیك دەبنەوە، بەتەقاندنی چەند گوللەیەك، گەیشتنی خۆیان دەگەیەنن. خەڵکی گوندیش بە چەند فیشەکێك وەلامیان دەدەنەوە و لەگەڵ گۆرانبێژەکانیاندا کە خۆشترین گۆرانی دەبێژن، بە پێشوازی کریف و هاورێکانیەوە دەچن و بەرێز و خۆشیەوە بۆ ماڵی بۆنەداریان دەبەن.

ئەگەر کریف خەڵکی هەمان گوندبێت، شەوی پێش بۆنەکە ئامادە دەبێت و لەشادی و شەونشینیەکە دا بەشدار دەبێت، درەنگانێك دەرواتەوە و خۆی بۆ بەیانی ئامادە دەکات. بەیانی لەگەل گزنگی خۆر، لەگەل ئاوازی شادی هەڵپەرکێ و گۆڤەند دەستپێدەکات، خەڵکەکە بەدڵێکی زۆر شادو بەرووی خۆشەوە بەشداری دەکەن. ئینجا هەموو لەگەڵ گۆرانیبێژەکان بەرەو ماڵی کریف دەچن، هەتا لەوێن بەرووتی، سەرگەرمی سەماو هەڵپەرین دەبن، ئینجا بۆ شوێنی بۆنەکەی دەبەن وتێکەلی ئاپۆرای خەڵکەکە دەبن، حەکیم، کریف، منداڵەکە، باوکی یان بەرپرسێکی و دایکی لە ژوورێك تەنها دەمێننەوە، رەنگە یەك، دووکەس وەکو هاوکار بۆ هاوکاریان بێن، کورە لە دامێنی "کریف"دا دانەنێن و حەکیم کاری خۆی دەکات. دەبێت لەکاتی خەتەنەکردنەکەدا یەکدو دڵۆپ خوێن بە

---

٣٧٣- ئاری، گۆڤاری مەتین، ل٥٢-٥٣، ساڵی ١٩٩٢

جلـەكانی (كـریف)دا برژێـت[374]. وەكـو نیشـانەیەك ئەگـەر نـەش ڕژا، حـەكیم خـۆی ئـەم كارەدەكات[375].

دوای ئەوە دەبێتە كریڤی كوڕە و دیاریەكی گونجاو بەدایكی كورە دەبەخشێت، ئینجا نوقـل و شـیرینی پێشكەشـی ئامـادەبوان دەكرێـت و تەقـەی خۆشـی دەكرێـت و بـەزم و هەڵپەركێی لاوان دەستپێدەكات، پیاوانیش دانیشتوون چاوەڕوانی حەكیم دەكەن.

حەكیم بـەخۆی و هەگبەكەیـەوە دێـت لەبەرامبـەر كـریڤ دەوەسـتێت، كـریڤ وەكـو هەقدەست بڕێ پارە بەحەكیم دەدات، ئینجا حەكیم بەبەردەمی یەكە یەكەی خەڵكەكەدا تێدەپەڕێت، هەركەسەو بـەپێی توانـای خـۆی بڕێـك پـارە لـە هەگبەكـەی دەكـات، مـاڵی كورەش دیاری خۆیانی پێشكەش دەكەن.

بۆ دڵنیابوون لەوەی كەسێك مابێتەوە و نەهاتبێت بە گوندەكەدا دەگەڕێن و دەیهێنن. ئینجا نۆرەی خواردنە و شادی و بەزم و هەڵپەركێ بەردەوام دەبێت و ئەم بۆنەیـە چـەند ڕۆژ دەخایەنێت.

٤- دوای كۆتـایی هـاتنی بۆنەكـە پیـاوانی گونـد لـە بەرامبـەر ئـەو دیـاری و خوانـەی خاوەن بۆنەكە یەك یەك یان كۆمەڵ، كۆمەڵ بەدیاری جیاوازەوە لەوانە (مەڕ) بە سەریان دەكەنەوە. ژنانیش خواردنی جیاواز ئامادە دەكەن و بۆ سەردانیان دەچن.

٥- دوای تێپەربوونی چەند ڕۆژێك كریڤ یان ماڵی كورە، شت دەكرن و خواردەمـەنی ئامادەدەكەن و سەردانیان دەكەن، یەكدو ڕۆژێك لەوێ دەمێننەوە و ئەوانیش بەجوانترین شێواز پێشوازیان لێدەكەن، پاش ماوەیەك ماڵەكەیان هەمان كاردەكاتەوە.

بەمشێوەیە پەیوەندی لەنێوان خێزانەكاندا بەهێزدەبێت و لە دژواریەكاندا یارو یاوەری یەكدی دەبن. شایەنی باسە ئەگەر ماڵی كریڤ لە هەمان چینی كورە خەتەنەكراوەكەبن، ئەوا نابێت هەتا حەوت پشت، ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا بكرێت.

---

٣٧٤- گوندیاتی، ل١٧٧

٣٧٥- گۆڤاری مەتین، ژمارە (١٣)، ل٥٣ ساڵی ١٩٩٢

ئەگەر هەردوو خێزانەکە لە چینی مورید یان شێخان یان پیران بن، دوای خەتەنە کردنەکە هەتا حەوت پشت ژن و ژنخوازی لەنیوانیاندا نەشیاو دەبێت، بەڵام ئەگەر هەریەکە و سەربە چینێك بن، ئەوا پێش خەتەنەکەش ژن و ژنخوازی لەنێوان ئەندامەکانی خێزانەکانیادا هەر نەشیاو(حەرام) بووە.

## پیشەگەری، جل و بەرگ و خۆراك:

تاچەند ساڵێك لەمەو پێشیش ئیزدیەکان خۆیان لە سەوداگەری و پیشەگەری بەدوور دەگرت، چونکە بەبروای ئەوان ئەم جۆرە کارانە مرۆڤ تووشی فێڵ و درۆ دەکات، لە بەر ئەوە بە زۆری خۆیان بە کاری جووتیاری و ئاژەڵداری یەوە خەریك دەکرد.

خواردەمەنی ئیزدیەکان لەگەڵ خواردەمەنی هاوزمانەکانیان لە کوردانی موسلمان یان مەسیحی، جیاوازیەکی وەهای نیە، تەنها ئەوان بایەخ بە ژیانی خواپەرستانە (زاهدانە) دەدەن.[٣٧٦]

لە کۆنەوە ژیانی خواپەرستانە لە لای ئاریەکان بووە و کەسانی وەکو "مەزدەك" خەڵکی بۆ ئەو ژیانە هانداوە.[٣٧٧] ئیزدیەکان (کاهو، کەلەرم و قەرنابیت) بە پیس دەزانن و نایخۆن، چونکە بە زۆری بە ئاوی زێراب، ئاو دەدرێت.

ئێزدیەکان گۆشت کەم دەخۆن، مەگەر لە بۆنەو جەژنە تایبەتیەکانیاندا بیخۆن، گۆشتی بەراز ناخۆن و زۆر بە حەرامی دەزانن، گۆشتی ماسی لە بەر رێزی یۆنان پێغەمبەر (رەنگە یونس پێغەمبەربێت) ناخۆن، هەروەها پارێز لە گۆشتی (ئاسك) دەکەن چونکە پەیوەست بە پێغەمبەرێکی خۆیانی دەزانن، شێخەکانیشیان وەکو رێزێك بۆ (مەلەکە تاوس)، گۆشتی (کەڵەشێر) ناخۆن.[٣٧٨]

---

٣٧٦- اليزيديون، ل١٢٦-١٢٧

٣٧٧- عقايد مزدك، ل٧١

٣٧٨- اليزيديون، ل١٢٨

شایەنی باسە هێشتا لە شاری (خۆی) ڕێز لە کەڵەشێری سپی دەگرن، خاوەنی پەرتوکی مێژووی (خۆی)، گریمانەی ئەوەی داناوە، ئەم نەریتە لە دنبەلیەکانەوە مابێتەوە.[379]

خواردنەوەی بادە لە ڕووی ئاینی ئێزدیەوە لە شوێنە پیرۆزەکاندا وەکو (گەلی لالش) حەرامە و کەس ناخواتەوە بەڵام لە بۆنەی هاوسەرگیریدا دەیخۆنەوە.

لە (دبستان مذاهب) دا لە بارەی خواردنەوەی بادە لە لای پاشاکانی ئێران، دەڵێت: ((شاهێنشاه شەرابی هۆشبەر ناخواتەوە))، هەروەها هاتووە: ئەگەر کەسێك بتوانێت دەردێکی پاشا بە بێ بادە چارەسەر بکات، با لە نۆشینی هەر بادەیەك خۆی بپارێزێت.[380]

بەبروای ئێزدیەکان، پۆشاکی سپی تایبەتە بە خەڵکی بەهەشت، لەبەرئەوە بایەخێکی زۆر بەرەنگی سپی دەدەن، پیاوانی ئێزدی کراسی سپی، ئێخەکەی بەشێوەی بازنەییە و شەرواڵێکی سپی لەبەردەکەن و کڵاوێکی لبادی گۆمەزی لەسەر دەکەن، بەڵام مەزنانی وەکو میر و شێخەکان، بەرگی ڕەش دەپۆشن[381]. کەسێك کە "ڕابەری سەماع" دەکات لەکاتی "سەماع"دا سەرتاپا ڕەش دەپۆشێت.

ڤاسیلی نیکیتین، بەرگی دەروێشانی ئاسیای پچوك لەگەڵ بەرگی ئێزدیان بێپەیوەند نازانێت، بەتایبەتی شێوە و ڕەنگی کڵاوەکە[382]، هەر کەسێکیش ببێت بە "فەقیر" دەبێت بەردەوام لەسەر جلەکانیەوە "خەرقەی ڕەش" بپۆشێت و داینەکەنێتەوە.

پۆشاکی ژنانی ئێزدی لە کراسێکی ئاودامێنی سپی و شەرواڵێکی سپی کە لەژێر کراسەکەوە لە پێیدەکەن و پەچەیەکی سپی و سەرو بەستێکی سپی پێکدێت. ئێزدیەکان

---

٣٧٩- ریاحی، محمد امین، تأریخ خوی ل١١٤

٣٨٠- دبستان مذاهب ل٥٧

٣٨١- الیزدیون، ل١٢٦

٣٨٢- کردو کردستان، ل٤٨٩

ژن و پیاویان بەرگی شین ناپۆشن[٣٨٣]، لەوانەیە ئەم نەریتەیان دوای بڵاوبوونـەوەی بـڕوای هەندێك لە "متصوف"ەکان، دەربارەی "ئبلیس" لەناو ئیزدیەکاندا پەیدابووبێت، ئـەوان لە دەربڕینی ئەو ناوانەی کە بـەپیتی "ش" دەسـتپێدەکەن وەکـو ووشـەی شـین، شـەو خۆیـان دەپـارێزن، چـونکە گـۆکردنی ئـەم جـۆرە ووشـانە "شـەیتان"یان لێـدوور دەخاتەوە[٣٨٤]، ووشەی شین لە زمانی کوردیدا، رەنگی "شین" دەگرێتەوە، بـەڵام جـۆرج حبیب لەو بروایەدایە ئـەوان وەکـو صـابیئیەکان بـەهۆی ئـەو سـتەمەی کەمانەویـە شـین پۆشەکان بەسەریان هێنان، خۆیان لە پۆشینی پۆشاکی شین بەدوور دەگرن.[٣٨٥]

## پشتوێن بەستن (گەستی بەستن)

ئیزدیەکان کە لە خەو هەڵدەستن پشتوێن(شوتك)ی خۆیان دەبەستن و لە خوداوەندی مەزن دەپارێنەوە: (چاکە، خێر(بەرەکەت)، بەزەیی، ئایین، هۆش، باوەر، زمان پاراوی و هەست و پێزانینی) یـان بـداتێ، ئـەم داخوازیانـە یـان پارانـەوەی نـاوبراو بـە پارانـەوەی پشتگریدانی(گەستی بەستن)ی بەرەو رووی یەزدانی مەزن ناو دەبرێت.

| | |
|---|---|
| یارەی مەهدەرەکی ژتە دخوازین | خودایە میهرەبانیەك لەتۆ دەخوازین |
| مەهدرەکا خێرێ | میهرەبانیەکی چاك |
| ئێك کەرامەت، ئێك شفقەت، ئێك زار، | یەك کەرامەت، یەك بەزەیی، یەك زمان، |
| ئێك زمان، ئێك دین، ئێك ایمان، | یەك زمان یەك ئاین، یەك بروا |
| ئێك ئەقل، ئێك فام | یەك ئەقڵ و یەك فام |

---

٣٨٣- اليزيديون، ل١٢٦

٣٨٤- القس اسحاق، قصته ديانه الداسنيه أى اليزيديه، ملحق كتاب اليزيديه، جورج حبيب، ل١٠٩

٣٨٥- اليزيديه، ل٦٠

| | |
|---|---|
| یارەبی تو ئاقل و فامی سەری من بکی | خودایە تۆ ئەقل و تێگەیشتن بەمن ببەخشە |
| تو پرسیارەکە خێرێ ل حالێ مەوڤی ملەتی بکەی | تۆ پرسیارێ لە حاڵی ئێمە و ئەم میلەتە بکە |
| یا ربی تو بدەیە خاترا دەلیل خلیل | خودایە بۆ خاتری دەلیل، خەلیل |
| ئەلایا دلیل | ئاڵای دەلیل |
| اخر زمان | کۆتایی دنیا |
| حسنێ زر بابا و خاس و قەلەندەرا | چاکی زر بابان و چاکان و باوەرداران |
| و سۆرا مۆخفی پێ پرا صەلاتێ | وە ئەو رازەی لای پردی سیراتێ |
| ذکرا دەندل رەحمان | یادی دەندل رەحمان |

شایەنی باسە هەر لە دێر زەمانەوە بۆنەی پشتوێن بەستن (جەژنی گەستی بەستن) لەنێو گەلانی ئاری نەژاددا بەرپادەکرێت و بۆ سەردەمی بەر لە (زەردەشت) دەگەرێتەوە. ببووە بەباو لەتەمەنی پانزەساڵیەوە دەبێت پیشتوێن ببەستن، چونکە ئەو دەستپێکی لاویە، ئەم نەریتە لەنێو هیندیەکانیشدا برەوی بووە و هێشتا کاریگەری ماوە، لەنێو ئیزدیەکاندا پشتوێنی روحانیان بە یەکێك لە شتە پیرۆزەکان دادەنرێت.

## جەژنی ئیزدیەکان:

**جەژنەکانی سەری ساڵ:** ئەم جەژنە لەیەکەم چوارشەممەی مانگی نیسانی رۆژهەڵاتیدا بەرپا دەکرێت و لەیەکەم رۆژی مانگی نیسانی سەرەتای ساڵ دەستپێدەکات.[٣٨٦]

ئەم جەژنە نزیکە لە کاتی جەژنی بابلیەکانەوە، کە بەشانازی خودای "مەردۆك" جەژنیان دەگێرا، گوایە هەموو خوداکان بە سەرۆکایەتی "مەردۆك" لە پەرستگای "ئەساگیلا"ی بابل کۆدەبونەوە و سەرئەنجامی ساڵی ئایندەیان رێك دەخست[٣٨٧]. بەپێی

---

٣٨٦- الیزیدیون، ل١٠٦

٣٨٧- کریستین سن، تحسین انسان و تحسین شهریار، ترجمه و تحقیق احمد تفضلی و ژاله آموزگار، بەرگی٢، ل٤٧٣

ئەوەی نوسراوی "القس اسحاق" کە لە کریستین سین وەرگیراوە[٣٨٨]، دەڵێت:ئیزدیانیش بروایەکی وەهایان هەیە کە لەو ڕۆژەدا خوداوەند لەسەر تەختی خۆی دادەنیشێت و فەرمان دەکات کە تەواوی مەزنانی (تیرەکان و کاهنەکان) لەدەرباری ئەواندا ئامادە دەبن، دەفەرموێت: ((دۆستانم، خۆشەویستانم گوێبگرن، من دەمەوێت خێر و بەرەکەت بەسەر زەویدا بڕێژم.))، بەم بڕیارەی خوداوەند هەموو ئامادەبووان خۆشحال دەبن.

ئینجا زەوی ئەوەی لەسەر ڕووی زەویە، بە بەرزکردنەوەیەکی ئاشکرا بۆ یەکێك لە ئامادەبوان دەردەچێت، نوسراوێکی بۆ دەنوسێت و بەدەستی پیرۆزیان بۆی واژۆدەکات، ئامادەبوانیش وەکو ئاگادار واژۆی دەکەن و خەڵکەکە دەرۆنەوە، ئینجا خوداوەند بەبراوەی بەرزکردنەوەکە دەفەرموێت: (( ها ئەوە من زەوی و ئەوەی لەسەر ڕووی زەویە بۆماوەی ساڵێکی ڕێك بەتۆ دەسپێرم، خۆت سەرپشکی چی دەکەیت؟)).

کرێگرتەی زەوی بەچواردەوری دنیادا دەروانێت دەبینێت، مرۆڤەکان لەوباشی و کردارانەی خوداوەند داخوازی کردووە بەدوورن، پێیان دەڵێت: ((خوداوەند بەو نوێژ و ڕۆژو تەلاوەتەی کە مەسیحی و کەلیمی و موسلمانەکان ئەنجامی دەدەن خۆشنود نابێت، بەڵکو خوداوەندی گەورە و میهرەبان کاری باش و خەسڵەتە چاکەکانی دەوێت.))[٣٨٩]، کریستن سن لەزمانی (بروکلمات)ەوە دەڵێت: نەك تەنها پوختەی داستانەکانی جەژنی سەری ساڵ لەگەڵ پوختەی زگموکی بابلی یەکسانە، تەنانەت ئیزدیکان بۆ شادی گیانی مردوەکانیان لەم ڕۆژەدا قوربانیش دەکەن.[٣٩٠]

ئەگەر ئەوەی کەشیش ئیسحاق دەیڵێت، ڕاست بێت: "ئەخشو برش"ی پاشای بابلی لە پەیرەوانی ئاینی ئیزدی بووبێت[٣٩١]، ئەوا نزیکی ئەم جەژنەی ئیزدیەکان و زگموکی بابلیەکان جێگەی سەر سورمان نابێت، ئەوەی کە ئەم لێکچوونەش بەهێز دەکات پیرۆزی

٣٨٨- هەمان سەرچاوەل٤٧٣-٤٧٤

٣٨٩- قصه الديانه الداسنيه، ل٨٦

٣٩٠- نخستین انسان و نخستین شهریار، ل٤٥٤

٣٩١- قصة الديانة اليزيدية، ل١٠٨

چوارشەممەی لای ئێزدیەکانە، ڕۆژی چوارشەممە ڕۆژی یەکێك لەخودایانی "بابلی"یە کەناوی "نابو"ە و پەرستگاکەی بە "ئێزیدا" ناوی ڕۆشتوە"[392].

ئایا ئەم "نابو"یە نوێنەری هەموو خواکانی, ئارییەکانی بابل نەبوو؟

کریستن سن بەنەختێ دوودڵیەوە نوسیویەتی: دەکرێت ئەم دیدەی بابلیەکان و ئێزدیەکان دەربارەی کۆبوونەوەی خوداکان لەگەڵ کۆبوونەوەی خوداکان بەسەرۆکایەتی "ئەهورا مەزدا" و ئامادەبوونی "جەمشید" بەراورد بکرێت.[393] شایەنی باسە یەکێك لە دیرۆکناسان، پسپۆری بواری پاشماوەی کۆن و زمانە کۆنەکانی سۆمەری، بابلی و ئاشوری، ئاشکرای کردووە کە ووشەی ئێزدی لە نوسراوەکانی سەردەمی سۆمەریەکاندا هاتووە و بەمانای گیانی پیرۆز یان کەسێك کەلەسەر ڕێگەی ڕاستە، دێت.

وا دێتە بەرچاو پەیوەندی نێوان ئەوشتانە ڕاست بێت، چونکە لەو ڕۆژەدا (نەورۆز) جەمشید لەسەر تەختێك دانیشت و دێوەکان ئەویان لە "دەماوەند"ەوە بۆ "بابل" برد، خەلکەکە لەسەر سورماندا جەژنیان گێرا، لە هەمان ڕۆژدا بۆ "ئازەربایجان" ڕۆشت، لەوانەیە یەکێك لە کۆنترین پەرستگاکانی ئێزدیەکان لە ئازەربایجان بێت.

پەرستگای "ئازەر گشتەسەپ" هەمیشە ڕێزو پیرۆزیەکی زۆری هەبووە، پاشاکانی ئێران کەتاجیان لەسەردەنا، دەبوو لە "تیسەفون"ەوە بەپێ بۆ ئەو پەرستگایە بچونایە.ئایا خەڵکی پەیرەوی نەریتەکانی جەمشیدیان نەدەکرد؟ ئەو ئەم بۆنانەی داناوە و پاشاکانی دوای خۆشی پەیرەویان دەکرد.

خاوەنی دبستان مذاهب نوسیوەتی: جەمشید بەڕێنمای خوداوەند، پەیکەری ئاسمانی بە بنمیچی کۆشکەکەیەوە نابوو.

معین لەسەر قسەی مسعودی، دەنوسێت: پاشماوەیەکی سەیر لە نەخشە جیاجاکانی پەرستگای "ئازەر گوشتنەسەپ"دا هەیە، تەنە ئاسمانیەکان و ئەستێرەکان و.... نیشان دەدات[394]، لەشەوی سەریساڵدا، کچان گەورە و پچوك، جوانترین پۆشاك دەپۆشن و

---

٣٩٢- اليزيدية، ل١٨

٣٩٣- مزديسنا، ل٢٠٥

٣٩٤- نخستين انسان و نخستين شهريار، ل٤٧٤.

بەخشڵەکانیان خۆیان دەڕازێننەوە و بەیانی زوو بە دەشت و کێودا بڵاودەبنەوە، گوڵاڵە دەهێننەوە و لەگەڵ گوڵی دیکە سەر دەرگا و دەروودیواری ماڵەکانیانی پێدەرازێننەوە و توێکڵی رەنگکراوی هێلکەش بۆ ئەم کارە بەکاردەهێنن، لەو بڕوایەدان بەم کارەیان کارئاسانی بۆفریشتەکان دەکەن تا ماڵی ئێزدیەکان لەماڵی پەیرەوانی ئاینەکانی دیکە جیابێتەوە .

یەکێك لە یاریە زۆر بەربڵاوەکانی ئەم جەژنە، یاریکردنە بە هێلکەی کوڵاوی ڕەنگکراو. لەم رۆژەدا سەردانی هەر ماڵە ئێزدیەك بکەیت، دەفرێکی پڕ لە هێلکەی کوڵاو دەهێنێت و یاریت لەگەڵ دەکات، یاریەکەش زۆر سادەیە، هێلکەکان لەسەر زەوی دادەنێن و هێلکەیەك بەدەستەوە دەگرێت و نیشانە لە هێکەیەك دەگرن هەرچی شکاند بۆخۆی دەبێت[395]، وەکو ئەرکێك هەر ماڵەو بەپێی توانا گا، مەر، یان مریشکێك سەردەبڕن و باشترین جۆری خواردن ئامادەدەکەن و لەم جەژنەدا بەسەر هەژاران و ڕێبواراندا دابەشی دەکەن. هەندێك لەژنان سەردانی گۆرستان دەکەن و قەواڵەکانیش بە نەیژەنین و ئاوازی پرسۆزەوە لەگەڵیان دەچن، بۆ ئەوەی خودای گەورە بەزەیی بەگیانی مردووەکاندا بێتەوە، خواردن لەسەر گۆڕەکان بەجێدەهێڵن.[396]

ئێزدیەکان لەمانگی "نیسان"دا هاوسەرگیری ناکەن، چونکە ئەوان بڕوایان وایە لەم مانگەدا فریشتەکان و پێغەمبەران هاوسەرگیری دەکەن.

ئەوان لەم مانگەدا زەویش ناکێڵن چونکە لەو بڕوایەدان لەم مانگەدا زەوی دووگیانە و بەبریندارکردنی زیانی پێدەگات.[397]

ئەم جەژنە درێژەی دەبێت و هەتا چەند رۆژ کۆتایی نایەت، یەکسەر دوای جەژن تەوافی ئێزدیان دەستپێدەکات (لەبەشی خوداپەرستیدا لێیدواین).

---

٣٩٥- الیزیدیون، ل١٠٦

٣٩٦- الیزیدیون، ل١٠٧

٣٩٧- گۆڤاری مەتین، ژمارە٧، ساڵی١٩٩٢، ل٣١

## جەژنی چلەی هاوین:

ئەم جەژنە چەند ناوێکی هەیە، لەوانە جەژنی شێخادی، جەژنی مەزن و جەژنی چلەی هاوین. لەناوەراستی هاویندا بۆماوەی چەند رۆژێك دەخایەنێت.[398]

بێگومان بەر لەهاتنی "ئاینی ئیسلام" ئەم جەژنە لەنێو ئێزدیەکاندا هەر هەبووە، لەبەر ئەوە ناونانی بەناوی "شێخادی"وە شتێکی نوێیە، لەوانەیە لە رۆژگاری "شیخ حسن"دا ئەم ناوەی لێنرابێت.

دەبێت ئەم جەژنە پەیوەندی بە هەڵگرتنەوەی بەرهەمەوە هەبێت.

ئێرانیەکان لەوەرزی هاویندا جەژنی جۆراوجۆریان هەبووە، جەژنی نیلوفەر، جەژنی تیرگانی بچوك، جەژنی تیرگانی مەزن و ئەمرداد لەو جەژنانەی هاوینن[399]. الحسنی نوسیویەتی: لەجەژنی چلەی هاویندا (کوچەکەکان) و هەندێك لە رابەرانی ئاینی ئێزدی بۆسەر مەزاری شێخادی دەچن و لەوێ سێ رۆژ بە رۆژو دەبن، ئینجا بەرەو ماڵ دێنەوە بۆ ئەوەی چل رۆژ تەواو بکەن، چونکە لەو بروایەدان شێخادی چل رۆژی هاوین و چل رۆژی زستان رۆژوی گرتووە، بەڵام ئەمان کەمتر ئەم چل رۆژە تەواو دەکەن چونکە بەیانی رۆژی گەرانەوەیان ئەگەر کەسێکیان خواردنێکی بۆ هێنان دەبێت یەکسەر بیخۆن چونکە ئیتر فەرزیساڵەکەیان لەسەر لادەچێت.

کریستن سن نوسیویەتی: ئێزدیان پتر لە رۆژو بایەخ بەکاری باش و چاکە دەدەن[400]، رەنگە هەر لەبەر ئەمش بێت رۆژوەکەیان دەشکێنن، کوچەکەکان کەبە رۆژو دەبن پێش کۆتایی هاتنی ماوەکەیان بۆ مەزارگەی شێخادی دەچنەوە و سێ رۆژی کۆتایی چل رۆژەکە لە مەزارگەی شێخادی بەرۆژو دەبن ئینجا بە دڵخۆشی بۆ گوندەکانی خۆیان دەگەرێنەوە و خەڵکی گوندی باحزانی دوای رۆشتنی کۆچەکەکان مەزارگەکە خاوێن دەکەنەوە.

---

٣٩٨- اليزيديون، ل١٠٨

٣٩٩- تمدن و فرهنگ ایران، ل١١٦-١١٧

٤٠٠- الحسنی، ل١٠٨

**جەژنی قوربان:** لەناوی جەژنەکەوە دیارە هەمان جەژنی قوربانی موسڵمانانە کە لە دەیەمی "ذی الحجة"ی کۆچیدا، بۆنەکەی لەشاری "مەکە" ئەنجام دەدرێت و ئەو موسڵمانانەی کە توانای بەشداریان نیە لە شوێنی خۆیانەوە جەژن دەگێڕن، ئیزدیەکان باوەریان بە گشت پێغەمبەران و بەزۆریش بە"حەزرەتی ئیبراهیم و اسماعیلی کوری" باوەری تەواویان هەیەو بابەتی قوربانیکردنی حەزرەتی اسماعیل کەلە ئاینەکانی دیکەدا هاتووە، لەلای ئیزدیانیش لەقەولێکی تایبەتیدا بەناوی قەولی اسماعیل پێغەمبەر هاتووە.

ئیزدیەکان لە هەمان رۆژی جەژنی قوربانی موسلمانانەدا لەباتی مەکە لە مەزارگەی شێخادی لە "لالش" جەژنی خۆیان دەگێرن و بە پارانەوە و لالآنەوەوە خەریك دەبن هەتا خوداوەند حەجی ئەوان وەربگرێت و بیان بەخشێت.دوای تێپەرینی یەکەم رۆژی جەژن، بەشادی و بەسرودووتنەوەی هۆنراوە و بەیتەکانی خۆیان خەریك دەبن و سینیەکی پر لە (لەواشە) بە (بابی چاویش) دەدەن، بابا چاویش لەگەڵ بەشدارانی جەژن دەچنە سەر ئەو چیایەی بەسەر "گەلی لالش"دا دەروانێت و بە"کێوی عەرەفات" بەناوبانگە.

بابی چاویش لەسەر لوتکەی کێوەکە لەسەر بەردێك دەوەستێت و نان بۆ گەلیەکە هەڵدەدات، بەشداربوان هەوڵدەدەن، هەر کەسەو خواخوایەتی پارچەیەك لەو نانەی بەرکەوێت و بەناوی کانیا سپیەوە کە ١٥ خولەك لەوێوە دوورە بیخوات، هەر کەسێك ئەمەی دەستکەوێت حەجی وەرگیراوە، ئەو کەسەی یەکەم کەس بەکانیا سپی بگات، میر خەڵاتی دەکات، لەبەرئەوەی ژمارەی بەشداران زۆرن، پیرێك لەلای میری ئیزدیانەوە لەسەر کانیا سپی دەوەستێت، هەرکەسێك زوو بگات بۆ ئەوەی دیاربێت کڵاوێکی دەداتێ لەسەری بکات.

دووبارە هەموو بە خۆشی و شادیەوە سەرگەرم دەبنەوە، لەدوارۆژی جەژنی قورباندا بۆنەی سەردانکردنی یەکترو تەوقەکردن دەستپێدەکات ئینجا بەرەو ماڵ دەگەرێنەوە.[٤٠١]

---

٤٠١ - اليزيديون، ل١٠٨-١٠٩

الحسنی نوسیویەتی: ئەم جەژنە لاسایکردنەوەی موسڵمانانە و بنـەمای بـاوەری نیـە بەڵام ئەم ووتەیە بەراست نازانرێت چونکە لە مێژووی ئیزدیاندا باسمـانکرد کـە (حـەلاج) بەپەیرەوانی خۆی ووتـوە (هـەر کەسـێك نـەتوانێت بـۆ حـەج بچێت بـا لەشـوێنی خـۆی ئەنجامی بدات.)، بۆیە بنەچەی ئەم باوەری ئیزدیان بۆحەج و قوربـانی کـردن لەوەوەیـە کە حەزرەتی ئیبراهیم لەو رۆژەدا وویستویەتی کورەکەی خۆی بە قوربـانی بکـات، بۆیـە بنەمای ئاینی هەیە و برواشیان بەوە هەیە، بۆ باشـتر روونکردنـەوەی ئـەم بابەتـە چـەند سەبقێك لە قەولی ئیسماعیل پێغەمبەر دەنوسین:

| | |
|---|---|
| سلاڤ بکەن لە جەبێرە | سڵاو بکەن لە جەبارە |
| ویل نەبێ ید ئەهل خێرە | وەلەو پێغەمبەرە ئەهلی خێرە |
| بابێ نەبیان وگیان خووندنا وانە ژدێرە | بابێ پێغەمبەران و گیان |
| | خوێندنیانیان لەدێرە(کلن) |
| سلاڤ بکەن لە صەمەدە | سڵاو بکەن لەو بێنیازە |
| ویل نەبێ ید ئەهلل کەرامەتە | وەلەو پێغەمبەرە ئەهلی کەرامەتە |
| بابێ ب قوربانا خودی کریوو وەلەدە | بابێ کوری بۆخودا کردە قوربانی |
| سمایلی تەقالە | سمایلی منداڵە |
| ژ دەشتێ دهاتە ماڵی | لەدەشتێ دێتەوە ماڵە |
| بابێ خەمەکە گرانە ل بالە | بابی خەمێکی گرانی لە باڵە |
| بابۆ خەما هلمەکر | بابە خەم هەڵمەگرە |
| دەست و پێ من خەنا برێژ[402] | دەست و پێی من لە خەنە بگرە |
| من قوربانیا خودێ بکوژ | من بەقوربانی خودا بکە |

٤٠٢ - گوندیاتی، ل١٠٣-١٠٤

## جەژنی ئیزەد:

الحسنی ئەم جەژنەی بە جەژنی "یەزید" ناوبردووە[403]، لەکاتێکدا ئیزدیەکان خۆیان جەژنی ئیزی "ئیزەد"ی پێدەڵێن.

شاکر فەتاح ئەم جەژنەی بەجەژنی "رۆژو" ناوبردووە[404]. هەمان شێوە کە لەبابەتی رۆژودا ووتمان لەسەر هەر ئێزدیەك پێویستە سێ رۆژ بە رۆژو بێت، ئەم سێ رۆژەش لە چلەی زستاندا دەگرن، رۆژی چوارەم جەژن دەگێرن و سەردانی یەکتر دەکەن و بە هەڵپەرکێ و خۆشی بەسەری دەبەن و خۆراك و نانی بەناوبانگی (صەوك) ئامادە دەکەن و لەگەل خۆیان بۆ گۆرستانی دەبەن، الحسنی نوسیویەتی لەم جەژنەدا بادە زۆر دەخۆنەوە[405].

## جەژنی بلندی:

بۆنەی ئەم جەژنە بیست و پێنج رۆژ دوای جەژنی "ئیزەد" دەگێررێت[406]. الحسنی نوسیویەتی: ئەم جەژنە بەبۆنەی ساڵرۆژی لەدایکبونی "عودەی کوری مسافر"ەوە دەگێرێت، شاکر فەتاح نوسیویەتی: گێرانی ئەم جەژنە بەبۆنەی لەدایکبوونی "یەزید"ەوەیە[407]. بەڵام بە سەرنجدان لەناوی جەژنەکە و بۆنە تایبەتەکەوە کە بریتیە لە کردنەوەی ئاگرو چەند جار سورانەوە بەدەوری ئاگرەکەدا و دەست دانان لەسەر ئاگرەکە و هێنانی بە ناوچەواندا کە بە پیرۆزی دەزانن[408]، دوورە لەوەی پەیوەندی بەشێخ عودەی یان یەزیدەوە هەبێت.

---

٤٠٣- اليزيديون، ل١١٤

٤٠٤- ئیزدیەکان، ل٦٥

٤٠٥- اليزيديون، ل١١٤

٤٠٦- اليزيديون، ل١١٥

٤٠٧- ئیزدیەکان، ل٦٥

٤٠٨- اليزيديون، ل١١٥

شایەنی باسە ئاریەکان لەڕۆژانی جەژندا ئاگریان کردۆتەوە، ئەوان باوەڕیان وابوە کە فروهـەر(گیانی بـاوەڕداران) لەجێگـەی خۆیانــەوە دێـن و مـاوەی دەرۆژ لـەلای خـەڵك دەمێننەوە، واتە ئەمە جەژنی تایبەتی مردوەکانە[٤٠٩] و دوورنیە ئەم جەژنە هەمان جەژنی بڵندی ئێزدیەکان بێت چونکە فروهەری باوەڕداران لـە جیهـانی مەلەکوتـدان و لەجێگـەی بڵندەوە بۆسەر رووی زەوی دادەبەزن.

ئەم جەژنەی ئێزدیەکان کـە ئـاگر دەکەنـەوە و دانەوێڵەی تایبـەتی تێدەکـەن لەگـەڵ بابەتی فرۆهەری باوەڕداری کوندا بێپەیوەندی نیە.

شـایەنی بیرهێنانەوەیـە هەنـدێك لـە ئێرانیـەکان تاسـەردەمی "بیرۆنـی"یش پێنجـەی دزراویان لەنێوان مانگی (٨ و٩)دا داناوە.[٤١٠]

شایەنی باسە ئێرانیەکان لەسەردەمی "داریـۆش"دا، سـاڵنامەی (میصـری)یان قبـوڵ کرد، کە بەپێی ئـەو سـاڵنامەیە سـاڵ بـە دوانـزە مـانگی سـی رۆژی و پێـنج رۆژی سـەر دەخرا دابەش ببوو، لە خۆشبوونی وەرزی بەهارەوە دەست پێدەکات و ئەم سـاڵە بـووە بەساڵی زەردەشتی.[٤١١]

**جەژنی ناوك:**

دوانزە رۆژ دوای جەژنی بڵندی، ئێزدیەکان جەژنێکی دیکـەیان هەیـە، بـەپێی ئـەوەی الحسنی و شاکر فەتاح نوسیویانە لەو رۆژەدا ئێزدیەکان نانێکی گەورە ئامـادە دەکـەن و دەنکێکـی دیـار یـان ناوکـە خورمـا و .... تێدەکـەن و لەسـەر پشـتی منـداڵێکی خۆیـان دایدەنێن.دوای دووڕۆژ داوا لـە ئەنـدامێکی خێزانەکـەی خۆیـان دەکـەن کەلـەکاتی نـان دروسـتکردنەکەدا ئامـادە نـەبووە بەسـەر ئەنـدامانی خێزانەکـەدا دابەشـی بکـات، هـەر کامێکییان ئەو بەشەی بەربکەوێت کە ناوکەکەی تێدایە ئەو ساڵە خۆش بەخت دەبێـت و لـەمیری ئێزدیانـەوە خـەڵات وەردەگرێـت. الحسـنی ئـەم جەژنـە بـە "جـەژنی نـاوك" ناودەبات.[٤١٢]

---

٤٠٩- نخستین انسان و نخستین شهریار، ل٤٧٩

٤١٠- نخستین انسان و نخستین شهریار، ل٤٧٩

٤١١- نخستین انسان و نخستین شهریار، ل٤٧٧

٤١٢- ر.ك جشن جمایی

## جەژنی چلەی زستان:

دوای پانزە رۆژ لەدوای "جەژنی ناوك"، جەژنی چلەی زستان دێت، لەم جەژنەدا بۆنەیەکی هاوچەشنی جەژنی "چلەی هاوین" دەگێڕرێت.

الحسنی نوسیویەتی: ئێزدیەکان باوەریان وایە کە "شێخ عودەی"، چل کەسی لە پیاوانی کار درووستی بۆلای خۆی بانگکردووە بناغەی ئاینی ئێزدی فێرکردون و نهێنیەکانی بۆ شیکردونەتەوە.[413]

## جەژنی خدر ئەلیاس (خضر الیاس):

بۆنەی ئەم جەژنە لەیەکەم پێنج شەممەی مانگی "شوبات"ی رۆژهەڵاتیدا دەگێڕرێت، هەندێك لە ئێزدیەکان سێ رۆژ پێش ئەو رێکەوتە بەرۆژو دەبن و هەندێکی دیکەیان رۆژێك پێش ئەو جەژنە رۆژو دەگرن، بەڵام ئەو کەسەی "ئەلیاس"ی ناوبێت، دەبێت سێ رۆژ بە رۆژو بێت.

ئێزدیەکانی "شەنگاڵ" لەم جەژنەدا گەنمی برژاو "برێشکە" وورد دەکەن و لەگەڵ شەکریان دۆشاوی خورما تێکەڵی دەکەن و بە دۆستان و خزمانی خۆیانی دەدەن [414].

الحسنی نوسیویەتی: مەسیحەکانیش جەژنی هاوزەمانی ئەم جەژنەی ئێزدیانیان هەیە و جەژنی "ماربەهمانی" پێدەڵێن، ئەوانیش سێ رۆژ پێش جەژنەکە بەرۆژو دەبن.[415] شایەنی باسە تاچەند سەدە دوای ئیسلامیش لەنێو ئێرانیەکاندا جەژنێك بەناوی "بەهمەن گان" هەبوو، ئەم جەژنەیان لەلا پیرۆز بوو، جەژنی بەربەنداو، کانی و جۆگەکانیش لەمانگی تشرینی دووهەمدا دەگێررا.

---

٤١٣- الیزیدیون، ل١٦

٤١٤- الیزیدیون، ل١١٥

٤١٥- فرهنگ و تمدن أیران ل١٢٢-١٢٣

**جەژنی ئەحیا:**

شەوی نیووەی "شەعبان" لەلای ئیزدیەکان پڕ پیت و بەرەکەتە و ئەو شەوە هەتا بەیانی ناخەون، ئەو شەوە "لیلە القدر"ی پێدەلێن، بە پێچەوانەی موسڵمانانەوە کە "لیله القدر"یان لە رەمەزاندایە.[416]

ئەوانەی راڤەی قورئانیشیان کردووە دەربارەی "لیلە"[417](٢) رای جیاوازیان هەیە، هەندێك دەڵێن مەبەستی خوداوەند "لیله القدر"ە کەلە مانگی رەمەزاندایە و هەندێکی دیکەیان گوتیان: مەبەستی شەوی نیووەی "شەعبان"ە[418]، لەبەرئەوە شەوی نیووەی (شەعبان) لەلای موسڵمانانیش پایەیەکی تایبەتی هەیە چونکە لە دایکبونی "مەهدی" لەو شەوەدایە.شاکر فەتاح نوسیویەتی: لەو شەوەدا مەزنانی ئیزدی لە مەزارگەی شێخادی کۆدەبنەوە و بە پێشنوێژی شێخێکی ئادانی هەتا بەیانی خەریکی نوێژکردن دەبن، پێش نوێژ سەدجار "سورەتی اخلاص"یان بۆ دەخوێنێت، تەنها جارێك ناوچەوانیان لە زەوی دەدەن ئیتر دانانەونەوە، ئەم کارە شەش جار دووبارە دەبێتەوە ئینجا ئاو دەخۆنەوە و جارێکی دیکە ئەم کارە دەکەنەوە و هەتا رۆژهەڵدێت بەردەوام دەبن، نوێژی ئەم شەوەیان بە نوێژی ساڵێك دادەنێن.

خەڵکە گشتیەکەش ئەم شەوە بە پیرۆز دەزانن و ووردو درشتیان لە شوێنێك کۆدەبنەوە و قەواڵەکان سرودە ئاینیەکان دەخوێنن و دەربارەی ئافەرینی دنیا و کەرامات و مەزنانەوە دەدوێنن، کە رۆژ بوەوە خاوەن ماڵ، بەرچاییان بۆ دەهێنێت و دوای خواردن بلاوەی لێدەکەن.

لە شەنگاڵ نوێژ کردن ئەنجام نادرێت، تەنها لە شوێنێك کۆدەبنەوە و پەیکەری تاوس ئامادە دەکەن و نەی دەژەنن و سرودەکان دەخوێنن کە رۆژ بوەوە چۆڵی دەکەن.[419]

---

٤١٦- اليزيديون، ل١١٦

٤١٧- سورەتی دخان، ئایەتی ١-٦

٤١٨- طبري، محمد بن جرير، چاپی دووەم ١٩٧٢ بەرگی ٢٥ ل٦٤

٤١٩- یەزیدیەکان ل٧٢-٧٤

**جەژنی جەمایی:**

ئـەم جەژنـە حـەوت رۆژ درێـژەی دەبێـت، لـە شەشـەمی مـانگی "تشـرین" ەوە دەستپێدەکات و لە رۆژی سیانزەی هەمان مانگدا کۆتایی دێت، وەکو کات لەگەڵ جەژنی "میهرگان" دا نزیکن.

جەژنی جەمایی گرنگترین و مەزنترین جەژنی ئێزدیەکانە باوەریان وایە خوداوەند لـەم جەژنەدا لە بەندەکانی خۆی خۆش دەبێـت و سۆزی خـودا بـە سـەر زەویـدا دەبارێـت و چارەنوسی ساڵی ئایندە لەم رۆژانەدا رۆشن دەبێت.[420]

ئێزدیەکان بە پیاو و بە ژنەوە لە هەموو لایەکەوە بە باشترین پۆشاك و گرانبەهاترین خشڵ و زیریانەوە لە مەزاری شێخادی (جەرگەی ئـاینی ئێزدیـەکان) کۆدەبنـەوە، نابێـت خواردەمەنی زۆریش لەگەڵ خۆیان بهێنن چونکە خـواردن لـە لایـەن پـەردەدار و زێـوانی شوێنە پیرۆزەکانی "گەلی لالش" ەوە لە خێر و نەزرەکانی خەڵکەوە فەراهەم دەکرێـت، بۆ ئەمەش هەر یەکە و برێك پارە بە خزمەتچی بەرپرسی خـۆراك دەدەن ئەگـەر نەیـدەن زیارەتیان وەرناگیرێت و نا بەخشرێن، لە دوورەوە قاچیان رووتدەکەن و بۆ ناو حـەرەمی مەزار دەچن، قەدەغەیە لە گەلی لالشدا ئاژەڵ بکوژن یـان درەخـت ببرنـەوە یـان ئـازاری کەس بدرێت ئەگەر دوژمنیش بێت.

پیرۆزی ئەو شوێنە لە لای ئێزدیەکان لە ئاستی "مەکە" ی موسڵماناندایە.

کوچکەکان بۆ دابینکردنی سوتەمەنی رۆژی دووجار بە کێوکەدا هەڵدەگەرێن، کۆتەرە دار دەهێنن و خواردنی پێلێدەنرێت.

لـە حـەرەمی شـێخادیدا ژمـارەی زیارەتگاکـان و ژوورەکـان بـە ئەنـدازەی ژمـارەی پیاوچـاکانی ئێزدیـانن، مـیری ئێزدیـان کلیلـی ئـەو شـوێنە لـە بەرامبـەر برێـك پـارەی دیاریکراودا بـە یـەکێك لـە مـەزنانی ئێـزدی دەدات و ئـەویش دەرگایـان بـۆ دەکاتـەوە و موریدان و سەردانکەران زیارەتی خۆیان دەکەن.

---

٤٢٠- اليزيديون، ل١٠٩

گرنگترین بۆنەیەك کە لەم جەژنەدا ئەنجام دەدرێت بریتیە لە:

پەری سوارکردن، قەپاغ، دانانی تەختی شێخادی و خوانی چل میرا.

**پەری سوارکردن:**

زۆربەی ئەو کتێبانەی دەربارەی ئێزدیەکان نوسراون تەنها باسی بۆنەی رۆژی شەشەم و حەوتەمی ئەم جەژنەیان کردووە چونکە بۆنەی پێنج رۆژی یەکەمی جەژن بە گرنگ ئەژمار نەکراون بەلاّم رۆژی پێنجەم بۆنەیەکی قورسی تێدا دەگێرن، لەم رۆژەدا بە نۆرە حەوت پارچە قوماش هەر یەك لە رەنگێکی تایبەتی، بۆ کانیە سپی دەبرێت و پاش ئەوەی لە ئاوی ئەو سەرچاوەیە خاوێنی دەکەنەوە، نەیژەن لە لە پێشەوە و دەفژەن لە دوای ئەوەوە کەسێکیش کە پارچە قوماشەکانی بە سەروملیەوە ئاڵاندوە لە دوای دەفژەنەوە بەرەو مەزارگە دەرۆن، خەڵکەکە هەموویان بەرێزەوە دەوەستن و هەرکەس پارەی پتر پێشنیار بکات شانازی هەڵگرتنی یەکێك لە پارچە قوماشەکانی پێدەبرێت کە نیشانەی یەکێك لە فریشتەکانە و لە شوێنێکی تایبەتی ناومەزارگە دایدەنێت.

دوا پارچە پەیوەستە بە ئیزەد بانویەك کەناوی "ستیا"یە، دوای ئەوەی کە بەگۆرەپانی مەزارگە دەگات لە دەرگایەکی دیکەوە بۆناو مەزارگەی دەبەن. هەرکەس ئەم نیشانانە لەسەر شوێنی تایبەتی خۆی دابنێت لەلایەن میرەوە دیاریەك وەردەگرێت[٤٢١].

ئەم حەوت نیشانەیە سەرنجی نوسەری بۆ ئەو حەوت پەیکەرەی بەووتەی ئەفسەندیاری سپاسیان (ئیزدیەکان) لە پەرستگای خۆیاندا تاشیویانە و بەنوێنەری حەوت هەسارەکەی دادەنێن راکێشاوە:

١- پەیکەری شیت (-حەزرەت) کێوان لەبەردی رەش و لەشێوەی پیاوێکدایە کەسەری شێوە خرە.

---

٤٢١- خۆم لە لالش دیومە

٢- پەیکەری شیت هرمزد، رەنگی خاکیە لەشێوەی مرۆڤدایە، روخساری وەکو داڵەکەر خۆرەیەو تاجێکی بەسەرەوەیەو کڵاوێکی بەسەردا کراوە و روخساری کەڵەشێرو ماری هەیە.

٣- پەیکەری شیت بەهرام لە بەردی سورە و شێوەی پیاوێکی سوری هەیە، کڵاوێکی بەسەرەوەیە....

٤- پەیکەری شیت خۆر، لەهەموو پەیکەرەکان گەورەترە و لەشێوەی گومەزێکدایە کە لەخشتی زێر درووستکرابێت.

٥- شێوەی شیت ناهید لە شێوەی گومەزدایە، لەدەرەوە مەرمەڕی سپیە.

٦- گومەزی شیت تیر لەبەردی خۆلەمێشی و پەیکەری "عەتارد" دایە.

٧- گومەزی شیت مانگ بەرەنگی سەوز.....[٤٢٢] .

وامەزەنە دەکرێت ئەو پارچانە نیشانەی حەوت هەسارەکەبن بەڵام ئیزدیەکان لەترسی ئەوەی بە بتپەرستی تۆمەتباریان نەکەن، تەنها بەرەنگی ئەو پەیکەرانە وازیان هێناوە و لەهێمای دیکە سودیان وەرگرتووە، کەبریتیە لە تاشینی باڵندەیەك لەشێوەی "تاوس و مارێك" بەسەر دەرگای چوونە ژوورەوەی مەزاری "شێخادی"دا. ئەو مەزارگەیە چەند پارچەیەکی لێیە، تابلۆی "مار و تاوس"ەکەش سەرنجمان بۆ داستانی هەڵخەڵەتاندی (ئادەم و حەوا) کە بە (مار و تاوس) لەخشتەی بردن رادەکێشێت.[٤٢٣]

ئەوان بەم کارەیان خۆیان لەریزی ئەو خوداپەرستانە دادەنێن کە بەچاوی رێزەوە لە شەیتان دەروانن.[٤٢٤]

بەپێی ئەوەی ئەو پەیکەرانە لەلای ئاریەکان بەهایەکیان هەیە و لە جێگایەکدا بەناوی "شیدستان" دایدەنێن، لەبەرئەوە نابێت بەدووری بزانین کە پەرستگایەکی وەکو ئەوەی شیز (ئازەر گشنەسپ)ی ئازەربایجان، لەپێش بەهێزبوونی ئایینی زەردەشتیدا بوو‌بێت و

---

٤٢٢- دبستان مذاهب، ل١٥-١٦

٤٢٣- The Religion of the Yazidi، p.21

٤٢٤- ر.گ، باسی عودەی و باسی تاوس گێران.

لەم پەیکەرانە بێبەش بووبێت چونکە "جەمشید" کاتێ کە ئاینی سابیئیەکانی لەناوبرد و ئاینی نوێکردەوە لە"دەماوەند"ەوە بۆ "بابل" ڕۆشت بوو کەلە "بابل" کۆمەلگەی خوداکانی لێبوو، لەوێوە بۆ ئازاربایجان ڕۆشت[٤٢٥] و خودی خۆی لە کۆبوونەوەی خوداکاندا کەبە سەرۆکایەتی ئاهورامەزدا بەسترابوو ئامادەگی هەبوو.[٤٢٦]

ئەوەی لەبارەی ئەم پەرستگایەوە دەیلێن پشتیوانی ئەم ووتانە دەکەن. معین لە "مسعودی"ەوە باسدەکات: پاشماوەیەکی سەرنجراکێش لە خانوبەرەو نەخش و نیگاری شاری "شیز"دا هەیە کە تەنە ئەسمانییەکان و ئاژەڵ و سەیرو سەمەرەی دیکە نیشان دەدات.[٤٢٧]

کەیخوسرەو ئەسفەندیار دەڵێت: جەمشید پەیکەری ئاسمانی بە بنمیچی کۆشکەکەیەوە نابوو.[٤٢٨]

بەپێی ئەوانەی هەتا ئێستا ووتران، دەکرێت بڵێین: لە سەردەمی زۆر کۆندا شوێنی ئازەرگشنەسپ مەڵبەندی ئاینی ئێزدی بووە. بۆ بەهێزکردنی ئەم بیرۆکەیە بەڵگەی دیکەش، هەیە وەك:

١. محمد امین زەکی بەگ نوسیویەتی: شوێنی هۆزی موکری ((کە کوردن و لەباکورەوە بەشوێنی لە دایکبونی زەردەشت "ئازەر گشنەسپ" سنوردار دەکرێت و ئەم هۆزە هەر لەکۆنەوە لەم شوێنە نیشتەجێن.[٤٢٩]

٢. لە پەرتوکە کۆنەکاندا، شیز (ئازەر گشنەسپ)، بەنزیکی شارەزوور نوسراوە[٤٣٠].
جگە لەوەی دانیشتوانی شارەزوور کورد بوون، پەیرەوانی ئاینی "ئەهلی هەق"یش کە

---

٤٢٥- دبستان مذاهب، ل١٤

٤٢٦- فرهنگ و تمدن ایران، ل١٢-١٣

٤٢٧- نخستین انسان و نخستین شهریار ل٤٧٤

٤٢٨- مزدیسنا و تأثیران در ادبیات فارسی، ل٢٠٥

٤٢٩- دبستان مذاهب، ل١١٠

٤٣٠- کردو کردستان، ل٣٨٢

پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ "ئێزدیەکان"دا هەیە، هەمان باوەریان لەبارەی شارەزوورەوە هەیە کە ئێزدیەکان لەبارەی "لالش"ەوە هەیانە و دەڵێن "عەرشی رەحمان" لە شارەزوور دانراوە.[٤٣١]

**قەپاغ:** لە شەشەم رۆژی جەژنی "جمایی"دا چەند چەکداری ئێزدی تفەنگ بەدەست، بەسەر ئەو چیایەی کە بەسەر مەزاری "شێخادی"دا دەروانێت، لەوێ دەست بە تەقەکردن دەکەن ئینجا بەپەلە بۆ گۆرەپانی شێخادی دێنەوە و گایەك کە چل رۆژە لە مەزارگەدا پارێزراوە، بەرەو مەزاری شێخ شەمس پێشی دەدەن، لەپێش گاکەوە کابانێك دەروات دەفرێکی پێیە قانگی (ئەسفەند) تێدادەسوتێت، دوکەڵی لێهەڵدەستێ، لەدوای ئەویشەوە قەواڵێك نەیدەژەنێت، لەدوای ئەویشەوە قەواڵێکی دیکە دەف دەژنێت، پێش گاکە کەوتون، چەند کەسێکیش بەدار گاکە لێدەخورن، ئەم چەند کەسەی گاکە بۆ دەرەوە دەبەن بەراسپاردەی میر ئاگاداری لێدەکەن و دەبێت لەسێ تیرەی (ماموس، قائدیا و تورك)بن ئەوانەی نیازیانە گاکە بۆ مەزاری شێخ شەمس بفرێنن لەوان دەپارێنەوە کە پێویستە گاکە بۆ مەزاری شێخادی بگەرێتەوە، لەم کاتەدا لەنێو خەڵکەکەدا دووکەس بەنهێنی خۆیان بەگاکە دەگەیەنن و بەفێل دەیفرێنن، هاوار و قیژە و دەنگە دەنگ لە خەڵکەکە بەرزدەبێتەوە و چاو لەو دوانە دەپۆشن و گاکە دەبەن، خەڵك و پارێزگارانی گاکە بەرەو مەزاری شێخادی دەیگێرنەوە، لە سوکا مەعریفەت(بازاری مەعریفەت) کەتیرە ئێزدیەکان هەریەکەو لەجێگەی تایبەتی خۆیان وەستاون، دەکەس ئامادەیی خۆیان بۆ پاراستنی گاکە رادەگەیەنن بەڵام "میر" پێیان رادەگەیەنێت گاکەیان فراندووە بڵاوەی لێبکەن، ئەو دووکەسەی لە هەوڵی فراندنی گاکەدا بوون بۆ مەزاری شێخادی دەچن و خۆیان وا نیشان دەدەن لەپارێزگارانن، دیسان گاکە بۆ مەزاری شێخ شەمس دەبەن و خەڵکەکە دوایان دەکەون و گاپیش دەدەن و

---

٤٣١- مزدیسنا و تأثیران در ادبیات فارسی، ل٢٠٣-٢٠٤

بەنهێنی سەری دەبرن و گۆشتەکەی بەزێوانەی مەزاری شێخ شەمس دەدەن.[432] قوربانی کردنی ئەم گایە لە بۆنەی میترائیسم دەچێت.

راوراوێنی ئەم خەڵکە و سەربرینی ئەو قوربانیە لەنێوان مەزاری (شێخادی و شێخ شەمس)دا، دەکرێت چیرۆکی ئەو ناکۆکیە کۆنەی نێوان ئەو دوو شێخە نیشانبدات. بەڵام قوربانی کردنی "گا" رەنگە نیشاندەری دامەزراندنی میری نوێ یان پەیمان نوێکردنەوە میرەکەیان بێت.

دوای کۆتایهاتنی قوربانیەکە بە نەیژەنین و دەفژەنینەوە نزیکەی سێ سور هەڵپەرکێیەکی تایبەتی هەڵدەپەرن.

**دانانی بەرشبایکی شێخادی (تەختی شێخادی):**

لەرۆژی حەوتەمی جەژنی "جمایی"دا بۆنەی دانانی بەر شبایکی (تەختی) شێخادی دەکرێت، تەختی شێخادی لەنزیکەی شەست ئاڵقەی ناوپۆشی برۆنزی زەرد و دووداری بەرز و فەرشە کونێك پێکدێت. ئیزدیان لەو باوەرەدان ئەو ئەلقەو دارو فەرشە تەختی شێخادی بووە و بەرشبایکی پێدەڵێن.

لەو رۆژەدا میری شێخان، ئامادەکردن و دانانی بەرشبایکی شێخادی لە جێگەیەکی تایبەتیدا لە بەرزکردنەوەیەکی ئاشکرادا(مزایدە) بەرزیدەکەنەوە.

مەزنانی ئێزدی بۆ رێزی ئەم یادگاریە نرخەکەی بەرزدەکەنەوە، قەواڵانیش بە ئاوازی دەف و نەیژەنینەوە بەدەورو پشتی "بەرشبایکی شێخادی"دا دەسوڕێنەوە،کێ بەرزترین نرخی پێشنیار کرد بۆ ئەو دەردەچێت و بەهاوکاریَ چەند کەسێکی خۆی ئاڵقەکان بە دووری و نزیکی یەکسان لەسەر فەرشەکە رێك دەخات و دایدەنێت ئینجا بەبەنی لە ئاوی "زمزم"دا خوسێنراو ئەلقەکان بەیەکەوە بەند دەکات و بەدوو دارەکەوە دەیبەستێت، کاتێ تەختەکە هەڵدەگرن لە ئاوی حەوزە بچوکەکەی گۆرەپانی "شێخادی"دا بیشۆن و

---

٤٣٢- اليزيديون ل١١٠-١١١ و بینینی نوسەر خۆی.

لەناوی هەڵکێشن، خەڵکەکە بەرەو تەختەکە هێرش دەهێنن و دەستی لێدەدەن و ماچی دەکەن. ئیزدیەکان ئەم کارە بە ئەرکێکی ئاینی دەبینن، هەتا لێدانی فەرمانبەرانی تایبەتیش لەم کارە نایان گێڕێتەوە.

ئەگەر بۆنەی شتن و لە ناوهەڵکێشان بە شێنەیی ئەنجام بدرێت، خەڵکەکە دڵخۆش دەبن و بەفاڵێکی باشی دەزانن بەڵام ئەگەر ئاپۆرای خەڵکەکە نەهێڵێت بۆنەکە ئەنجام بدرێت ئەوا زۆر نیگەران دەبن چونکە دەستیان بەناو نەگات بەنیشانەی ساڵی نەبوونی و قەیرانی دەزانن.

## خوانی چل میرا:

مەبەست لەخوانی چل میرا، سفرەی چل کەسە، ئیزدیەکان لەو بروایەدان شێخادی چل شاگردی پاکی بانگ کردووە، ئەوانیش ئامادەبوون لەرێگەی خزمەتی پیرەکەیاندا لە هیچ خۆبەختکردنێك سڵ نەکەنەوە، گوایە سەرۆکی ئەو "چل میرە"، "فەخری چل میرا" بووە کەلەشاری "ئینسفنی" جێگەپێی دیارە.[٤٣٣]

ئەو چل کەسە لە مەزنان و پێشەوایانن و لەناوچەی شێخان و شەنگال مەزارگەو نیشانەیان هەیە و زۆربەیان لە مەزنانی زنجیرەی "تصوف"ن و ناوی هەندێك لەو چل کەسە لەلای "ئەهلی حەق"یش هاتوون و "شەمسی تەبریزی" یەکێك لەو چل کەسەیە.[٤٣٤]

لەرۆژی حەوتەمدا خەڵکی "ئینسفنی"، گایەك بەهێمای "خوانی چلمیرا" سەردەبرن، گۆشتەکەی بەباشی دەکوڵێنن ئینجا ئیزدیانی ناو مەزارگەی شێخادی بۆ بەرکەوتنی بەشە گۆشتی خۆیان کۆدەبنەوە.

ئاشکرایە لەو قەرەباڵغیەدا گۆشت بەرکەوتن کارێکی دژوار و سەختە وەنا ئومیدیش نابن هەریەك لەمیر، بابا شێخ، شێخ وەزیر پارچەیەکی گەورە هەڵدەگرن و بۆناو

٤٣٣- اليزيديون، ل١١٢

٤٣٤- بابازادە پروێز، حماسە پرشكوە اهل حق، ل٦٢

خەڵکەکەی هەڵدەدەن، خەڵکەکەش بەشۆر و شەوقێکی زۆرەوە دەیگرنەوە و لەنێو خۆیاندا دابەشی دەکەن، زۆر جار پێشهاتووە بۆ بەدەستهێنانی پارچەیەکی بچوك، دەستیان بەناو مەنجەڵە گۆشتەکەدا کردووە چونکە ئەوان لەو بروایەدان هەر کەسێك پارچەیەك لەو گۆشتە بخوات بروای بەهێز دەبێت.

دوای کۆتایی هاتنی گۆشت دابەش کردنەکە نوێنەری میر بەندێکی سپی لەناوچەوانیان دەبەستێت و ئیتر یەك یەك و کۆمەڵ کۆمەڵ مەزاری شێخادی جێدەهێڵن، بەڵام خەڵکی بەحزانی بۆ پاکژکردنەوەی مەزارگەکە دەمێننەوە.[٤٣٥]

کوشتنەوەی ئەم گایە و هەڵپەی خەڵکەکە بۆ خواردنی پارچەیەکی بچوکی ئەو گۆشتە بۆنەی دانانی "بابەکی خۆرەم دین" لەجێگەی "جاویدانی کوری سیهرەك"مان بەیاد دەهێنێتەوە.

ئاشکرایە دوای ئەوەی "شێخ شەمس" بەناوبژیوانی "شێخ فخرالدین" دەستی لە سەرۆکایەتی ئێزدیەکان بۆ بنەچەی شێخادی هەڵگرت و ئاشتی کرد.[٤٣٦] شێخ فخرالدین وەك بەیعەت. شێخ حسن، گایەکی هێناو سەریبڕی چونکە ئەو گایەی لەبۆنەی "قەپاغ"دا بەو شێوە سەختە قوربانیکرا سودێکی نەبوو بەڵام دووەمین گا لەدوای ئاشتەوایی و دامەزراندنی میر کەنیشانەی ئەو و دانانی شەبایکی شێخادی لەجێگەی تایبەتی خۆی بوو قوربانیکرا.

شایەنی باسە لە چیاکەی تەنیشت مەزاری شێخادی یەوە لە درزێکەوە کە جێگەی دووکەسی تێدا دەبێتەوە ئاو هەڵدەقوڵێت، ئەو سەرچاوەیە "زمزم"ی پێدەڵێن، خەڵکەکە لەکاتی بۆنەکەدا یان دوای ئەو دەچنە ناوی و دەست و روخساری خۆیانی پێدەشۆن چونکە ئەگەر کەسێك بەم ئاوە خۆی خاوێن نەکاتەوە زیارەتەکەی وەرناگیرێت.

---

٤٣٥- ن، ل١١٢-١١٣

٤٣٦- ر.گ تأریخچە ئیزدیان

معین نوسیویەتی "زم" بەمانای لەسەرخۆ و "زمزم" بەواتای ووردە ووردە و لەبواری زاراوەدا بە: ((ووشە گەلێکە کە موغەکان لەشوێنی ستایشی کردگار و پەرستنی ئاگرو خۆشتن و شتخواردندا ووتویانە.[437])).

لەوانەیە بتوانین بڵێین ئەم جەژنەی ئیزدیەکان لەگەڵ جەژنی "موهرگان"دا بێپەیوەندی نیە، بەو بەڵگەیەی کە ئیزدیەکان بایەخێکی زۆر بەجەژنی "جمایی" خۆیان دەدەن . بۆنەی پرشکۆو جۆراوجۆری ئەو یادکردنەوەی جەژنی (موهرگان)مان بەیاد دەهێنێتەوە چونکە "جەژنی موهرگان" لەکۆندا بەجەژنی سەریسالٚ دادەنرا.[438] بەڵام دواتر ئەو بایەخەی جارانی لەدەستدا کەچی لەلای ئیزدیەکان کەپتر لە پەیرەوانی ئاینەکانی دیکە نەریت و خوی خۆیان پاراستووە بایەخ و شکۆی ئەم جەژنەشیان پاراستووە.چەند بەڵگەیەکی جیاواز لەسەر گێرانی "جەژنی میهرگان" نوسراوە لێرەدا بەسێ بەڵگە دوایپێدەهێنن، ئەوانیش:

١. دەڵێن خوداوەندی مەزن لەم رۆژەدا زەوی فەراهەم کرد و گیانی بەبەر زیندەوەراندا کردووە.

٢. هەندێکی دیکە دەڵێن فریشتەکان لەم رۆژەدا بە دەنگ کاوەی ئاسنگەرەوە هاتوون و زوحاکیان لەناوبردووە.

٣. کۆمەلێکی دیکە دەڵێن فەریدون لەم رۆژەدا زوحاکی لە بابل گرت و بۆکێوی دەماوەندی نارد لەوێ زیندانی بکەن و خەڵکیش بەو بۆنەیەوە جەژنێکی مەزنیان گێرا.[439] مانگی تشرینی بابلی بە مانگی شەمس (خودای خۆر) دادەنرێت[440] و لەگەڵ "میهرگان"و رۆژانی جەژنی "جمایی" دا نزیك و هاوزەمانە.

-کۆتایی-

---

٤٣٧- میزدیسنا و تأثیر آن در ادبیات فارسی ل٢٥٤

٤٣٨- نخستین انسان و نخستین شهریار ل٤٧٧

٤٣٩- فەرهەنگی دهخدا ووشەی مهرگان

٤٤٠- فەرهەنگی دهخدا.

**سەرچاوەکانی ئەم کتێبە:**


– اگینر، شیرین، اقوام مسلمان اتحاد شوروی، ترجمه محمد حسین اریا، تهران، ١٣٦٧.

– اسفندیار، کیخسرو، دبستان مذاهب، بە کوشش رضا رحیم زاده ملك، تهران، ١٣٦٢.

– اموزگار ژاله و تفضلی، احمد، زبان پهلوی، دستوران، تهران، ١٣٧٣.

– اموزگار ژاله، زن درخانواده ایران بان، مجله دانشگاه تربیت معلم، دانشکده ادبیات و علوم انسانی، شماره دوم، ١٣٥٦.

– اقبال، عباس، خاندان نوبختی، تهران، ١٣٤٥.

– بابازاده، پرویز، حماسه باشکوه اهل حق چهل تنان، ١٩٤٧.

– بدلیسی، شرفخان، شرفنامه (تاریخ مفصل کردستان)، با مقدمه و تعلیقات و فهارس محمد عباسی، تهران، مؤسسة مطبوعاتی علی اکبر علمی.

– بۆرەکەیی (صفی زاده)، صدیق، پارسی گویان کرد، تهران، ١٩٦٦.

– بۆرەکەیی (صفی زاده)، صدیق، نوشتەهای پراکندە دربارە یارسان اهل حق، تهران، ١٣٦١.

– بهار، محمد تقی، سبك شناسی، تهران، ١٣٦٩.

– پیرنیا، حسن و اقبال، عباس، تاریخ ایران، تهران، ١٣٧٠.

تفضلی، احمد، ترجمه مینوی خرد، تهران، ١٣٦٣.

– جامی، عبدالرحن، نفحات الانس، به کوشش مهدی توحیدی پور.

– جهانگیری، محسن، قدریان نخستین، مجلە معارف، دورە پنجم، شمارە ١، تهران ١٣٦٧.

– چهاردهی، نورالدین، اسرار فرق خاکسار، اهل حق، تهران ١٣٦٩.

– حقیقت، عبدالرفیع، نهضتهای فکری ایران، تهران ١٣٤٧.

رامپوری، غیاث الدین محمد بن جلال بن شرف الدین، بە کوشش منصور ثروت، غیاث اللغات، تهران ١٣٦٣.

- راوندی، مرتضی، تاریخ اجتماعی ایران، تهران ۱۳٦۸.
- ر.ن، فرای، تاریخ ایران کمبریج، ترجمه حسن انوشه، تهران، ۱۳٦۳.
- ریاحی، محمد امین، تاریخ خوی، تهران، ۱۳۷۲.
- زرین کوب، عبدالحسین، دنباله جستجو در تصوف ایران، تهران ۱۳٦۹.
- سسیل، ادموندز، کردها ترکها عربها، ترجمه ابراهیم یونسی، تهرا ۱۳٦۷.
- شاه حسینی، ناصرالدین، فرهنگ و تمدن ایران، تهران۲۵۳٦.
- شهزادی، موبدرستم، زرتشت و اموزشهای او، تهران۱۳۷۱.
- صاحب زمانی، ناصرالدین، خط سوم، تهران ۱۳٦۲.
- صفا، ذبیح الله، تاریخ ادبیات درایران، تهران ۱۳۷۰.
- ضرغام، شهریار، گزارشهای تلگرافی اخرین سالهای عمر ناصرالدین شاه، تهران،۱۳٦۹.
- طوسی، خواجه نظام الملك، سیاستنامه، به كوشش دكتر جعفر شعار، تهران ۱۳۷۰.
- عراقی، فخرالدین کلیات، تحقیق سعید نفیسی، تهران، ۱۳۷۰.
- عطار، فخرالدین محمد، تذکرة الاولیا، به اهتمام نیکلسون، تهران ۱۳۷۰.
- عمید، حسن، فرهنگ عمید، تهران ۱۳۵۳.
- فروزان فر، بدیع الزمان، زندگانی مولانا جلال الدین محمد مشهور به مولوی، تهران ۱۳٦٦.
- فشاهی، محمد رضا، تحولات فکری و اجتماعی در جامعه فئودالی ایران، تهران ۱۳۵٤.
- کریستن سن، ارتور، نخستین انسان و نخستین شهریار، ترجمه و تحقیق ژاله اموزگار، احمد تفضلی، تهران، ۱۳٦۸.
- کسروی تبریزی، احمد، نامهای شهرها و دیه‌های ایرانی، تهران ۱۳۵۸.
- لسترنج، جغرافیای تاریخی سرزمینهای خلافت شرقی، ترجمه محمود عرفان، تهران ۱۳٦٤.
- مردوخ کردستانی، شیخ محمد، تاریخ کرد و کردستان، سنندج.

- مصاحب، غلام حسين، فرهنگ مصاحب، تهران، ١٣٥٦.
- معين، محمد، مزديسنا و تأثير ان در ادبيات پارسى، تهران، ١٣٢٦.
- معين، محمد، فرهنگ معين، تهران ١٣٧١.
- مير احمدى، مريم، دين و دولت در عصر صفوى، تهران،١٣٦٩.
- نفيسى، سعيد، بابك خرمدين، تهران ١٣٤٨.
- نقوى، سيد على مهدى، عقايد مزدك، تهران ١٣٥٢.
- نيكيتين، واسيلى، كرد و كردستان، ترجمه محمد قاضى، تهران ١٣٦٦.
- وهبى، توفيق، بررسى مختصرى از تاريخ اديان كردان، ترجمه سيد جمال الدين حسينى، تهران ١٣٦١.
- ياسمى، رشيد، كرد و پيوستگى نژادى و تاريخى او، تهران ١٣٦٣.
- باعدرى، زيدو، الزواج، مجله لالش، العدد ١ دهوك، ١٩٩٣.
- ابن الاثير، عزالدين، الكامل فى التاريخ، بيروت ١٩٧٩.
- ابن تيميه، احمد، مجموع فتاوى شيخ الاسلام احمد بن تيميه، جمع على عبدالرحمن بن محمد بن قاسم.
- البغدادى، عبدالقاهر، الفرق بين الفرق، مصر، ١٩٤٨.
- پاشا، عبدالرحمن، جريدة العراق، بغداد ١٩٨٨/١٢/٨.
- جانباز، طارق، الموسيقى عند الايزيدية، مجلة لالش، العدد١، دهوك، ١٩٩٣.
- جندى، خليل، ادعيه الايزديه، مجله لالش، العدد ١، دهوك ١٩٩٣.

جندى، خليل، نحو حقيقة الديانة اليزيدية، مجلة سرهلدان، العدد٤ و ٥، دهوك لسنة ١٩٩٣.

- حبيب، جورج، اليزيديه بقايا دين قديم، بغداد ١٩٧٨.
- الحسنى، عبدالرزاق، اليزيديون في حاضرهم و ماضيهم، بغداد ١٩٨٤.

الدليل العراقى، لسنة ١٩٣٦.

- سليمان، خدرى، صحيفة العمل الاسلامى، السنة العاشرة، العدد٤٠٧، ١٢ شباط ١٩٩٢.

-سمعانی، ابو سعید، الانساب، تصحیح عبدالرحمن یحیی الیمانی، متبة الحرم المكی ۱۹٦۲، تقدیم و تحقیق عبدالله البارودی، بیروت ۱۹۸۸.

- شهرستانی، محمد، الملل و النحل، الطبعة الثانیة، مصر مكتبة الاتحاد.

- الطبری، محمد بن جریر، تاریخ الطبری، القاهرة ۱۹٦٦.

- العزاوی، عباس، تاریخ الیزیدیة و اصل عقیدتهم، مطبعة بغداد ۱۹۳۵.

- قرآن كریم.

- القس اسحاق، قصة الدیانة الداسنیة الیزیدیة، الناشر و المشرف علی الطبع، القس شموئیل جمیل، ملحق كتاب جورج حبیب، بغداد، ۱۹۸٤.

- المنجد، بیروت، ۱۹۷۳.

- ئامیدی صادق بهاءالدین، ریزمانا كوردی، بەغدا، ۱۹۸۷.

- آری، كریفیا خونی، مجله متین، ژماره ۱۳، دهوك ۱۹۹۲.

- باعدریێ، زیدو، رەفاندنا ژنی لجەم ئیزدیا، مجله متین، ژماره ۲۲، دهوك، ۱۹۹۳، طەوافید ئیزدیا، مجله متین، ژماره ۷، دهوك ۱۹۹۲.

- خال، محمد، فەرهەنگی خال، سلیمانی ۱۹٦٤.

- سلیمان، خدری و خلیل جندی، ئیزدیاتی، بەغدا ۱۹۷۹.

- سلیمان، خدری، گوندیاتی، بەغدا ۱۹۸۵.

- شرفكندی(هەژار)، عبدالرحمن، فرهنگ كردی-فارسی، تهران، ۱۳٦۸.

- فتاح، شاكر، یەزیدییەكان و ئاینی یەزیدی، سلیمانی ۱۹٦۹.

- محمدامین، زكی بگ، كورد و كوردستان، مهاباد، ۱۳۵۰.

- مینورسكی، كورد، ورگیر حمەسعید، بەغداد ۱۹۸٤.

- نبز، جمال، زمانی یكگرتووی كوردی، بامبیرگ المان ۱۹۷٦

- Encyclopedia Americana، Volume 23.

- Encyclopedia Americana، Volume 32.

- Glaseppe Farllan، The Religion of The Yezidis Tra. Jamshedji Maneckji، 1945.

زۆر سوپاسی بەڕێز (بەهادین عبدالرحمان) بەڕێوەبەری گشتی کاروباری شەهیدوئەنفالکراوان دەکەین,کە ڕامان سپارد نامەی دکتۆراکەی (د.عبدالقادر مارونسی) مان بۆ بهێنێت زۆر بەخۆشحاڵیەوە وەکو ئەرکێکی نیشتمانی بۆیهێنانیەوە و ئەم کتێبە ناوازەیەی لێ دەرچوو ، نموونەیان زۆر بێت.

سوپاس بۆ کاکە (دلێر خلف اوسمان) کەزۆر بەجوانی تایپی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ...

سوپاس بۆ کاکە (دارياس) ی کوڕم کە هەڵەچنی کردەوە




مەلەکە تاووس لەسەر پایەیەکی تایبەتی لەگەڵ جام و پشتی تایبەتی خۆیدا دانراون، لە کتێبی الیزیدیون الحسنی.



یەکێك لەو تاوسانەی فەریق پاشای عوسمانی لەساڵی ١٨٩٢ زاینی بەتالان بردونی، ئێستا لە یەکێك لە مۆزەخانەکانی "ئەڵمان" دایە. لەکتێبی گوندیاتی (خوری سلێمان) وەرگیراوە.

**ئەم کتێبە باسی دێرینی گەلی کورد و پاراستنی ئایین و زمان و کەلتوری دەکات ، باسی کۆڵنەدانی ئەم گەلە ستەم دیدەیە دەکات کە بە درێژای مێژوو، دوژمنەکانی بە مەبەستی دوژمنکاری و داگیرکردنی خاکەکەی بەبێ بڕوا و بێ ئایین و دڕندەیان ناوبردوون ، هیچ سڵیان لە چەوسانەوە و ئەنفال و کۆمەڵکوژییان نەکردۆتەوە.نوسەر (د.عبدالقادر مارونسی) کوردزمان وەکو نامەی دکتۆرا پێشکەشی زانکۆی تارانی کردووە، زۆر بەوردی و بێلایەنانە نوسیوێتی .**